# کاروان

گۆڤارێکی ڕۆشنبیریی مانگانەیە

ئەمینداریتی ی گشتی ی ڕۆشنبیری و لاوان بە زمانی کوردی و عەرەبی دەری دەکا

سەرنووسەر
**محمد أمين محمد احمد**

جیگری سەرنووسەر
**حسين عارف**

**ژمارە ٦٠**

**تشرینی یەکەم و دووەمی - ۱۹۸۷**

ئەدرەس
**هەولێر - ئەمینداریتی ی گشتی ی ڕۆشنبیری و لاوان**
**گۆڤاری «کاروان» ت ٢٠٨٨٢**

**نرخی (٢٥٠) فلسە**

**لەم ژمارەیەدا**



لە کتێبخانەی نیشتمانی لە بەغدا ژمارە «٤٨٣»ی ساڵی «١٩٨٢»ی دراوەتێ
لە چاپخانەی (دار الحرية للطباعة) چاپکراوە

له یادی
نەمراندا



# محەمەد فیدا

○

عبد القادر عزیز سعید

قەلاْدزیْ

○

ئەگەر بێتوو ، بە نێو لاپەڕەکانی مێژووی ئەدەبی کوردیدا بچینەوەو تۆزو خۆڵی ڕۆژگارو بیرچوونەوەیان ، لە سەر لادەین ، دەیان شاعیرو نووسەر لە نێو دوو توێی ئەو مێژووەدا ، ئەستێرەی ئاسمانی ئەو مێژووە بوون ، لە سەردەمو کاتی خۆیاندا ، هەمیشە قەڵەمی بیریان سوارچاکانە تاو داوە لە پێناوی خزمەتی زمانو ئەدەبی کوردی .

ئەگەرچی هەوری ڕەشو چڵکنی ژیان ، هەمیشە بۆتە لەمپەرێك لە بەر دەم کاروانی ژیانیانداو نەیهێشتووە ئەستێرە گەشەی ژیانیان وەکو پێویست وورشەیان پەخش بکەن لە شەوی ئەنگوستەچاوی ژیانی گەلەکەیاندا .

یەکێك لەو مرۆڤە سوارچاکانە (محەمەد فیدای) شاعیربوو کە تا دوا چرکەی ژیانی خزمەتی زمانو فەرهەنگی کوردی کرد .

«محەمەد فیدا» ناوی محەمەد صالح هەمزەیە نازناوی «فیدا» بووە ، لە ساڵی (١٩٢٩)ی زایینی لە ناوچەی «بانە»ی کوردستانی ئەودیودا باوەشی بە ژیانێکی پڕ نەهامەتیو گێرەو کێشەدا کردووە .

هەر لە تەمەنی حەوت ساڵاندا ، واتە لە ساڵی «١٩٣٦» خراوەتە بەر خوێندنو لە حوجرە قورئانو چەند پەڕاوێکی ئەو سەردەمەی خوێندوە . پاشان لە ساڵی «١٩٣٨»دا ، خراوەتە قوتابخانەو ، بە هۆی کارەساتی جەنگی دووهەمی جیهانیو ، مردنی دایکیو باوکی ، نەیتوانیوە خوێندن تەواو بکاتو ، مەیدانی خوێندنو زانستی ، بەجێ هێشتوەو رووی کردۆتە مەیدانی کارکردنو ، بازووی کارکردنی لێهەڵماڵیوە ، دەستی کردووە بە پەیداکردنی بژێوی ژیانو گوزەرانی .

باری ناهەمواری ، پاش جەنگی دووهەمی جیهانیو کارەساتی لە دەستدانی دوو ئازیز ، لاوێکی تەمەن «١٧» حەڤدە ساڵانی ناچار کردووە توێشووی گەشتێکی درێژ ، لە پێناوی درێژەدان بە ژیان بدا بە کۆڵداو بستۆکەیەکی بە نێو سنووری بە زاندووەو ، لە ماوەی ساڵانی «١٩٤٧ و ١٩٤٨»دا

له ناوچەی (مەرگەو پشدەر) له چەند کوێرە دێیەك ، وانە بێژی کردووەو هەر لەوێش ژنی هێناوە . ئیدی تا ساڵانی «١٩٥٢»و پاش تریش ، لەسەر ئەم کارە بەردەوام بووە .

دوای بەرپابوونی شۆڕشی چواردەی تەمووزی «١٩٥٨» دەرگای ژیانێکی ئاسوودە تری بە ڕوودا کرایەوەو کرا بە مامۆستای سەرەتایی ، لە گوندی (بێگەلاس)ی ناوچەی پشدەر . تاکو ساڵی «١٩٦٠» چۆتە دەورەی «برین پێچی» ، لە ساڵی «١٩٦١» بە برین پێچ لە ناوچەی مەرگەو پشدەر دامەزراوەو کاری موچەخۆری بەسەر بردووە .

سەرەڕای سەر قاڵی فیدای شاعیر بە کاری برین‌پێچی‌و گیرو گرفتەکانی ژیانی ، لەو گوندانەی کە ژیانی تێدا بەسەر بردووە ، خەریکی کۆکردنەوەی بەرهەمی کەلەپوری میللیمان بووە ، لەوانەش زوربەی شیعرەکانی (عەلی بەردەشانی)ن .

محەمەد فیدا هاو دەم‌و هاوچەرخی (فانی‌و گیوی موکریانی‌و مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ‌و قانیع‌و شوکری‌و خادیم‌و گۆران‌و نەجمەدین مەلاو لافاوو حاجی مەلا سمایلی مەمەنداویێ . . .) بووە .

دوای ئەوەی کە لە کوردستانی عێراق گیرسایەوەو دیتی ناو بە ناو هەندێ چاپکراوی کوردی چاو هەڵدێنن تین‌و گوڕێکی تریان‌دا بە «فیدای شاعیر» و دەستی‌کرد بە شیعر نووسین‌و بلاو کردنەوەیان لە گۆڤاری (گەلاوێژ ، هیوا ، ڕۆژنامەی ژین) ، لە هەمان کاتیشدا ، وەرگێران لە زمانی فارسیەوە بۆ کوردی . فیدای شاعیر سەرەتایەکی زۆر بە گەرم‌و گوڕو پێزدار هاتە نێو مەیدانی ئەدەبی کوردی چ بە شیعر چ بە وەرگێران ، ئەوەتا لە ساڵی «١٩٥٨»ی زایینی‌دا کتێبی (مێژووی کوردو کوردستانی — مەردۆخی —) وەرگێرایە سەر زمانی کوردی‌و لە «بەغداد» بە چاپی گەیاند .

شیعرەکانی (فیدا) ناوەرۆکی کۆمەڵایەتی‌و نیشتمانی‌و ئایینی‌و چیرۆکی مێژوویی بە خۆیانەوە دەگرن‌و هەمیشە ویستوویەتی لە ئاوێنەی شیعرەکانی‌ڕا برین‌و دەردەکانی کۆمەڵەکەی بخاتە ڕوو ، چارەسەریشی بۆ داناوون .

لە هەمان کاتیشدا چەندین بەشی لە مێژووی کوردی کردووە بە شیعرو چەند پێنج خشتەکیەکی لە سەر شیعری «مامۆستا قانیع‌و فانی‌و ئەحمەد موختار جاف» داناوەو شیعری چەند شاعیرێکی ناسراوی ئێرانی کردووە بە کوردی یەکێك لەوانە (حافزی شیرازی)یە [1] .

حافزی شیرازی ، حەوت سەد ساڵ لەمەوبەر شیعرێکی ووتوە ، لەوەدا پێش بینی کردووە لە ڕووداوێکی زەمانە ، فیدا بەو شێوەیە کردوویەتی بە کوردی :

لــــــە چــــەرخی قـــــەمــــەر گۆران دەبــــینم
جیهـــــان پــــڕ جـــــەنگ‌و شێوان دەبـــــینم
هــــەرکــــەسە بـــــەشی چــــاکتری دەوێ
ڕۆژ لــــــە گەڵ ڕۆژێ زیــــــان دەبـــــینم
کچــــان لـــــە ڕووی داك توورەو نــــاکۆکن
کورانـــــیش دژی بـــــاوکـــــان دەبــــینم
دڵسۆزی نــــیــــە بـــــرا بۆ بــــرا
ساردی بــــاب لــــە ڕووی کوڕان دەبـــــینم
ئــــەسپی عـــــارەبی ڕەسەن‌و بۆشنــــاخ
پشتی زامـــــداری کورتــــان دەبــــینم
گەردانــــەی زێڕو خشــــڵی بـــــەهــــادار
لــــە سەر گێزەکــــەی [2] کــــەران دەبـــــینم
خواردنــــەوەی نــــەزان قـــــەنــــدو گوڵاوە
خوێنی دڵ ڕۆژی ژیــــــران دەبــــــینم
وەربگرە پـــەنـــدی «حــــافــز» ئـــەم پـــەنـــدە
چـــاکتر لــــە گەنج‌و سامـــــان دەبـــــینم

* * * * * *

بەڵێ خوێنەری هێژا فیدای شاعیر ویستی‌و دەیویست بە شیعرو بەرهەمەکانی سەرەڕای پیشەکەی — برین پێچی — خزمەتی نەتەوەکەی بکات‌و زامەکانی سارێژ بکات . . بەڵام باری گرانی ژیان‌و گیرو گرفتی خێزانی [3] بوونە تەوقی عەزازیل‌و

کردیانە مرۆڤێکی هەمیشە لێو بەبارو گۆشەگیرو دوورە پەرێز بەرادەیەك گیرو گرفتەکانی چرای بیرکردنەوەیان بۆ چارەسەرێکی گونجاو لێ کوژاندەوەو ، خستیانە سەر تاریکە ڕێگای دەست هەڵگرتن لە ماڵو منداڵ ، دوا ساڵەکانی تەمەنی لە گوندی (سەرسیان)ی بەری مەرگەو گوندی (ژاراوە)ی ناوچەی پشدەر بە سەر بردووە .

تاکو نەخۆشی تەنگی بە ساغی هەڵچنیو رووی کردە خەستەخانەکانی «سلێمانیو هەولێرو موسڵ» ماوەیەکی زۆری لەو خەستە خانانە بە سەربرد ، بە دەست دەردی ئەو نەخۆشیەوەی دەتلایەوەو بە بێئەوەی ڕۆژێك لە ڕۆژان – ئەدیبو نووسەرو لایەنە ڕۆشنبیریەکان – بە بیریاندا هاتبێت لایەك لەو شاعیرە بکەنەوە . . ؟ دوای ئەوەی کە زانی ، مانەوەی لە گۆشەی ئەم خەستەخانانە بێسوودەو باری بێکەسیشی لەو شوێنانە ئەوەندەی کە ، باری نەخۆشیەکەی گران کرد ، بۆیە بە ناچاری بارگەی پێچایەوەو رووی کردەوە «خەستەخانەی قەڵادزێ» . . . خوێنەری بەڕێز لە کاتێکدا شەوی ١٩٨٤/١١/٩ کاك «سەعید زەنگەنە» لە بەرنامەی (ڕۆشنبیری‌کوردی)دا چاپکرانو بلاوبوونەوەی (دیوانی ڕەشو سپی) محەمەد فیدای ڕاگەیاند ، محەمەد فیدا سێ ڕۆژ بوو لە کێشەیەکی توندا بوو لە گەڵ مەرگ‌دا هەتا لە بەرەبەیانی ئەو شەوە واتە «١٩٨٤/١١/٩» مەرگ لە ئامێزی وەرێناو نەگەیی دیوانی چاپکراوی[٤] شیعری بە چاوی خۆی ببینیو ئەو ئاواتو خۆزگەش لە گەڵ دەیان ئاواتی پیرۆزتری بردە ژێرخاكو بۆ یەکجاری ماڵئاوایی لە دنیای ئەدەبی کوردی کردو چەند دەنکە حەبێکی لە بارچووی چارەسەری ئازارەکانی لە گیرفانەکانیدا بەجێمانو . . .

هەر لە کات ژمێر (١٠/١٥)ی هەمان ڕۆژ بە ستایشو ڕێزلێنانێکی زۆرەوە بە سەر شانی خەڵکی «قەڵادزێ» وە بەرەو دواثارامگای ، بەرێکراو ، لە گۆرستانی قەڵادزێ بە خاك سپێردرا . . گیانی شادو یادی بەخێر . .

**• لە بەرهەمە چاپکراوەکانی شاعیر •**

١ – وەرگێرانو چاپکردنی کتێبی (مێژووی کوردو کوردستان)ی «مەردۆخ» . ساڵی ١٩٥٨ بەغداد .

٢ – ڕەش و سپی / بەشێك لە شیعرەکانی فیدای شاعیر ، لە سەر ئەرکی تۆمارگای مرواری چاپکرا ، ساڵی ١٩٨٤ بەغداد .

٣ – بەسەرهاتی فەقێ ئەحمەدی دارشمانە . ئەمینداریێتی ڕۆشنبیریو لاوان لەچاپیداوە .

**• بەرهەمە چاپ نەکراوەکانی •**

١ – کەشکۆڵی ژمارە – ١ – شیعرە

٢ – کەشکۆڵی ژمارە – ٢ – شیعرە

٣ – وەرگێرانی مێژووی کورد ناسی .

٤ – مێژووی ژیانی پێغمبەران لە ئادەمەوە تا خاتەم .

٥ – وەرگێرانی کتێبی (المثل الکامل) – بە پەخشان

٦ – وەرگێرانی مێژووی (سواد العراق) – بە هۆنراوە

٧ – وەرگێرانی (گولستانی سەعدی)

٨ – وەرگێرانی کتێبی (جامع التمثیل)

٩ – مێژووی (پشدەر نامە) بە هۆنراوە

وە چەند بەرهەمێکی دی ، بەو هیوایەی لایەنە بەرپرسیارەکانی زمانو ئەدەبی کوردی لایەك لەو بەرهەمانە بکەنەوەو کتێبخانەی کوردی پێ دەوڵەمەندو شاد بێتو گیانی فیداشی پێ گوشاد بکەن .

سەرچاوەکان

١ – بڕوانە لاپەرە (٧٨-٧٩)ی دیوانی (ڕەش وسپی) محەمەد فیدا .

٢ – گێزەکە : ئەستۆ ، مل .

٣ – بڕوانە لاپەرەی (٧)ی دیوانی (ڕەشو سپی) محەمەد فیدا .

٤ – دوای چاو لێکنانی یەکجاری . فیدای شاعیر . تاکە نووسینێك کە لە سەری نووسرابێت . نووسینەکەی مامۆستای چیرۆك نووس (ئەحمەد قادر سەعید)بوو بە ناوی (بۆ محەمەد فیداش چەند دڵۆپ فرمێسکی گەرم) لە گۆشەی «هەر جارەی نووسینێك» هاوکاری / ژمارە (٧٧٧)ی ١٩٨٥/٢/٢١ .

• سوپاس بۆ برای بەڕێز کاك (ڕێبوار محەمەد یوسف) بۆ ئەو زانیاریانەی دەربارەی فیدای شاعیر .



كتاب

مكتوب أمر ونهي

من تصنيفات

العالم الجليل والزاهد الرباني صاحب الكرامات المشهور قدس سره

الحضرة الحاج السيد كاك أحمد بن السيد

محمد معروف النودهي بن المرحوم

السيد مصطفى

قام بنشره وطبعه خدمة للدين الحنيف

حضرة الحفيد الاكرم والزعيم الاعظم

الشيخ محمود بن الشيخ سعيد بن الشيخ محمد

بن السيد كاك احمد بن السيد محمد معروف

النودهي قدس الله أسراره

مطبعة الغري

١٩٣٦ — ١٣٥٥



# شێخ مەحموودی حەفید

عبد الله بابه علي برزنجي

گەر بێت‌و هەندێ لە لاپەڕەکانی مێژووی گەلی کوردمان هەڵبدەینەوەو لێ‌ی بکۆڵینەوەو لایەنە شاراوەکانی بخەینە سەر لاپەڕەکانی ڕۆژنامەو گۆڤارو کتێب . ئەو کاتە شتی زۆر بەنرخ‌و نایابمان بۆ دەردەکەوێت . ئەو پیلان‌و نەخشەو داوو فرو فێڵە گلاوانەمان بۆ ئاشکرا دەبێت کە دوژمنانی نەتەوەکەمان چەند بە ناحەزانە ڕەفتاریان لە گەڵماندا کردووە .

سەرەڕای ئەمەش گەلەکەمان زۆر کەڵەپیاوی قارەمان‌و داناو زاناو هۆشمەندو لێهاتووی لێ هەڵکەوتووەو بێ ئەوەی ئاواتەکانی هاتبێتەدی سەری ناوەتەوەو ئاواتەکانی خستۆتە ژێر گڵە پیرۆزەکەی کوردستان .

لێرەشداو لەم مانگەدا یادی کەڵە پیاوێکی مەزنی کورد دەکەینەوە کە هەتا هەتایە کارەمەزنەکانی کە بۆ نەتەوەی کوردو خاکی کوردستان ئەنجامدرا لە لاپەڕەکانی مێژوودا دەدرەوشێنەوەو لەناو دڵی هەموو دڵسۆزێکی بە ئەمەکی



کوردیشدا دەژینو دەمێننەوە . ئەو کەڵەپیاوەش ڕۆڵەی بە وەفای نەتەوەکەیەتی کە (شێخ مەحموودی) حەفیدە . . یا شێخ مەحموودی مەلیکە . . پاشیخی گەورەیە . . (شێخ مەحموود) ڕۆڵەی بە وەفاو قارەمانو پێشەواو ڕابەرو دلێری نەتەوەی کوردە .

شێخ مەحموود کوڕی شێخ سەعید کوڕی شێخ محەمەدی کوڕی حاجی کاك ئەحمەدی شێخە ، دایکیشی ناوی ئامینە خانی کچی شێخ بابە ڕەسووڵە .

شێخ مەحموود لە گەڕەکی کانی ئاسکانی شاری سلێمانی شاری هەڵمەتو قوربانی لە ساڵی ۱۸۷۸ز دا هاتۆتە دنیاوەو لە مزگەوت لەلای مەلا خوێندویەتی بە تایبەتی لە مزگەوتی گەورەی سلێمانی‌دا کە بە مزگەوتی حاجی کاك ئەحمەدی شێخ ناسراوەو شوهرەتی وەرگرتووە .

لەو کاتەشدا لە زۆربەی هەرە زۆری ناوچەکانی کوردستاندا مەلاو فەقێو داناو زاناکان بۆ خوێندنو زیارەتیش ڕوویان تێکردووە ، وەك زانکۆیەکیش وابوو بۆ گۆڕینەوەی ڕاوکێشەی ئایینیو نیشتمانی‌دا . . هتد . .

جگە لەوەی کە لە سەرانسەری کورستاندا جێگایەکی پیرۆزەو ئارامگایەکی هەمیشەیی حاجی کاك ئەحمەدی شێخە . بنەماڵەی خوالێخۆشبوو شێخ مەحموود لە نێوکوردستاندا هەمیشە جێگای خۆشەویستیو ڕێزلێنان بووە ، گەلی کوردمانیش هەمیشەو هەردەم بەسەرداری ئایینیو دنیایی ئەو بنەماڵەیەیان لە قەلەم داوە ، هەر بۆیە شێخ مەحموودی نەمر تا مردن دریغی نەکردووە . بۆ پێشخستنی کوردو کوردستانەکەی . (شێخ)ی نەمر هەر لە منالی‌یەوە تا دوا تەمەنی هەر لە ناخۆشیو دەربەدەری ژیاوە ، بگرە هەتا لە منالیشەوە جارێکیان لەگەڵ باوکی‌دا بۆ سەفەری ئەستەمبوڵ **چوون لە** گەڕانەوەیاندا کارەساتێك لە نێوان هەندێك بازرگانی **سلێمانیو** موسڵاوی‌دا ڕووی‌دا بۆ کوژانەوەی ئاگری ئەوشەڕو **ئاژاوەیە** شەهید شێخ سەعید (قورئان)ی – هەڵگرتووەو **چووەتە** نێوانیانەوە تکای ڕاگرتنی شەڕو ئاژاوەکەی لێکردوون . **بەڵام لە** ئەنجامدا خۆیو کوڕێکی شەهید بوون . ئەوسا شێخ مەحموود منالێ بووە . (حاجی مەحموودی نەجەفی) کە لەناودارەکانی شاری موسل بووە . شێخی لە ماڵی خۆی‌دا شاردۆتەوە تاوەکو ئاژاوەکە کۆتایی پێهاتووە . پاشان شێخ مەحموود بەرەو شاری هەڵمەتو قوربانی بەدڵێکی پڕ لە غەمو پەژارەوە گەڕاوەتەوە . بەلام چۆن گەڕانەوەیەك هەر لە مووسل تا سلێمانی چ دێو شارو شارۆچکەو عێلو بنەماڵەو خێڵێك هەبووە ، پۆڵ پۆڵ بە بەیداخی ڕەشەوە پێشوازی‌یان کردووە ، دەس بە دەس شێخ بەڕێکراوەو – پارێزگاری لە جەنابی شێخو هاوڕێکانیان کردووە .

چونکە کارەساتی شەهید کردنی پیاوێکی وەك شێخ سەعیدی نەوەی حاجی کاك ئەحمەدی شێخ شتێکی ئاسایی‌و ئاسان نەبوو ، خەڵکی کوردستان تێکڕا بەبیستنی هەواڵە دڵتەزێنەکە خەمناك بوونو شاعیرو گۆیندەکانیش بەسەر ئەو کارەساتە جەرگ برەدا شیعریان داناوەو قسەیان لێوە کردووە . هەروەها دەروێشەکانیش بەدەف لێدان بەناوی (هەی گوڵ هەی گوڵ) ئاوازیان بەدەنگ بەسەر شەهید کردنی شێخ سەعیدو ڕزگاربوونی شێخ مەحموو گوتووەو تا ئێستایش هەندێکیان لەبیریانە .

خوالێخۆشبوو شێخ مەحموودی نەمر سەرەڕای ئەوەی کە کوڕی شێخ سەعیدەو حەفیدی «حەزرەتی» کاك ئەحمەدی شێخە خۆیشی داناو زاناو ئازاو چاو نەترسو سەخی‌و ، دۆستی هەژارو عالمو زاناکانی سەردەمی خۆی بوو ، لە سەر تاسەری کوردستاندا لە هەموو عێلو عەشرەتو بنەماڵەیێك‌دا خەڵك خۆشی ویستووەو ڕیزی لێناوەو بەگەورەو سەرداری خۆیان زانیوە .

لەکاتی هەڵگیرسانی جەنگی یەکەمی جیهانیدا کە لەشکری ئینگلیز لە ساڵی (١٩١٨)دا بەرەو «بەسرە» هاتووە ، بۆ داگیرکردنی عیراق ـ شێخ مەحموود وەك سەر لەشکرێك بەناوی (فیدائی) یا (غەزا) بەلەشکرێکی زۆرەوە بەرەو «شعیبە» چوونو بەرەنگاری لەشکری ئینگلیز بوونەتەوە زۆر ئازا[illegible]نە لەگەڵیاندا جەنگاونو ـ کە چی لەئەنجام[illegible]دا نەخۆشەکەی عوسمانلی لەبەرەی شەڕدا شکانو ، ئەمانیش بە ناچاری واتە شێخو لە شکەرەکەی بۆ وڵاتی کوردستانو شارەکەی سلێمانی گەڕاونەتەوە . هەر لە هەمان ساڵدا ئەمجارەیان لە شکرێکی زۆری رووسی قەیسەری ، بەرەو کوردستانی ئێران هاتووەو دەستی بەسەردا گرتووە بەمەبەستی داگیردنی کوردستانی عیراق ، هەر لە هەلەبجەو پێنجوینەوە تا گەیشتۆتە رەواندوز لەشکری رووسی تەنرابوو ، سەرەڕای زوڵمو زۆرداری‌یان لە دانیشتوانی ناوچەدا .

شێخ مەحموود دووبارە وەك سەردارو پێشەوایێك سوارەی کوردی کۆکردۆتەوەو ، لە پێناوی کوردو کوردستاندا بەرەو سوپای داگیرکەری رووسی جەنگاوە ، لە ئەنجامدا رووسەکان شکاونو تاناو کوردستانی ئێران راونراون . شێخ – ی – مەزنو پێشەوای کوردو کوردستان بەو چەند شەڕانەی لە ناو گەلی کوردستاندا ناودارتربووە ، بوو بە ئومێدێکی یەکجار گەورە لەسەرانسەری کوردستانو بگرە دەوڵەتی عوسمانیش هەمیشە بەپرسی ئەو هەندێ کاروباری هەڵدەسووراندو لە ژێرەوەش لێی ترساوە ، کە نەك رۆژێ لە رۆژان لەگەڵ ئینگلیزەکان رێك بکەوێتو داوای سەربەخۆیی کوردستان بکاتو . . هتد وەهەروەها ئینگلیزەکانیش باش بۆیان دەرکەوتبوو کەوا شێخ لە سەرانسەری کوردستاندا هیچ (منافس)ی نییەو لەلای هەموو کەس رێزی تایبەتی هەیە . پاش ماوەیێك هێزەکانی ئینگلیز گەیشتنە بەغداو خۆیان چەسپاندو لەشکری عوسمانلی بەرەو مووسلو کەرکووك کشانەوە . ئینگلیزەکان کەوتنە پلانو پەیوەندی بە خەڵکەوە . . هەمیشە بیریشیان لەوە دابوو ، چۆن بگەنە کوردستانو دەسەڵاتی خۆیان لە ناوچەی کوردستاندا بچەسپێنن ؟ . . لە ئەنجامدا بۆیان دەرکەوت تەنیا بەهۆی «شێخ مەحموود»ەوە نەبێت ناتوانن بگەنە ناوچەی کوردستانو دەسەڵاتی خۆیان بچەسپێنن ، ئەوە بوو پەیوەندی‌یان بە شێخەوە کردو ئەویش داوای (حکم)ی کوردستانی‌دا بەروویانداو کەچی یەکەم داوای بوو .

لە ١٩١٨/٥/١٨ ز لەشکری داگیرکەری ئینگلیز گەیشتە شاری کەرکووكو سوپای عوسمانلی ئەوێشی بۆ بەجێ هیشتوونو بەرەو سەروو رۆیشتن .

هەر لەهەمان کاتدا شێخ بۆ ئینگلیزەکانی دووپات کردەوە ، بەتایبەتی کاربەدەستانی سیاسی کەوا دەولەتێکی کوردی بەسەرۆکایەتی خۆی دابمەزرێت ، ئەوا باشە ئەگینا کوردستان بۆ ئەوان گۆرستانەو هەرگیز ئامادەیە شەڕیان لەگەلا بکاتو نەهێڵی بێگانە بگاتە ناوجەی کوردستان . . هتد .

دووبارە عوسمانی‌یەکان توانیان بگەنەوە شاری کەرکووكو سلێمانی پڕ بە دڵ رقیان لە شێخ بوو ئەوە بوو بە پیلان (شێخ) یان لە سلێمانی گرتو رەوانەی کەرکوکیان کرد ، لەوێوە بە دادگایەکی (عورفی) صوری حکمی لە سێدارەدانی شێخ درا ، بەلام دوای ئەوەی کە فەرماندەی فەیلەقی مووسل گۆڕاو (عەلی ئیحسان) پاشا داندرا بەپەلە فەرمانی‌دا شێخ رەوانەی مووسل کرا ، لەوێش زۆر رێزی لێ گرتووەو فەرمانی بەردانی (شێخ)ی داوە .

چونکە ئەو عەلی ئیحسانە وەك خەلیل پاشا کەم بین نەبووە ، بەڵکو دووربین بووەو هەوڵیان‌داوە خۆیان لە کوردستاندا خۆشەویست بکەنو باش بۆیان دەرکەوت کە سیاسەتی کوشتنو برینو لە سێدارەدان لە کوردستاندا ئەنجامەکەی بەرەو خراپەتر دەڕوات بە دژی «خەلیل پاشا» کە ئەو زۆر خوێن رێژو جەلاد بووە . . بەم جۆرە شێخ بۆ سلێمانی گەڕایەوە ، ئەوسا عەلی ئیحسان پاشا فەرمانی دەرکرد چ لەشکری عوسمانلی هەیە پێویستە لەژێر راوتەکبیری شێخ دابێت .

کە لەشکری ئینگلیز دووبارە گەیشتەوە شاری کەرکووك

بارەکە دووبارە بە نیسبەت شێخ گۆڕاوە چونکە لە ناو بیرو مێشکی شێخدا ئەوەبوو دەولەتێکی کوردی لە کوردستاندا دابمەزرێت ، ئەوە بوو (یادداشتێك)ی – بە ئینگلیزەکان داوەو بەسەرۆکایەتی خۆی داوای سەربەخۆیی کوردستان – ی کردووە .

ئەگەر ئینگلیزەکان رازی بن ، ئەوە شێخ لە توانای دایە بۆ داگیرکردنی سلێمانیو شوێنی تریش بگرێ ، لەشکری عوسمانی دەربکاتو . . ئەوەبوو شێخ لەشکری عوسمانی لە سلێمانی چەك کردوو بۆ شاری مووسڵی رەوانە کردنەوە . . حوکمدارێتی کوردستانی بە سەرۆکایەتی خۆی دامەزراندو لە پاشان ئینگلیزەکان مەترسیان لە شێخ پەیدا کردو هەمیشە خەڵکیان لە شێخ هانداوەو لە ناو خێڵو تیرەکانی کوردستان لە دژی شێخ ئاژاوە بنێنەوە .

ئەوەبوو لە ٢٠ ، ١٩١٩/٥/٢١ شێخ فەرمانیدا هەرچی ئینگلیزێك هەیە لە شاری سلێمانی بیان گرنو . . ئینگلیزەکانیش دەست بەجێ سەربازەکانیان لە هەولێرو بەغداو کەرکوك کۆکردۆتەوەو بەرەو سلێمانی ناردوویانن شێخی مەزنیش لەشکرو سوپاکەی خۆی کۆکردۆتەوەو بەرەو دەربەندیخان رۆیشتووە ، بەم جۆرە شەڕ دەستی پێکرد ، هەرچەندە هەندێ خۆفرۆشی کورد لەو شەڕەدا یارمەتی ئینگلیزەکانیان داو توانیان شێخ بریندار بکەنو لە پەنای بەردێك شێخیان بە دیل گرتو کە ئەو بەردەش تا ئێستا ماوەو ناوینرا بەردە «قارەمانە» کە لە دەربەندی بازیاندا تا ئێستاکەش هەرناودارەو ناوەکەی بە زیندوێتی ماوەتەوە .

لە شەڕی دەربەندی بازیاندا سوپای شێخ (٢٠٠) شەهیدو (٨٠) برینداری بووو . . شێخو سەربازەکانی بەم رەنگە شوێنی خۆیان لە ناو لاپەڕەکانی مێژوو تۆمار کرد کەچی خۆفرۆشانی وەك مشیری هەمەوەندیش تا کورد ماوە هەرباسی خیانەتی ئەوە بەرامبەر بە گەلو نیشتمانەکەی ، کە چی کەریم – ی ، فەتاح بەگی هەمەوەندیش هەر شاعیرو گۆیندەی کورد هەیە ناوی بەسەربەرزو نیشتمانپەروەر ناو دەبات . چونکە یەکە قارەمانی کوردو شێخ مەحموود بوو . . هەر بۆیە کاوێساغا لە لاوکە مەزنەکەی کە بەسەر شێخ مەحموودی نەمردا گوتویەتی : ناوی کەریمی فەتاح بەگی هەمەوەند وەك قارەمانیك بردووە . کە شێخ چۆن داوای لێ کردووەو لاوکەکەش کۆپلەیەکی بەم شێوەیەی لای خوارەوەیە :

دەلۆی لۆ ، دەلۆیلۆ ، دەلۆیلۆ ، دەلۆیلۆ . . هتد
دەلۆیلۆ ، دەلۆی لۆ ، هۆ هۆ شێخێ زراف
دەلۆیلۆ ، دەلۆیلۆ ، بەهارە ب سەرێ سلێمانی داکەتم :
محەلێ شەڕانو وێلا . . لە عاسمانان خۆش دێ گڕێنی تەیارانو
شرقێنی مەترەلۆزان ، رەقێنی بەمباو شێنی وان ترومبیلا ، گازە
گازێ نۆبەدارا .

بەلێ شاهو شوهێدی شێخ مەحموود کاکێ شێخ قادر بابێ
لەتیف گەلە گەلە بەهەرسێ دەنگان گاز دەکا کەریم – ی –
فەتاح بەگ گەلی عەگیدان ئەورۆ دەست هەڵینانەکێ بکەن ،
چ گۆ دەست دەمە دارێ جامبیزارێ بگرم شارێ . . .)
دەلۆیلۆ ، دەلۆیلۆ ، دەلۆیلۆ ، دەلۆیلۆ . . هتد
دەلۆیلۆ ، دەلۆیلۆ ، هۆ هۆ شێخێ منۆ .

دووبارە بڕیاری لە سێدارەدانی شێخ لەلایەن دادگایەکی عورفی ئینگلیزەوە دەرچووو ، پاشان بۆ هندستان دوورخراوەتەوە ئینجا بۆ کوێت رەوانەکراوەو لە ماوەی مانگێکدا بە میوانی لای ئەمیری کوێت ماوەتەوە ، لە دواییدا بۆ بەغدا گەڕاوەتەوە . . لە پاشاندا بەرەو داری کەلی هاتەوە .

لە ١٤ی ئەیلولی ساڵی ١٩٢٢ز – دووبارە شێخ بوو بە حوکمداری کوردستانو پایتەختەکەشی هەر سلێمانیو شارەکەی هەڵمەتو قوربانی بوو .

لە کاتی حوکمدارێتی شێخدا پیاوانی رۆشنبیرو زاناکان دەستیان بە گۆڤارو رۆژنامە دەرچوون کردووە .

ساڵی (١٩٢٤) ز – دووبارە شێخ تووشی ناکۆکی لەگەڵ ئینگلیزەکان بووەتەوە ، بە ناچاری رووی کردۆتە ناوچەی

سووزداش‌و ئه‌شکه‌وتی (جاسه‌نه) . رۆشنبیره‌کان رۆژنامه‌ی (بانگ ـی ـحه‌ق) یان له‌و ئه‌شکه‌وته‌دا ده‌رکردووه‌و مامۆستای پایه به‌رز (مسته‌فا مه‌زهه‌ر) سه‌رنووسه‌ری (بانگ ـی ـحه‌ق) بووه .

جه‌نابی شێخ‌و له‌شکره‌که‌ی له شاخه‌کانی ده‌وروبه‌ری سته‌ڤی تا سالّی (١٩٢٦)ز - ماونه‌ته‌وه ، له پاشاندا به‌ره‌و مه‌ریوان کشاون تا شه‌ڕی ئاوباریك که له سالّی (١٩٣١) ز - له شه‌ڕی گل دوزخورماتوو رووی داوه ، پاشان شێخ له‌گه‌لّ کاربه‌ده‌ستانی میری که‌وتۆته گفت‌و گۆکردن ئه‌وه‌بوو بڕیاری دوورخستنه‌وه‌یان بۆده‌رکرد . له پاش ماوه‌یێك به ده‌ست‌به‌سه‌ری بردوویانه‌و (به‌غداو - ناسریه) یان ناردووه ، دووباره بۆ (به‌غدا) یان هێناوه‌ته‌وه‌و . هه‌مدیس له‌وێ به ده‌ست‌به‌سه‌ری ماوه‌ته‌وه .

خوالێخۆشبوو شێخ مه‌حموود ته‌نیا هه‌ر مرۆڤێکی خاوه‌ن ده‌سه‌لاّت نه‌بووه‌و به‌س ، وه‌ك له‌پێشه‌وه باسمان کرد . شێخ مرۆڤ بووه رۆشنبیرو زاناو داناو عالم‌و خاوه‌نی چه‌ند زبانێ بووه وه‌ك : کوردی‌و تورکی‌و عه‌ره‌بی‌و فارسی - ئه‌م زبانانه‌ی زۆر به چاکی زانیوه .

له‌سه‌رانسه‌ری کوردستاندا هه‌رچی سه‌رۆك تیره‌و عێل‌و بنه‌مالّه هه‌بووه . ناسیویه‌تی‌و به‌تایبه‌تی ده‌رباره‌ی بنه‌مالّه‌ی به‌رزنجه زۆر شاره‌زا بووه‌و ، جێگای برواپووه له هه‌ریه‌که‌یان بۆ چ سه‌رچاوه‌یێك گه‌ڕاوه‌ته‌وه بۆ بنه‌مالّه‌ی به‌رزنجه .

وه‌زۆر قسه خۆش‌و مه‌جلس گه‌رم‌و نکته‌بازو - له‌گه‌لّ هه‌ق‌و گێله پیاودا توانیویه بدوێت‌و خۆی له‌گه‌لاّ رێك بخات‌و بێ ئه‌وه‌ی له قسه زویرێت . .

جه‌نابی شێخ ئه‌و کاته‌ی که به دوور خراوه‌یی له به‌غدا ماوه‌ته‌وه وادیاره نیازی وابووه کتێبه ده‌سنووسه‌کانی خوالێخۆشبوو (حاجی کاك ئه‌حمه‌دی شێخ) وه‌ك پرۆژه‌یه‌ك چاپ بکات . دیاره له‌به‌رهه‌ندێ هۆی تایبه‌تی نه‌یتوانیوه له چاپیان بدات ، بۆیه ته‌نیا ئه‌م کتێبه‌ی به فارسی له‌سه‌ر ئه‌رکی خۆی چاپی کردووه ، به‌م ناوونیشانه (کتاب مکتوب أمر ونهي) من تصنيفات العالم الجليل والزاهد الرباني صاحب الكرامات المشهور قدس سره الحضرة الحاج السيد كاك احمد ابن السيد محمد معروف النودهي ابن المرحوم السيد مصطفى) ئه‌م کتێبه له چاپخانه‌ی الغری سالّی ١٣٥٥ك - ١٩٣٦ز چاپکراوه‌و ، ٣٢٤ لاپه‌ڕه‌ی قه‌واره ٢٤×١٧سم پێشه‌کی‌یه‌کی بچووك به عاره‌بی‌و مێژووی له دایك بوون‌و کۆچی دوایی جه‌نابی حاجی کاك ئه‌حمه‌دی تێدایه‌و پاشان باسی ڕحلّه‌کی باوو باپیرانی‌و هه‌روه‌ها باسی زنجیره‌ی (طريقة قادری ) تێدایه . .

وه کتێبه‌که (١٢) نامه‌ی جه‌نابی کاك ئه‌حمه‌دی شێخی تێدا نووسراوه‌ته‌وه .

ئه‌و پرۆژه گه‌وره‌یه‌ی شێخ مه‌حموود هه‌وڵی‌دا بو چاپکردنی ده‌سنووسه‌کانی خوالێخۆشبوو خۆی له خۆیه‌وه ئه‌وه‌مان بۆ ده‌سه‌لمێنێ که شێخ تا چ راده‌یه‌کیش ئه‌ده‌ب دۆست‌بووه .

له سالّی ١٩٤١ز دا جه‌نابی شێخ پاش شۆڕشه‌که‌ی ره‌شید عالی گه‌یلانی گه‌ڕاوه‌ته‌وه ناوچه‌ی سلێمانی‌و بۆ یه‌کجاری له دێی «داری که‌لی» دانیشتووه ، داری‌که‌لی‌و دێهاته‌کانی ده‌ورو به‌ری شاری سلێمانی به هۆی شێخی گه‌وره‌وه ده‌بنه په‌ناگایه‌کی گه‌وره بۆ هه‌ژارو لێقه‌وماوانی ئه‌وسه‌رده‌مه .

تا له سالّی ١٩٥٦ ز - داری که‌لی به‌جێ‌هێلاو له شه‌وی ١٩٥٦/١٠/٩ - ز ، له خه‌سته‌خانه‌ی «الحیدری» له به‌غدا به‌یه‌کجاری مالّ ئاوایی کردو گه‌ل‌و نشتمانی جێ هێشت‌و پاشان ته‌رمه پیرۆزه‌که‌یان بۆ شاری هه‌لّمه‌ت‌و قوربانی هێناوه‌ته‌وه‌و دوای خۆپشاندانێکی یه‌کجار نه‌قولاّ له مزگه‌وتی گه‌وره له ته‌نیشت (حاجی کاك ئه‌حمه‌دی شێخ نێژراوه ئه‌وێ بوو به ئارامگای ئه‌و زاته مه‌زنه هه‌تا هه‌تایێ نه‌مری‌و سه‌ربه‌رزی بۆ شێخ مه‌حموودی نه‌مر رۆلّه‌ی به‌وه‌فای گه‌لی کوردمان .

سوود له‌و سه‌رچاوانه‌ی خواره‌وه وه‌رگیراوه .

١ - گۆڤاری کاروان - ژماره ٢٦-ی تشرینی دووه‌می سالّی ١٩٨٤ - نووسینی کاك له‌تیف به‌رزنجی .

٢ - هه‌مان سه‌رچاوه - لێکۆڵینه‌وه‌ی مامۆستا کمال رؤوف محمد



# قەناتێ کوردۆ

○

ژ نڤیسینا جۆیس بلاو
○
عبد السلام علي میرزا
ژ تیپێن لاتینی وەرگێرایە

○

د شەڤا ۳۱–۱۰–۱۹۸۵ دە زانەو وەلاتپارێزێ ناڤدار قاناتێ کوردۆ ل لەنینگرادێ وەفاتکر. بمرنا وی گەلێ کورد یەك ژ هێژاترین زانەیێن خوە، ئەنستیتویا کوردی[1]، جارەك دن، هیمدارەکێ خوەیێ گرانبها وندا کر.

ق. کوردۆ د سالا ۱۹۰۹ دە ل گوندێ سووسزی، نێزکی قاقزمانێ، د ناڤچەیا قەرسێ دە هاتبو دنێ. ئەڤ ناڤچە، کونها د تخوبێن کۆمارا ترکییێ دەیە، هندێ ل ژێر حکمێ رووسیا تساری دەبوو. باڤێ وی، کەلەش خدر، گوندیەکی بەلەنگازی ژ عەشیرا یەزیدییا شەرقیبوو. شەرێ جیهانێ ڤێ یەکاییێ ناڤچەیێ سەرو بنی کربوو. وخەسارەکا مەزن گەهاندبوو روونیشتەڤانێن وێ‌یێن کوردی... مالباتا قانات ژ بەر شەرو ژ بەر هوڤیتیو خوێن رێژیا ئۆردویێن ئۆسمانیا مەجبور ما ئاخا باڤو کالێن خوە ب تەرکینەو بەر ب باکورڤە هەرەو پێشیێ ل چنکانییێ (کۆر بلاخێ) د ناڤچەیا ئاپارانێ جیوار دبە، لێ پێشڤەچوونا لەشکەرێن ئۆسمانی مالباتێن کورد مەجبوور دکە کو هێ دوورتر هەرن. مالبات، دا داوییێ دەخوە د گەهینە تفلیسێ ول ور، پەی چەند مهان، د ۱۹۲۱دە باڤێ قانات کەلەش دمرە. مالاوان بەلەنگازو شەرپەزە دمینە.

جیواربوونا بەرەبەرەییا رەژیما سۆڤیەتی هێدی هێدی ژیانا وانو یا هەموو جەمعەتا کوردییا قافقاسیاییێ دگوهەرینە. هاگۆب «لازۆ»[2] وئۆلگا گازاریا[3] ژ بۆ خۆرتێن کورد ئێن بازارێ تفلیسێ یەکەمین خوەندەگاها کوردی ڤەدکرن. ژ بۆ هێکرنا وان لازو ژ تیپێن ئەرمەنی ئەلفابەیەکا کوردی چێ دکە. قانات ژی دچە ڤێ خوەندگەهێو گاڤا کو ئەو د ۱۹۲۸دە وی دقەدینە عەرەب شەمۆ، کو ب چەند سالان ژوی مەستر بوو

پارتیا کۆمونیستا ئەرمەنستانێ هەشت بوورس ستەندبوو ژ بۆ خوەندەکارێن کورد هەرن ل زانین گەها لەنینگرادێ خوەندنا بلند بخوینن . قانات دبە یەك ژ وان پورسداران . ئەو د ئیلۆن ١٩٢٨ێ دە دچە لەنینگرادێ‌و ل ور ل بەر دەستێن ئا ئا . فەرەژمانو ی . ئا ئۆربەلی چێترین روهەلاتناسێن سۆڤیەتی یێن وی دەمێ‌و هیکدارێن کوردناسیا سۆڤیەتی ، دبە خوەندەکارێ ئیرانناسیێ ئەو وسا ژێ ل جەم ی ی زاروبین ڤێرێ بلووچی‌و زمانێن پامیری‌و تەڤ ن ی مارر هینی زمانەڤانیا گشتی دبە هێ خوەندناوی خلاس نەبوو یەکو ق . کوردۆ د ١٩٣٤دە ، دبە مامۆستەیێ کوردی ، پێشیێ ل ڤاکولتا فیلولوژیێ‌و دووره ژێ ل ئەنستیتویا خەباتکاران . د ناڤ تەقەرەڤا شەری جیهانێ یێ دووەمین دە تەزا خوە یا دوکتۆرایێ لسەر «ئاڤاهی‌یا پێژەیێن تێگەری (فیل)دە د زمانێ کوردی دە» تەمام دکەو وێ د ١٩٤١دە ددە چاپکرن . کوردناسیا سۆڤیەتی سال ب سال پێشڤە دچەو کورد ل خوە د ڤێ خەباتا زانستی دە رۆلەکە بەرە بەرە مەستر د لەیزن .

قانات ب خورتی بەشداری شەری ل دژی نەیارێ نازی بوو بووو گەمارۆیا (محاسەرا) خەدار ئا لە نینگرادێ ب خوە ژێبوو . پشتی پەرچڤاندنا نەیار ، ب ڤەگەرا ئاشتیێ ئەو دبە ئەندامێ پارتیا کۆمونیستێ ئا یەکیتیا سۆڤیەتی . د ١٩٤٥ دە ئەو دبە مامۆستەیێ زمانێ کوردی د بەشا ئیرانناسی‌یێ ڤاکولتا روهەلاتناسی‌یا لە نینگرادێ . د ١٩٥٩دە ی ئا ئۆربەلی د ئەنیستیتویا گەلێن ئاسیایێ‌یا ئاکادەمی یا زانستی‌یا یەکیتیا سۆڤیەتی دە بەشەکی کوردی یێ سەربخوە داتینەو ژ ١٩٦١یێ ڤە شەرەڤا سەرمیانیا ڤێ بەشێ دبە پارا قاناتێ کوردۆ .

خەباتکارێ وەستیانەناس ، ق . کوردۆ د گەلەك وارێن کورد ناسیێ دە ئافراندنێن گرینگ دهێلە . ژبۆ چێکرنا لیستەکا خەباتێن زانستی یێن وی مە ژکانیێن جهێ کەلك گرت‌و مخابن مەنکاربوو تێکوزیا تەڤاهیا ڤان ئاگاهداریان کۆنترۆل بکن . مە ستێرکەکێ دانیە بەرهن ئاگاهدارێن کو دەرەجا راستیا وان بەش رۆناك نینیە لێ دکارن ب کێری خوەندڤان بێن بیبلۆگرافیا ژێرن ل گورا پەرگالا دیرۆکی هاتیە چێکرن‌و مە یەو ب چار واران دابەش کر : زمانە ڤانی ، فۆلکلۆرو ئەدەبیات ، دیرۆك ، فەرهەنگ .

## زمانە ڤانی

١ – ناساندنا گرامەرا کوردی یا ئا خاتوریان ، د ریا تازە نۆ . ٣٦ و ٣٧ ، ئێریڤان ، ١٩٣٧ .

٢ – ب هەڤکاریا ئا . شامیلۆڤ‌و ی . چوکرمان Oproble ma roday kurdskom jozke لسەر پرسا جسنێ د کوردی دە) ، د Revolijucijai piśmennost شۆرەش‌و ئەدەبیات ، نۆ ١ . مۆسکڤا ، لە نینگراد ١٩٣٠ ، ر ، ١٧٩–١٨٠ .

٣ – ب هەڤکاریا ئا . شامیلۆڤ‌و ی . چوکرمان Ob izafete v. Kordskom jazke (ئزافە د زمانێ کوردی دە) Revolijuciya i pismennost «شۆرەش‌و ئەدەبیات) نۆ . ١ (١٦) ، مۆسکڤا – لە نینگراد ١٩٣٣ ، ر ٥١–٥٦ .

٤ – لسەر زمانێ ئەدەبی‌یێ ئەرمەنیستانا سۆڤیەتی ، د ریا تازە ، نۆ ، ٣١ ، ئەریڤان ، ١٩٣٣ .

٥ – قایڤەیێن نڤیساندنا زمانێ کوردی ، د ریا تازە ، نۆ ٣٣ ، ئەریڤان ، ١٩٣٣ .

٦ – پێشڤە برنا زمانێ کوردی ، د ریا تازە ، نۆ ٦٨ ، ئەریڤان ١٩٣٤ .

٧ – Obravanie sloznyx glagolov v kurdskom jazyke (ئاڤاهیا بێژەیێن لێگەری د زمانێ کوردی دە) ، کورتەیا تەزا دوکتۆرایێ ، لە نینگراد ، ١٩٤٠ ، ٤ ر .

٨ – گراماتیکا زمانێ کورمانجی ژ بۆنا دەرسخانێد ٣–٤ ، ئەریڤان ، نەشیرەتا دەولەتا ئەرمەنیستان ١٩٤٩ ، ١٥٧ ر ئەڤ رێزمانا کورمانجی رۆلەکە گرینگ لەیست د خوەندەگاهێن کوردی یێن ئەرمەنیستانا سۆڤیەتی دە ، ب ئالفبەیا کریلیك (رووسی) هاتیە نڤسین .

٩ – راستنڤیسینا کوردی ، د ریا تازە ، نۆ ٥٨ ، ئەریڤان ، ١٩٥٥ .

١٠ – Kritika osibocnyx czgljadov na kurdskij jazyk (ڕەخنەیا دیتنێن خەلەت لسەر زمانێ کوردی) ، د Kratkie soob scniya instituta vostokovedeniya, ks ٤ . جلد ٧ ، مۆسکڤا ، ١٩٥٥ ، ر ، ٤٣–٦١ (ڕەخنەیا تەۆرێن ژاڤەتی یێن مار کو ب . مللەر ، ئۆ ڤلچە ڤسکژوی چوکەرمان تەتبیقێ زمانێ کوردی کرنە) ئەورەحمان حاجی مارف ڤێ لێگەرینە ب ناڤێ (ڕەخنە لە بیرو باوەری هەلە لە بارەی زمانی کوردیەوە) . وەرگەراندیە کورمانجیا خوارێ (سۆرانی) و د هەندێك بیرو باوەری هەلە لە بارەی زمانی‌و مێژوویا کوردەوە دە دەرخستیە ، بەغدا ، ١٩٧٣ – ١٩٧٤ ، وە شانا کۆرا زانیاری‌یا کوردی ، ر ، ٦٩–١٠٥ .

١١ – گراماتیکا زمانێ کوردی سەر زاراڤێ کورمانجی بۆنا کۆمید ٥–٦ ، ئەریڤان ، وەشانخانا هایەتهرات ، ١٩٥٦ ، ١٥٧ر . چاپا نوویا پرتووکا کو د ١٩٤٩ دە دەرکەتبوو .

١٢ – Nimerativnye slova v kurdskom (پەیڤێن هەژمارتنێ د زمانێ کوردی دە) ، د Kslv ، جلد ١٢ ، مۆسکڤا – لە نینگراد ، ١٩٥٦ ، ر ، ٢٨–٣٦ .

١٣ – Fonetika, morfologia (کورماندزی) Grammatika kurdsgo jazyk (ڕێزمانا زمانێ کوردی ، کورمانجی ، فونەتیك ، مورفولوژی) مۆسکڤا – لەنینگراد ، ١٩٥٧ ، ٣٤٧ ر . وەشانا ئەکادەمیا زانستی یا یەکیتیا سۆڤیەتی . ئەڤ ڕێزمانا کورمانجی ، ب زمانی ڕووسی ، ب بیرانینا لێگەرینێن ڕێزمانی کوهەتا سالێن ١٩٥٠ هاتنە کرن ، دەستپێ دکە (ر ، ٤–١٤) . د داوییا وێ دە پێنج چیرۆك‌و هەلبەستێن کوردی ب تیپێن لاتینی‌و کریلیکی نفیسی (ر ، ٣٠٠–٣٣٤)‌و پرتووکناسیە کە هەلبژارتی (ر ، ٣٣٦–٣٣٨) هەنە .

١٤ – Kurdkij (زمانێ کوردی) di Sovremennyj Iran jazyk (ئیرانا هەمدەم) ، مۆسکڤا ، ١٩٥٧ ، وەشانا ئاکادەمیا زانستی‌یا یەکیتیا سۆڤیەتی ، ر ، ٦٠–٧٥ .

١٥ – K voprosam slovoobrazovaniya v kurdskom jazke 1 – leksiko – grammaticeskoe znacenie udvoenija slov v kurdskom jazyke 2 – Obrazovanie otvlecennyx imen v kurdskom jazyke (لسەر پرسێن چێکرنا پەیڤان د زمانێ کوردی دە .
١ – مانا فەرهەنگی‌و ڕێزمانی‌یا دوجار بوونا پەیڤان .
٢ – چێکرنا ناڤێن موجەرەت د زمانێ کوردی دە) د voprosy Grammatiki iistorii costocnyx jazykov VGIV ، مۆسکڤا – لە نینگراد ، ١٩٥٨ ، ر ، ١٠٩ – ١٤٨ .

١٦ – odvux principax obrazovanija sloznyxslov. podcinite lnogo tipav kardskom jazyke (لسەر دوو نبگەهین چیکرنا پە یڤێن هە ڤە دودانی یێن پێگر دزمانێ کوردی‌دە) ksiv نۆ ٢٤ ، ١٩٥٩ ، ر . ٦٥–٧٤ .

١٧ – Obektnoei subektnoe sprjazenie perexodnogo glagola y jurdskom jazyke na materiale dialektov kurmandzii sorani (بکارانینا لێگەرا دەرباسەك د زمانێ کوردی دە ژ بەر ماتەریەلێن زاراڤێن کورمانجی و سۆرانی) گۆتار د کۆنگرا ناڤنەتەوەیی یا ٢٥ ئا ڕۆهەلاتناسان ، مۆسکڤا ، ١٩٦٠ ، ٩ر .

١٨ – O zacenijax i Funkcijax suffiksa – K – (aka) v kurdskom jazyke

(ڕوومەت‌و کارینەیێن پاشدانیا – ك – (ئاکا) د زمانێ کوردی‌دە) di Issledovanija po istoril kultury narodov vostoka vcest Akademika I.A. Orbeli (لێگەرین لسەر دیروکا چاندێن گەلێن ڕۆهەلات بەرهەڤۆکا دیاری ژ ئاکادەمیڤان ی . ئا . ئۆربەلی ) ، مۆسکڤا – لەنینگراد ، وەشانا ئاکادەمیا زانستی‌یا یەکیتیا سۆڤیەتی ، ١٩٦٠ ، ر ، ٣٦١ – ٣٦٨ .

١٩ – گراماتیکا زمانێ کوردی بۆنا دەرسخانێد ٥–٨ ،

ئەریڤان ، ۱۹٦۰ ، ۲۰٦ر . ئەڤ ئاڤراند چاپا نوویا پرتووکا کو د ۱۹٥٦ دە دەرکەتی یە . نڤیسکار بەشەك لسەر فۆنەتێکیّ ب سەرڤە کریە ، کو د چاپێن بەریّ دە نەبوو .

۲۰ – (زمانیّ کوردی) Kurdskij jazy/ Moskva, 1961, 79 r. Izdatelstvo vostocnoj literatury jazyki zarubeznogo vostoka i afriki, pod obscey redakciej prof. G.P. Serdjucenko (کورتەیەك بچووك ، ب زمانیّ رووسی ، ئا رێزمانا کورمانجیا ژۆرینو ناڤەندی کوردی ب ئالفابەیا کیریلیك هاتیە نڤیسین .

۲۱ – Suffiksacija v Kurdskom jazyke (پاشدانی د زمانیّ کوردی دە) ، د KSIV نۆ ٦۷ ، مۆسکڤا – لە نینگراد ۱۹٦۳ .

۲۲ – زمانیّ کوردی ، رێزمانا ، کتێبا دەرسیّ بۆنا دەرسخانید ٤–۷ ، چاپا نوویا پرتۆوکا د . ۱۹٦۰ دە دەرکەتی وەشانێن کۆمکار ڤیّ پرتووکیّ قەلباندنە تیپێن لاتینی و د ۱۹۸۱ دە فرانکفوورتیّ چاپکرنە .

۲۳ – Kategorija rodai obektnaja konstrukcija v Iranskoe (جسنو ئاڤاهیا یەکسەر د زازایی دە) د zaza jazykoznanie ، مۆسکڤا ، ۱۹۷٥ ، ر ، ۱۰٤ – ۱۱۸ – ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم ڤیّ بەندیّ ب ناڤیّ (حالبەتەکانی جنسی و ـی بەوکار لەزازادە) وەرگەراندیە کورمانجیا ناڤەندی (سۆرانی) و د کۆڤاری کوری زانیاری کورد دە ، جلدە ، بەغدا ، ۱۹۷۷ ، ر ، ۲۳٦ – ۲٦۳ دە بەلاڤ کریە .

۲٤ – Esce raz o Formax mnozectvennogo cisla imena v kurdskom jazyke (جارەك دن لسەر تەشەیێن پرۆژماریا ناڤان د زمانیّ کوردی دە) د Instvost A.N., Leningradskoe otdelenie جلد ۱ ، مۆسکڤا ۱۹۷۷ ، ر ۲٥۰ – ۲٥۹ .

۲٥ – Grammatika Kurdskogo jazyka, na materiele dialektov, Kurmandzi i sorani (رێزمانا زمانیّ کوردی ، ب ماتەریەلێن زاراڤێن کورمانجی و سۆرانی ) ئاکادەمیا زانستی یا یەکیتیا سۆڤیەتی ، ئەنستیتویا رۆهەلاتناسیّ ، مۆسکڤا ۱۹۷۸ ، ۲۹٤ ر . رێزمانەك بەر هەڤدانی یا هەردو زاراڤێن ئەدەبی یێن کوردی[٤] .

## فۆلکلۆرو ئەدەبیات

۲٦ – ب هەڤکاریا ی . ی . چوکەرمان ، Kurdskio teksty (مەتنێن کوردی) د Iranski jazyke جلد ۲ ، مۆسکڤا – لەنینگراد ، ۱۹٥۰ ، ر ، ۲۹–٦۱ مەتنو وەرگەراندنێن مامیّ ئەیشیّو ئەبووزێد بن هەلال تەڤی نیشەیەن رونا، کەر .

۲۷ – تاریخا نڤیساندنو چاپکرنا فەرهەنگێت کوردی ، د رۆناهی نۆ ۸ و ۹ ، بەغدا ، ۱۹٦۱ .

۲۸ – ب هەڤکاریا م . رودەنکۆ Kurdskie poslovicy i pogovorki (مەتەلوکێن کوردی) د poslovicy pogovorki marodov vostoka, M.I.V.L. مۆسکڤا ، ۱۹٦۱ ، ر ، ۳۳۰ – ۳۳۹ .

۲۹ – سیڤا حاجی ، دەستانەکە رۆمانتیك ئا کوردی ، مۆسکڤا ، ۱۹٦۲ .

۳۰ – قەلای دەمدم ، دەستانەکە مێرخاسی یا کوردی مۆسکڤا ، ۱۹٦۲ .

۳۱ – مەمیّ ئەیشیّ ، دەستانەکەرۆمانتیك ئا کوردی ، مۆسکڤا ، ۱۹٦۲ .

۳۲ – پیشگۆتنا (ر ، ٥–۱۱) پرتووکا مارووف خەزنەدار کێش و قافیە لشعری کوردیدا ، بەغدا ، ۱۹٦۲ ، ٦۷ ر .

۳۳ – ب هەڤکاریا ی . ی چوکەرمان iz kurdkogo eposa (ژ دەستانێن کوردی) di Iranskij sbornik k semides jatipjtiletiju prof. i.i. zarubina, Moskva 1963. I.Z. Vostocnoj Lireatury ئاکادەمیا زانستی یا یەکیتیا سۆڤیەتی Inst jazykounanija +Inst Narod Azii I.V.L ، ر

. ٢٤٩ - ٢٥٥

٣٤ - بیرو باوەرا کوردایەتیێ د نڤیسارێد ئەحمەدێ خانی دە ، دچیا نۆ ، ٧ ، بەرلین ، تەباخ ١٩٦٩ ، ر ، ٣-٦ و نۆ ٨ ، کانوون ١٩٧٠ ، ر ، ٣-٤ .

٣٥ - لێگەرین لسەر ئەدەبیاتا کوردی لئیراقێ ، NAA (کۆڤارا گەلێن ئاسیاو ئافریکایێ) ، تۆ ، مۆسکڤا ١٩٧٥ ، ر ، ١٤٣-١٥٥ . شوکریە رەسوول ڤێ خەباتێ وەرگەراندیە کورمانجیا ناڤەندیو د کۆڤاری کوری زانیاری ئیراق ، دەستەی کوردی ، جلد ٧ ، بەغدا ، ١٩٨٠ ، ر ، ٨١-١١٢ دە بلاڤ کریە لێگەرین لسەر ئەدەبیەتا کوردی لئیراقێ ژ داویا سەد سالا داوین تا سالێن ١٩٦٠ ئە ستی رەسوول تەنێ بەندێ وەرگەراندیە هن شاشیێن وێ ژی راست کریە .

٣٦ - کۆمەلە تێکستێ فۆلکلۆری کوردی ، بەغدا ، وەشانا کوری زانیاری کورد ، ١٩٧٦ ، ٢٧٣ ر شوکور مستەفا و ئەنوەر قادر محەمەد ڤان مەتنێن کورمانجی قەلباندنە تیپێن عەرەبی یێن کو لعیراقێ بکار تینن . پرتووك ب کەتنیە کە عەورەحمان حاجی مارف لسەر دیرۆکا پێکانینا بەرهەڤۆکێن فۆلکلۆرا کوردی دەست پیێ دکە . تێ دە دەستانێن : عەلی محەممەدی نیچیرڤان ، ئەبوو زێدی بن هلال ، میرزا مەمموود ، چیروکا تووتێ ، ڤیرو پۆر سۆر ، میر محە ، ئەحمەدی بەختەوار ، دو رێوی ، ئەحمەدێ پالە ، دمدم ، پەندێن پێشنینان ، فۆلکلۆر کوردێن ئازێریجانا سۆڤیەتی ، گەپیێ پێشنینان ، دو پارا شێر ، ، تێدەر خستنۆك هەنە

٣٧ - دەرهەڤا شۆڤێد مەمو زینێ ، زارگوتنو شۆڤا مەم و زینا ئەحمەدێ خانی ژ نڤیسارا پەیوەندیا فۆلکلۆرو لێتراتوورا کوردی ، د کۆڤاری کوری زانیاری کورد ، جلد ٦ بەغدا ، ١٩٧٨ ر ، ٧٨-١١٠ .

٣٨ - بیرو باوەرا وەتەنپەروەریێ لفۆلکلۆرو لێتراتوورا کوردا ، د کوردستان ، دەنگێ یەکەتیا خوەندەکارو لاوانێن کوردستان لئاورووپا ، نۆ ، ئەباخ ١٩٨٣ ، ر ، ١٥-٢٤ . ئەڤ نڤیسار پاشێ ب کورمانجیا ناڤەندی ب ناڤێ (بیرو باوەری نشتمانپەروەری لە فۆلکلۆرو ئەدەبی کوردیدا) د کۆڤارا پێشەنگ ، مۆ ، ٤ کانوون ١٩٨٣ دە دەرکەتیە .

٣٩ - تاریخا ئەدەبیەتا کوردی ، جلدا ١ ، ستۆکهۆلم ، وەشانێن رۆژا نوو ، ١٩٨٣ ، ١٩٢ ر[٥] .

جلدێ یەکەمین ئێ ڤێ پرتووکا کو ب کورمانجیو تیپێن لاتینی هاتیە نڤیسین لسەر ژیانو ئافراندنێن شاعرێن کوردستانا باکورە ، عەلی حەریری ، ئەحمەد مەلە باتێ . فەقێ تەیران ، مەلەیێ جزیری ، سەلیم سولێمان ، ئەحمەدێ خانی ، حارس بتلیسی ، پەرتەو بەگی هەکاری ، شێخ خالد ، سیاهبووش ، جگر خوین ، ئۆسمان سەبریو قەدری جان . تێدە وسا ژی کەتنەکە درێژ هەیە لسەر تەڤاهیا خەباتێن کو ژ وەشانا Recueil de de notices et recits kourdes ئا جابا ل ست پەتە سبورگێ د . ١٨٨٠ دە تا ئیرو لسەر ئەدەبیەتا کوردی هاتنە کرن نڤیسار لسەر رۆلا چاپەمەنیا کوردی پر رادوەستە .

٤٠ - تاریخا ئەدەبیەتا کوردی ، جلد ٢ ، ستۆکهۆلم ، ١٩٨٥ ، ١٧٨ ر . ئەڤ جلدێ دووەم ئا تاریخێ لسەر ژینەنگارێنو ئافراندنێن شاعرێن کو ب کورمانجیا ناڤەندی نڤیسینەیە نالی ، کوردی ، حاجی قادر کۆیی ، شێخ رەزا تەلەبانی ، ئەدەب ، عەبدلا مسباح ، مەلا محەمەد کۆیی ، وەفایی ، غەریق ، بێخود ، زیوەر ، سەبری ، سەلام ، سالم ، قانع ، ئەحمەد موختار بەگ ، پیرەمێر ، عەبدولـلاهـ گۆران ، دلدار ، بێکەس ، رەمزی مەلا مارف ، هەژار .

## دیرۆك

٤١ - Zarubežnaja kurdskaja literatura OSSSR (وەشانێن کوردێن دەرەکە لسەر ی . ك س . س)[٦] د . Naucnja sessija GCUV g. Leningradskaja Gosudarstvennako ordena, Lenina Univ im. A.A. Ẑdanova لەنینگراد ١٩٨٩ ، ر ، ٤٥-٤٦ .

٤٢ - Zaruberžnaja kurdskaja literatura o polozenii kurdov v SSSR (وەشانێن کوردێن دەرەکە لسەر رەوشا

کوردێن ی . ك س . س) د Ucenye Zapiski L GU ، ١٩٥٢ ، نۆ ١٢٨ ، رێزا رۆهەلاتناسیا زانستی ، نۆ ، ٣ Istorija Filologija ڤۆستۆکا ، ر ، ١٣٦-١٥٠ .

٤٣ – Falsifikacija istorii kurdov v persidskoj burzuazoj istoriografii (تەحریفا دیرۆکا کوردان د دیرۆکنڤیسیا بوورژووازی‌یا فارسی دە) . لە نینگراد ، نۆ ١٧٩ ، رێزا رۆهەلاتناسیا زانستی نۆ ٤ ، ١٩٥٤ ، ر ، ١٢٠-١٣٧ ئەڤ نڤیسار رەخنەیەکە لسەر پرتووکا غولام رەزا رەشید یاسمی kord ve peyvestegiye tarīxī ve nejadiyē (کوردو پەیوەندییێن وان ئێن دیرۆکی‌و رێگەزی) . ئەورەحمان حاجی مارف ڤێ، بەندا ڤێ . کوردۆ وەرگەراندیە کوردیا ناڤەندی‌و د هەندێك بیرو باوەری هەلە لە بارەی زمان‌و مێژووی کوردەوە ، بەغدا ، وەشانا کوری زانیاری کورد ١٩٧٣ - ١٩٧٤ ، ر ، ٣٤-٦٨ ، بەلاڤ کریەو عەبدولـلاهـ مەردووخ ژی وێ کریە فارسی و د کۆڤارا ئالفبا ، نۆ ٥ ، پاریسن ، ١٩٨٤ دە چاپ کریە .

٤٤ – Xaçatur Abovian kak kurdoved — etnograf (خاچاتور ئابۆڤیان وەکی کوردناس – ئەتنۆگراف) د Izvestija A.N. Arm SSSR ، رێزا زانستی‌یێن جڤاکی جلد ٢٠ ، ئەریڤان ١٩٥٥ ، ر ، ٨٩-٩٨ .

٤٥ – Xacatur Abovian kak kurdoved issledovatel (خاچاتور ئابۆڤیان وەکی کوردناس – لێگەر) د Očerki po istorii russkogo vostokevedenija (نێرین لسەر دیرۆکا روهەلاتناسیا رووسی) جلد ٢ ، مۆسکڤا ، ١٩٥٦ ، ر ، ٣٦٠-٣٨٠ .

٤٦ – Kurdy (کورد) di Narody perednej Azii (گەلێن ئاسیا نێزیك) ، مۆسکڤا ، ئاکادەمیا زانستی‌یا UKSS ١٩٥٧ ، ر ، ٢٤٢ - ٢٦٠ .

٤٧ – uspexi sovetskogo kurdovedenija (پێشڤەچوونێن کوردناسیا سۆڤیەتی) د کۆمونست ئەریڤان ، ٦ ، ١٠ ، ١٩٥٩ ، نۆ ٢٣٦ (٧٧٠٩) ، ر ، ٣ .

٤٨ – Trudy P.L. Lerxa po kurdovedeniju — k voprosu ob izucenii istorii kurdov v Rossii (خەباتێن ، پ ، ل ، لەرخ لسەر کوردناسیێ لسەر پرسا داهوورنیا دیرۆکا کوردان لرووسیاێ) د Ocerki po istorii Russkogo vostokovedenija ، مۆسکڤا ، ئاکادەمیا زانستیا ئەنستیتویا رۆهەلاتناسیێ ، جلد ٤ ، ١٩٥٩ ، ر ، ٣٩-٥١ ، ئەڤ خەبات هاتیە وەرگەراندنە کوردیا ناڤەندی و ل ژێر (نووسراوەکانی لێرخ لە بارەی کوردەوە) د کۆڤاری کوری زانیاری کورد ، جلد ، ٢ ، بەغدا ١٩٧٤ ، ر ، ٦٢٤-٦٦٣ دە چاپ بوویە .

٤٩ – Razvitie sovetskogo kurdovedenija (پێشڤەچوونا کوردناسیا سۆڤیەتی) . د Ucenye Zapiski instituta vostokovedenija ئاکادەمیا زانستی‌یا YKSS ، جلد ٢٥ ، مۆسکڤا ، ١٩٦٠ ، ر ٥٧-٦٧ .

٥٠ – تاریخا چێکرن‌و نەشریاتا فەرهەنگێن کوردی ، د رۆناهی ، بەغدا نۆ ، ٩ و ١٠ ١٩٦١ .

٥١ – بریێ کورد ناسیێ ل لەنینگراد د چیا ، نۆ ٤-٥ ، ١٩٦٧ – ١٩٦٨ ر ، ٤-٥ .

٥٢ – کتێب‌و مقالێد کوردناسی ، د ، چیا ، نۆ ٦ و ٧ ١٩٦٨-١٩٦٩ .

٥٣ – لە بابەت نەڤیسکار ، زمان‌و ئەلیفابێ پەرتووکێت دینێ ئێزدیان ، د کۆڤاری کوری زانیاری کورد ، جلد ١ ، ١٩٧٣ ، ر ، ١٣٢ - ١٧٩ .

٥٤ – شیکردنەوەی بەلگەکانی گەزنەفۆن[٧] دەربارەی کاردوخەکان ، د هەندێك بیرو باوەری هەلە لە بارەی زمان‌و مێژووی کوردەوە ، بەغدا ، ١٩٧٣ - ١٩٧٤ ، ر ، ١٠٦ - ١٢٠ ئەورەحمانێ حاجی مارف تەڤاهیا گۆتارا کو قاناتێ کوردۆ د کونفەرانسا ئیراناسان ئاژ بۆ خاترا شیست سالیا پرۆڤە سۆر بۆلدرەڤ دە خوەندبوو وەرگەراندیە کورمانجیا ناڤەندی کورتەیەکە ڤێ گۆتارێ د ١٩٦٩ دە ل مۆسکڤایێ دەرکەتبوو . ماروف خەزنەدار ڤێ کورتەیێ کربوو کوردی و د دەفتەری

کوردەواری نۆ ، ١ ، کانوون ١٩٧٠ ، ر ، ١٢١–١٢٦ دە پەلاڤ کربوو .
٥٥ – چەند تێبنیەك لسەر کتێبەکەی ڤلجە ڤسکی ، د هەندێك بیرو باوەری هەلە لە بارەی زمانو مێژووی کوردەوە ، بەغدا ١٩٧٣ – ١٩٧٤ ، ر ، ١٢١–١٤١ ، ئەڤ نڤیسارا کو ب رووسی هاتیە نڤیسین لێ چاپ نەبوویە ئەورەحمان حاجی مارف وەرگەراندیە کوردیا ناڤەندی تۆلا ل ڤلجەڤسکی شاگرتێ ئاکادەمیڤان مارر بووو تەۆرێین وی یێن (ژافەتی) تەتبیقێ کوردی دکەڤ کوردۆ ل بەر وی رادبە .
٥٦ – سەرنجەك لە نووسراوەکەی ئاکۆپۆڤ ، رەخنەی مێژوویی لەمەسەلەی نەژادی کورددا ، د هندێك بیرو باوەری هەلە لە بارەی زمانو مێژووی کوردەوە ، بەغدا ١٩٧٣ – ١٩٧٤ ، ر ، ١٤٢ – ١٦٦ گ . ب . ئاکۆپوڤ ، ئیرۆ سەروکێ بەشێ کوردناسییێ زانینگەها ئەریڤانێ ، شاگرتەکی ئاکادەمیڤان مارە ، ق . کوردۆ ب خورتی ل دژی تەزێن وی یێن لسەر ئەسلێ کوردان دەردکەڤە .
٥٧ – ی ئا ئۆربەلیو کوردناسی ، وەرگەراندنو تێبنیێن ئەورەحمانی حاجی مارف ، د کۆڤاری کوری زانیاری کورد ، جلد ٣ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ر ، ١١٣ – ١٤٢ .
٥٨ – ما رگریتا بورسنۆڤا رودەنکۆ ١٩٢٦–١٩٧٧ ، د N.A.A. ١٩٧٧ . نۆ ، ٤ ، ر ، ١٤٧ نڤیسارەکە لسەر مرنا کوردناسا سۆڤیەتی یا ناڤدار رودەنکۆ .
٥٩ – K. istorii kurdskoj periodiceskoj pecati (گازەتا کوردستان ) (لسەر دیرۆکا کۆڤارا کوردی کوردستان) ، د pismennye pamjatniki i problemy istoril kultury narodov vostoka ئاکادەمیا زانستی یا YKSS جلد ٢ ، ئەنستیتویا رۆهەلاتناسیێ ، مۆسکڤا ، ١٩٨٢ ، ر ، ١١٩–١٢٥ .
٦٠ – دسێرتاسیێن کوردناسیێ ، د رۆژا نوو ، کۆڤارا هونەری چاندیو ئەدەبی ، نۆ ٨ ، ستۆکهۆلم ، ١٩٨٥ ، ر ، ٤٧٧ . نڤیسکار ڤالا هەموو تەزێن دۆکتورایێ کو خوەندەکارین سۆڤیەتی ئان نە سۆڤیەتی ل یەکیتیا سۆڤیەتیێ د واریێ کوردناسیێ دە چێکرنە دکە ٣٨ تەز لسەر ئەدەبیاتو فۆلکلۆرا کوردان ١٨١ تەز لسەر زمانێ کوردی و زاراڤێن وی .
٦١ – نڤیسارا کورتە بەری یا تاریخا کوردناسیا رووسستان و سۆڤیەتستانێ ، دروژانوو ، کۆڤارا هونەری ، چاندی و ئەدەبی نۆ ١١ ستۆکهۆلم ، ١٩٨٦ ، ر ، ٦–١١ .

## فەرهەنگ

٦٢ – چەند گۆتن لسەر فەرهەنگا فلەیی کوردی ، د ریا تازە ، نۆ ٣١ ، ئەرڤان ، ١٩٣٣ نڤیسارەکە کورت لسەر Armjano – kurdskij slovara ڤ ، پەتۆیان ، ئەمینێ عەڤدال ، حاجیێ جندی و چ گەنجۆ ، ئەریڤان ، ١٩٣٣ ، ٣٣٠ر ، ٩٠٠٠ گوتن . slovar
٦٣ – Kurdsko – Russkij فەرهەنگا کوردی رووسی مۆسکڤا ١٩٦٠ ٨٩٠ر .
ب ٣٤٠٠٠ گۆتنێن خوە ئەڤ فەرهەنگ فرەهترێن فەرهەنگا کوردییە کو تا ئیرۆ هاتیە چاپکرن ئەو ئالفابەیا هاواریێ ب کار تینەو دەنگێن ع ، ح ، غ ، ب سەر زێدە دکە ژ بۆ نیشاندانا هن خاستێن ئاخافتنا کوردی . کانیێن خەباتا ق کوردۆ ئافراندنێن کوردی یێن کو ل سۆڤیەتستانو ل وەلاتێن دە درکەتنە نە . گۆتنێن بەرهەڤکری ب پرانیا مەزن ، ئێن کورمانجی نە .
٦٤ – ب هەڤکاریا زاریێ ئا یوسوپۆڤا Kurdsko Russkij Slovar (سۆرانی) مۆسکڤا ، ١٩٨٣ ، ٧٥٢ ر ، دۆرا ٢٥٠٠٠ گۆتنان ، ئەڤ فەرهەنگەکە گرینگ ئا کورمانجیا ناڤەندی یە (زاراڤێن سولێمانیە ، هەولێر ، رەواندووز ، کۆی سانجەق ، کرکوك ، ماهاباد ، شنۆ ، بانێ ، سەنەندەژ ) کوردی ب تیپێن عەرەبی یێن کو کوردێن عیراقێو ئیرانێ ب کار تینن هاتیە نڤیسینو گۆتن ل گۆرا رێزا ڤێ ئالفابەیێ هاتنە ب رێزکرن . گەلەك پسپۆرێن کوردی یێن ژ کوردستانا عیراقێ بەشداری پێکانینا ڤێ فەرهەنگی بوونە پشتی هەر گۆتنێ

ڤیساندنا ویٚ یا ب تیپیٚن لاتینی (ئالفابەیا هاواریٚ) هاتیە دانین . فەرهەنگ هالەتەکی خەباتیٚ ﻟﯽ هیٚژایەو ب سەر دەب ڤوایەکی خوەشلك هاتیە چاپو پیٚشکیش‌کرن .

**تیبی :**

– ئەڤ نڤیسارا جۆیس بلاو ، برۆفیسورا زمانیٚ کوردی ل لینگەها پاریسیٚ ، ژ بۆ کۆڤارا هیٚڤي ب زمانی فرانسزی هاتیە ڤیسینو هەڤکارێن کۆڤاریٚ ویٚ وەرگەراندنە کورمانجی .

**ژێدەر :**

– کۆڤارا هیٚڤي HEVI ، هەژمار ٥ گۆلان ١٩٨٦ ، ئەنستیتویا کوردی ل پاریسیٚ بەلاڤ دکت .

**تیبی :**

١ – مەبەست ئەنستیتویا کوردی ل پاریسیٚ‌یە .

٢ – زاناو نشتمان پەروەرەکیٚ ئەرمەن بوو .

٣ – زانایەکا دەست هەلو خیٚزانا هاگۆپ بوو .

٤ – د . کوردستان موکریانی ئەڤ کتیٚبا هان وەرگەراندیە کورمانجیا خواریٚ (سۆرانی) و یابەلاڤکری .

٥ – من ئەڤ پرتووك وەرگەراندیە سەر تیٚپین عەرەبی و هندە ببەتیٚن ویٚ د کۆڤارا رۆشنبیری نویٚ (هـ ١١٢ ، سالا ١٩٨٧) و رۆژناما عیراقیٚ دە بەلاڤ کرنە .

٦ – ی ك . س . س : یەکیتیا کۆمارێن سوشیالستێن سۆڤیەتی

٧ – کەزنەفۆن : نڤیسکاریٚ یەونانستانا کەڤنارە ، کسەنەفۆن .

کارێن زانستی ییٚن پرۆفیسۆر ڤاناتیٚ کوردۆ هندە زۆرن ، کو دڤیٚ گۆتاریٚدا هەموو نەهاتن دەست نیشان کرن ، و ئەڤەژی هندەك کارێن دن ییٚن وینە :

١ – بنچینەی ریٚزمانا زمانیٚ کوردی ، ئەڤ گۆتارە ل کۆنفرانسا کوردناسی‌یێ کە ل سالا ١٩٣٤ ، ل یەریڤانیٚ هاتیە گریٚدان یا خواندی .

٢ – کوردێن ئەرمەنستان ل ئەدەبیٚ دەرەڤەدا ، رۆژناما ریاتازە ، یەریڤان ١٩٦٠ .

٣ – پەندیٚ پیٚشینانی کوردی ، ل کتیٚبا (پەندی پیٚشینانو قسەی نەستەڤی گەلیٚن رۆهەلات) مۆسکڤا ، ١٩٦٠ .

٤ – ئەحمەدی خانی و بەرهەمی ئەدەبی ، کۆڤارا روناهی ، نۆ ٩–١٠ بەغدا ١٩٦١ .

٥ – پیٚشگرو پاشکر ل زمانی کوردیٚدا ، ل کتیبا (فیلۆلۆژیا ئیرانی) مۆسکڤا ١٩٦٣ .

٦ – جیٚ ناوی لکاو ل زمانی کوردیدا ، ل کتیبا (لیٚگەرین لسەر دیرۆکا چاندیٚن گەلیٚن رۆهەلات) لە نینگراد ١٩٦٥ ، ر ٥٦–٥٧ .

٧ – بەراوەردکردنا ریٚزمانا زمانیٚ کوردی ، ناما دوکتۆراوی یە ل سالا ١٩٦٨ دوکتۆرا علۆمیٚ (ناووك) پیٚ وەرگرتی‌یە .

٨ – ب هەڤکاریا خ ، مورادوف ، م . رۆدنکۆ ، ع . شەمو ، بی جوکرمان . گۆرانی‌و حیکایەتیٚد کوردی ، مۆسکڤا ١٩٦٩ .

٩ – د ملکی (زازاکی) یا باتوومی (فۆلکلۆر) کۆڤارا هیٚڤي نۆ ٥ گولان پاریس ١٩٨٦ . ر٨٥–٨٧ .

١٠ – گەلەك نڤیسار د رۆژناما ئەل‌حوریە (حەسەن هشیار و رەوشەن بەدرخانو نوورەددین دەرسمی ل بەیرووتیٚ دەردئیٚخستن) بەلاڤ کرنە .

## فەرهەنگۆك

ئەنستیتویا کوردی : ئامۆژگا کوردی
هیمدار : دامەزرێنەر
وندا کر : بزرکرد
هۆڤیتی : وەحشی-حەیوانی
ئۆردویێن : لەشکەرێن
تــاری : قەیصەری
ڤاکولتە : کولیژ-کولیج
سەرمیانی : سەروکاتی
بژ : مەبەست هەژمارا رۆژنامی یان کۆڤاری‌یە
کۆم : پۆل – ریٚز
وەشانا : بەلاڤوکا
دیرۆك : میٚژوو
دسیٚرتاسی : نامەی دوکتۆرا .

ڕەخنەو
لێکۆڵینەوە

# ڕەنگدانەوەی دیاردە هاودژەکان لە پەندی پێشینانی کوردی دا

کەریم مستەفا شارەزا

**سەرەتا :**

ئادەمیزاد لە سەرەتای پەیدابوونی یەوە ، هەستی بە بوونی زنجیرە دیاردەیەکی جووت جووتی هاودژکردووە ، کە بە ڕوونی خۆیان لە بواری سروشتیی و بایۆلۆژیی و سایکۆلۆژیی و کۆمەلایەتی دا نواندووەو ، ئینسانیش بە ئەقڵی خۆی و بە بیرو لێکدانەوەی وردی ، توانیویەتی لایەنە چاکەکانیان لە لایەنە خراپەکانیان جودابکاتەوەو ، هەڵوێستی خۆی بەرانبەریان دەربڕیێ و ، ڕووی باش و گەشیان پەسەندبکات و ، نەفرەت لە ڕووی ناپاک و شەڕانییان بکات .

ئاینەکان لە سەردەمێکی یەگجار زووەوە ، ئەوەیان بۆ دەربڕیوین کە یەکەم شت بەرانبەر بە ئادەمیزاد وەستابێ ، چەند دیاردەیەکی جووتی هاودژی وەکو (روناکی و تاریکی)و ، (ڕۆژو شەو)و ، (خێرو شەڕ) بووە ، لە سیفری تەکوین دا ئەوە باس کراوە کە لە سەرەتای دروست بوونی دنیاو ئاسمان دا (خودا روناکی و تاریکی لێك جودا کردوتەوەو بە روناکی گوتووە ڕۆژ بە تاریکیشی گوتووە شەو)[١] . لە شوێنێکی دیکەی هەر ئەو کتێبە ئایینی یەدا ئەوە نووسراوەو دەڵێ : (خودای پەروەردگار درەختی ژیان و درەختی زانینی خێرو شەڕی لە ناوەڕاستی بەهەشت دا دروست کردووە)[٢] . لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ کە ڕەگی ئەو جۆرە دیاردە جووتە هاودژانە ، دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای پەیدابوونی ئادەمیزاد و مامڵەت کردنی لەگەڵ دەورو بەری خۆی دا .

جگە لەو نموونانەی کە (سیفری تەکوین) پیّی راگەیاندین ، دەبینین ئادەمیزاد بە دەیان نموونەی دیکەی لەو جۆرە دیاردە جووتە هاودژانەی تاقیکردۆتەوە . وەکو دیاردە هاودژەکانی (بوون و مردن) و (مانو نەمان)و (پێکەنینو گریان)و (تێریو برسییەتی)و (شادیو غەم)و (ساغیو نەخۆشی) و (چاکەو خراپە)و ، گەلیّ نموونەی دیکەی هەلّسەنگاندونو لەیەکتری جوداکردونەتەوەو ، بڕیاری خۆی بەرانبەر بە لایەنی باشو لایەنی خراپی دەربڕیوەو ، لەوە گەیشتووە کە لە نێوانی دیوی پۆزەیڤی (ئیجابی)و دیوی نێگێتیڤی (سەلبی) هەریەکە لەو دیاردە هاودژانەدا ناوەندێکی پڕ لە جوولّەو جۆششو زیندەگانی هەیەو ، ئادەمیزاد بەرەو ڕێگەی پێشکەوتنو ژیانێکی خۆشتر دەبەن .

**هەندیّ بیرو ڕای زانستییانە بەرانبەر بە دیاردە هاودژەکان :**

بۆ لێکدانەووی دیاردە جووتە هاودژەکانی ناو ژیانی ئادەمیزاد ، پەنا دەبەینە بەر هەندیّ سەرچاوەی زانستیو بیرو ڕای هەندیّ لە زانایانو ، یەکەم جار ڕوودەکەینە مەیدانی زانستی ئادەمیزاد «ئەنترۆپۆلۆژی»و ، پشت بە بیرو ڕای زانایێکی هاوچەرخی ئەو زانستە دەبەستین کە ناوی «(ئیدمۆند لیچ : Edmund Leach)[٣]ە ، تاکو بزانین لە بارەی ئەو دیاردە هاودژانەو ناوەندەکانیانەوە چ ڕاو بۆ چوونێکی هەیەو ، لەو بارەیەوە چی گوتووە ؟

(لیچ) دەلّیّ : «لە سەردەمێکی زۆر زووەوە ئادەمیزاد هەستی بەوە کردووە کە لە نێوانی زنجیرە دیاردەیەکی جووت جووتی هاودژی وەکو (نەمانو نەمری) و (نێرو میّ) . (حەلاّلو حەرام) و (خێرو شەڕ)دا ، جۆرە (ناوەندێك : Mediation) هەیە کە ئەم دوو جەمسەرە هاودژانە لێك جودا دەکاتەوە»[٤] . هەروەها ئەو زانایە زۆر بە وردیو بە جۆرێکی زانستییانە لەو چەشنە دیاردە جووتە هاودژانەوە دەدویّو دەلّیّ :

«دیاردە جووتە هاودژەکان نیشانەیەکی بنەڕەتین لە نیشانەکانی کرداری بیرکردنەوەی ئادەمیزادو ، لە کۆنەوە ئەوەی بۆ ساغ بۆتەوە کە لە دنیادا هەر شتێکی کە بیگری یان «زیندووە» یان «مردووە» و ، ئەگەر ویستت بێتی بزانیّ ژیان چی یە ؟ ئەوا تەنیا لە ڕیگەی بیرکردنەوە لە دژەکەی کە (مردن)ە ، تێگەیشتوەو زانیویەتی ژیان چی یە ؟ ![٥]) .

کاتێکیش کە لە ڕوانگەی تیۆری مەتریالیزمەوە سەیری ئەو دیاردە جووتە هاودژانە دەکەین ، دەبینین بەم جۆرە بۆچوونو لێکدانەوەیە باسکراونو دەگوتریّ : (مەسەلەی هاودژەکان لە سەردەمێکی زۆر کۆنەوە بیری زانایانی پێوە خەریك بووەو لە ئەنجامدا زانست سەلماندوویەتی کە لەناو هەموو شتێکی ئەم سروشتەدا ، دوو لایەن یاخود بلّێین دوو کرداری هاودژ هەنەو ، بە هەردووکیان دیاردەیەك پێکەوە دەنێنو ، لە نێوانی لایەنە هاودژەکاندا کێشەیەکی بەردەوام هەیە کە دەبێتە هۆی سەرەکی بەرەو پێشەوە چوون)[٦]و ، لە بارەی مەسەلەی کێشەو پەیوەندیی نێوانی هاودژەکانیشەوە گوتراوە : (دژایەتی پەیوەندیی نێوانی هاودژەکانەو ، ئەو هاودژانەش هەر دوو لای کێشەی دژایەتی یەکەن)[٧] .

کاتێك کە ئێمە بەراوردییەك لە نێوانی زانیارییەکانی ئەم تیۆرییەو بۆچوونەکانی زانای ئەنترۆپۆلۆژی «ئیدموند لیچ» دەکەین ، دەگەینە ئەم ئەنجامانەی خوارەوە :

(١) لەلای «لیچ» دیاردە هاودژەکان خۆیان نیشانەی بنەڕەتیی کرداری بیرکردنەوەی ئادەمیزادنو ، لە تیۆریی مەتریالیزمیشدا کێشەی نێوانیان دەبێتە هۆی بەرەوپێشەوە چوون .

(٢) لە کن هەردوو لا مەسەلەی (ناوەند : Mediation) لە ئارادایە ، لەلای لیچدا بە ناوەند (واتا : ناوەندی هاودژەکان) دەردەبڕیّو ، لە تیۆری مەتریالیزمیشدا کێشەی دژایەتی نێوانی هاودژەکان جیّی ئەو ناوەندەی تیۆرییەکەی لیچ دەگرێتەوە .

(٣) لە بارەی جیاوازیی بواری لێکۆلّینەوەی ئەو دوو تیۆرییەشەوە ، دەتوانین بەم جۆرە لێکیان جودابکەینەوە بلّێین : (تیۆری مەتریالیزم هەموو بوارەکانی سروشتو کۆمەلّی

ئادەمیزاد دەگرێتەوە ، کەچی تیۆری یەکەی «لیچ» تەنیا لە بواری میثۆلۆژی یەوە دیاردە هاودژەکان دەگرێتەخۆو ، لێیانەوە دەدوێ .

**دیاردە هاودژەکان لە بواری ئەدەبی فۆلکلۆری دا :**

هەروەك لەمەوبەر دەرمان بری ، دیاردەجووتە هاودژەکان لە هەموو بوارێکی سروشت و ژیانی کۆمەڵ دا دەردەکەون و خۆیان دەخەنە ناو دنیای میثۆلۆژی و دەبنە بەشێکی جودانەکراوە لە هۆش و لێکدانەوەی مرۆڤ بۆ لەژیان گەیشتن و بەرەو پێشەوە چوون .

ئەو دیاردە جووتە هاودژانەوەك «لیچ» بۆی چووە ، لە سەردەمێکی زووەوە ، بەرەنگاری ئادەمیزاد بوون و ، لە بواری ئەفسانەدا دەورێکی گرنگ و سەرەکییان گێراوەو ، لەنێوانی دوو جەمسەرە دژبەکەکانی دا ناوەندێکی پڕ کێشەی بێ پسانەوە هەیەو ، ژیان بەرەو پێشەوە دەبات و ، ئەوەی زانراویشە ، ئەوەیە کە ئەفسانە لقێکە لە درەختی ئەدەبی فۆلکلۆری ی نەتەوەو ، هەر تایبەتمەندییەکی سەرەکی ئەو لقە ، دەگەرێتەوە بۆ سەرپاکی درەختەکەو لەویشەوە دووبارە دابەش دەبێتەوە بەسەر هەموو لقەکانی دا ، واتا : بەسەر «داستان و چیرۆك و ئەفسانەو پەندی پێشینان و مەتەڵ و گۆرانی» دا کە بە هەموویان هەیکەلی ئەو درەختە گەورەیە پێکەوە دەنین و دیمەنێکی تەواوی پێ دەدەن .

کاتێك کە ئادەمیزاد لە بواری ئەفسانەدا — کە لقێکە لە ئەدەبی فۆلکلوری — ئەو دیاردە جووتە هاودژانەی دێتە پێش و بیر لە لایەنە هاودژەکان و ناوەندو کێشەی نێوانیان دەکاتەوە ، دەبینێ بە هەمان شێوە لە پەندی پێشینان و چیرۆك و داستان و بابەتەکانی دیکەی ئەو ئەدەبەش دا دێتەپێشی و لە هەموو بوارێك دا لەو ڕاستی یە گەیشتووە کە لە نێوانی جەمسەرە دژبەیەکەکانی ئەو دیاردانە هەمان ناوەندو کێشە ، بە هەمان ناوەرۆك و لێکدانەوەوە ، خۆیان دەخەنە مێشك و بیری و ، لە هەر بوارێکی ئەفسانەو پەندی پێشینان دا سەیری دیاردەی هاودژی (بوون ومردن) بکات ، هەر هەست دەکات کە ژیانێکی پڕ هەوڵ و کۆششی بەردەوام لە نێوانی ئەم دوو جەمسەرە هاودژانەدا هەیەو ، لەنێوانی دیاردە جووتە هاودژەکانی (تێری و برسیەتی) ، (هەبوونی و نەبوونی) دا . ناوەندێکی پڕ لەکێشە هەیە ، ئەویش تەقەڵلادان و ئیش کردنە لەپێناوی دابین کردنی ژیان و گوزەران دا . دیسانەوە لە نێوانی جەمسەرە پۆزەتیف و جەمسەرە نێگێتیڤەکانی هەر یەك لەم دیاردە جووتە هاودژانەی (خێرو شەر) و (دۆستایەتی و دوژمنایەتی) دا ناوەندێکی پڕ لە کێشە هەیە بۆ پێکەوەنانی دابونەریت و یاساو دەستووری کۆمەڵایەتی ، بۆ پتەوکردنی لایەنی چاکەو خێرخوازیی لەلای مرۆڤ و خۆلادان لە خراپەو شەرخوازیی لەناو کۆمەڵگای ئادەمیزادو سەرکەوتنی بەسەر گیرو — گرفتەکانی ژیان دا . بۆیە دەڵێین : «لە ڕوانگەی هەر لق و پۆپێکی ئەدەبی فۆلکلۆری ی نەتەوەوە سەیری ئەو دیاردە هاودژانەو ناوەندو کێشەی نێوانیان بکەین ، هەمان ناوەرۆك و ئەنجامان دێتە دەست ، بە مەرجێك ئەو دیاردە جووتە هاودژانە لە خولگەی هەمان بابەتی هاودژدا بسوورێنەوە .

**ڕەنگدانەوەی دیاردە هاودژەکان لە ئەدەبی فۆلکلۆری و پەندی پێشینانی کوردی دا :**

ئەگەر ئێمە سەرنج بدەینە تێکڕای ئەدەبی فۆلکلۆری ی کوردی ، هەست دەکەین زنجیرەیەکی دوورو درێژ لە دیاردەی جووتی هاودژو ڕەمزو نموونەی جەمسەرە دژبەیەکانیان ، خۆیان کردووە بە تەوەری ناوەرۆکی بابەتەکانی و هۆش و بیرمان بۆ دژایەتی و کێشەی نێوانیان دەبەن . بۆ نموونە : ئەگەر بێتو کەمێك لە بابەتەکانی ئەفسانەو داستان و چیرۆکی فۆلکلۆری ی کوردی وردبیینەوە ، هەست دەکەین بە دەیان نموونەی هاودژی وەکو (خێرو شەر) و (چاکەو خراپە) و (دۆستایەتی و دوژمنایەتی) و (مەردی و نامەردی) ، (هەژاری و دەوڵەمەندی) و (گەدایی و پاشایی) بوون بە بن و بنچینەی بیناو هەیکەلی ئەو بابەتە فۆلکلۆری یە کوردیانەو گەلێ جار ڕەمزە چاك و خێرخوازەکانیان

خۆیان لە نموونەی فریشتەو پەریو لاوچاكو قارەمانی خێرخوازدا دەرخستووەو ، ڕەمزە خراپو شەڕانییەكانیشیان خۆیان لە نموونەی دێوو درنجو شای خونكارو پیاوی زۆرداردا نواندووەو ، لەسەر بنچینەی كێشەی نێوان ئەو لایەنە هاودژانە بنیاتنراون .

ئەگەر ئێمە ئەم لایەنە هاودژانەو كێشەی نێوانیان لەناو ئەفسانەو داستانو چیرۆكی فۆلكلۆریدا بەدیبكەین ، ئەوا بێگومان هەمان داردەی جووتی هاودژیش لەناو ڕستەی پەندی پێشیناندا بەدی دەكەین ، چونكە زۆربەی زۆری ئەو پەندانە خەستكراوەی چیرۆكو ئەفسانەو بەسەرهاتی ڕۆڵەكانی میللەتن لە مەیدانی ژیانداو ، لە قاڵبی ڕستەو دەربڕینێكی كورتو پتەوو پڕماناو مەبەستدا دارشتراونو ، بە دەیان وشەی جووتجووتی هاودژیان تێدا بەكارهاتووە بۆ خوڵقاندنی كێشەیەكی بنیاتنەر لە نێوانی جەمسەرە دژبەكانیانو پێكەوەنانی دیاردەی هاودژ لە بواری جیاجیای ژیانی مرۆڤی كوردو دەوروبەرەكەیدا .

**لە چەند بواردا ، دیاردە هاودژەكان خۆیان لە پەندی پێشینان‌دا دەنوێنن ؟**

دیاردە جووتە هاودژەكان ، لەگەڵ بواری ژیانی ئادەمیزادو دەورو بەرەكەیدا خۆیان لە پەندی پێشینان‌دا دەنوێنن ، وەكوو بواری بایۆلۆژیو سایكۆلۆژیو كۆمەلایەتیو سیاسیو ئابووریو تەندروستیو سروشتیو گەلێ بواری جیا جیای دیكەو لێرەودوا بە پێی توانستو ماوەی نووسینەكەمان ، بە نموونەوە دەیان خەینەروو :

**أ – ئەو دیاردە هاودژانەی لە بواری بایۆلۆژیدا دەردەكەون :**

كە سەرنج دەدەینە خەرمانی پەندی پێشینانی كوردی ، چاومان بە دەستەیەك لە پەندی وا دەكەوێ كە پەیوەندیان بە باری بایۆلۆژیی ئادەمیزادەوە هەیە ، هەر لە ڕۆژی لەدایكبوونییەوە بگرە تاكو دەگاتە سەردەمی منداڵیتیو گەنجیەتیو كاملیو پیریو لە دواییشدا كاتی مردنی ، لە نێوانی دیاردە جووتە هاودژەكانیدا ناوەندێكی پڕ كێشەو جموجوڵیو هەولو كوشش هەیە لەپێناوی كەڵكوەرگرتن لە لایەنی چاكو سوودبەخشی ئەو دیاردە جووتە هاودژانە لە ماوەی ژیاندا .

دیارترین ئەو دیاردە جووتە هاودژانەی لە بواری بوونو ژیانو مردنی ئادەمیزاددا بە شێوەیەكی جووت جووتی دژبەك لە پەندی پێشیناندا بەدیدەكرێن ئەم نموونانەی خوارەوەن :

**١ – بوونو مردن :**

ئەم دیاردە جووتە هاودژە ، یەكەمین دیاردەی بایۆلۆژییە بە ڕەنگاری ئادەمیزادو هەموو گیاندارێك بووبێ . بووە بە دەستوورێكی گشتیو سەرەكیی بوونو ژیان ، بوون سەرەتای ژیانەو مردنیش كۆتاییەكەیەتیو ، لە نێوانی ئەم دوو جەمسەرە هاودژەدا ، ناوەندێكی پڕ لە كێشەی گۆڕانكاریی ژیان هەیەو ، خۆی لە پلەكانی نەشو نوماو گەورەبووندا دەنوێنێو ، كاروانێكی دوورو درێژی پڕ لە خۆشیو ناخۆشی ژیان دەردەبڕێو ، هەولو كۆششی ئادەمیزاد لە پیناوی ژیانێكی خۆشتر دەردەخاتو ئەو هەموو هەولو خەباتەی مرۆڤ لە بواری ژیاندا ، گشتی لە ژێر ئەو هێڵە نهێنییەدا پەنهانە كە لە نێوانی ڕۆژی بوونو ساتی مردندا دەكێشرێو ، پێی دەگوترێ پردی ژیانو هەموو كەسێكیش دەبێ بەسەریدا ڕەتبێو لەبارەی ئەم دیاردە جووتە هاودژەوە پێشینان گوتوویانە :

(هەموو بوونێك ، مردنێكی لە دوایە)(٨) یاخود دەگوترێ :

(هەموو بوونێك چوونێكی لە دوایە)(٩) ، لێرەدا (چوون) جێگەی مردنی گرتەوە ، یاخود دەشگوترێ :

(حەفتت بیێ بە بوونێ ، یەكت نەبێ بەچوونێ)(١٠) ، ئەم پەندە ژن دەیڵێنو مەبەستی ئەوەیە ، ئەگەر ژن حەوت منداڵی بیێو بژین زۆری لەلا خۆشە ، نەك یەك منداڵی لەبەربچێ ، چونكە بە لەبەرچوونی منداڵ ئافرەت زۆر تێكدەچێو ڕەنج بە خەسارو مایەپووچ دەردەچێ .

دەبێ ئەو ڕاستییەش دەربخەین كە ئەم دوو ناوە دژبەكەی (بوونو مردن) هەر لە بواری بایۆلۆژیدا مانا نابەخشن ،

بەلکوو بۆمان هەیە ماناو مەبەستیان بگوێزینەوە بۆ بواری کۆمەلآیەتیو ئابووریو بلێین مەبەستی پەندی یەکەم و دووەم لە وشەی (بوون) هەر (لەدایك بوون)ی ئادەمیزاد نی یە ، بەلکو دەسکەوتی مالٚو سامانەو ، وشەکانی (مردن)و (چوون)یش نەمانو لەدەستچوونی ئەو مالٚو سامانەی مرۆڤە .

**٢ – ژین و مردن :**

دیاردەیەکی جووتی هاودژی بایۆلۆژییەو ، لەنێوانی جەمسەرە پۆزەتیڤو جەمسەرە نێگێتیڤەکەیدا ، ناوەندێکی پڕ لە کێشەو هەولٚو خەبات هەیەو ، مرۆڤ هەردەم هەولٚو تەقەلـلای ئەوە دەدات تاکو تەمەنێکی درێژو ژیانێکی خۆش لە دنیادا بژیو ، لە سەردەمێکی زۆر زووەوە بیری لە مەسەلەی (نەمریی) کردۆتەوە ، ئەو مەسەلەیەی کە لە سەردەمی (گەلگامیش)ی سۆمەرییەوە لە مێشکی ئادەمیزاددا جێگیربووەو ، هەولٚو کۆششێکی بێهوودەی بۆدراوە .

پێشینان لەبارەی ئەم دیاردە جووتە هاودژەوە گوتوویانە :

(مردنو ژین تاریكو تاوە)[11] واتا : مردنو ژیان وەکو تاریکیو رووناکی هەتاو وانو دێنو دەڕۆن ، مرۆڤ بەبێ ئەوەی ئاگای لە خۆیبێ لەپڕێك دەمرێ .

لە دەڤەری بادینان‌دا (مردنو ژیان) بەم جۆرە لە پەندی پێشینان‌دا بەکارهاتووەو دەگوترێ : (مرنا ب هەڤال ، چێترە ژ ژینا بێ هەڤال)[12] . لێرەدا نرخی دۆستو برادەرمان بۆ دەردەخات ، بەوەی کە پیاو لە ژیان‌دا بێ هەڤالٚ بوو ، ئەوا ژیانێکی ناخۆشو خراپی وەکو مردن بەسەردەباتو ، بەلآم مردنێکی بە کەسو کارو خزمو دۆست گەلێ لەو جۆرە ژینە ناخۆشو وشكو برینگە چاکترە .

لە کرمانجی خوارووداا ئەم پەندە بەسەر زارانەوەیەو دەگوترێ :

(مردنی میریی چاکترە لە ژینی ئەسیریی)[13] مەبەستیشی ئەوەیە مردنێکی بە ڕووەتو هەبوویی گەلێ چاکترە لە ژیانێکی بەئەسیرییو ژێردەستی بێگانە بژی .

کە دەچینەوە بۆ بادینان ، دەبینین ئەم پەندەی خوارەوە لەسەر (مردنو ژین) هەیەو دەگوترێ : (مرنا ب سەربەستی خۆشترە ژ ژینا بن دەستی)[14] ئەمەش نرخی سەربەستی ئادەمیزادو بێ ڕووەتی ژێردەستیمان بۆ دەردەبڕێ .

**٣ – مانو مردن :**

(مان) ماوەی ژیانی ئادەمیزادە لەسەر دنیاو (مردن)یش نەمانو کۆتایی هاتنی (مانو ژیانە) . لەبارەی ئەم دیاردە جووتە هاودژەشەوە پێشینان گوتوویانە : (مرنا بە لەزەت ، چێترە ژ مانا بە ڕەزالەت)[15] واتا : مردنێکی بە خۆشی و سەربەرزیی گەلێ چاکترو خۆشترە لە (مان)و (ژیان)ێکی بە زەبوونیو سەرشۆڕی .

**٤ – جوانیو پیریی :**

ئەم دیاردە جووتە هاودژە بایۆلۆژییە دەورێکی کاریگەری هەیە لە ژیانی ئادەمیزاددا ، لە نێوانی هەردوو جەمسەرە مووجەبو سالیبەکەیدا هەولٚو تەقەلـلایەکی زۆری ئادەمیزاد بەدیدەکرێو لەپێناوی پیرنەبوونو درێژە پێدانی ماوەی جوانی کە ماوەی لاوێتیو جحێلییە ، هەزار ئاخی هەلکێشاوەو گوتوویەتی : (خۆزیا مردن هەبا ، پیریی نەبا)و ، لە بارەی ئەم دیاردە جووتە هاودژەوە ئەم پەندە کوردییانەمان هەیەو دەگوترێ :

(جوانی گەرمو گوڕە ، پیریی ساردو سڕە)[16] ، مەبەستی لە وشەی جوانی ، جوانی ڕەنگو روخسار نییە ، بەلکو مەبەستی گەنجێتییەو ، هەر لەبارەی ئەم دوو وشەی (جوانیو پیری) یەوەش دەگوترێ :

(دەولەتی جوانی ، ئەوەتا شوانی ، دولەتی پیریی ئەوەتا میریی)[17] مەبەستی ئەوەیە ، پیاو تا گەنجەو توانای ئیش‌کردنی هەیە ، ئەوا دەولەمەندە بام (شوان)یش بێ ، بەلآم لە پیریی‌دا هەبوونی زۆر بەسوودە چونکە پیر توانای ئیش‌کردنی نییە . یاخود دەگوترێ : (لە جوانی هەتا پیریی ، لە پیریی کێوە) ؟[18] . پیرەمێردی شاعیری کورد لەبارەی ئەم دوو ناوەی

(جوانی‌و پیری) یەوە بە شیعر ئەم پەندەی گوتووە :

پیری‌و جوانی تێکرا زەحمەتە
یادی جوانی بۆ پیر حەسرەتە [19]

کە دەچینە ناوچەی بادینان ، گوێمان لەم پەندەی خوارەوە دەبێ ، بەڵام لەجیاتی وشەی (جوانی) وشەی (جحێلی) بەکارهاتووەو ، هەردووکیان هاوواتای یەکترن‌و دەگوترێ : (بە جحێلی نەکر ، بە پیری فایدە نەکر) [20] مەبەستیشی ئەوەیە ، هەر کەسێك کە لە سەردەمی جوانی‌و هەرەتی لاوی‌دا کارێکی پێ نەکرێ ، کاتێ کە پیربوو هەرگیز پێی ناکرێ .

**ه - بچووکی‌و گەورەیی :**

ئەم دیاردە جووتە هاودژە ، ئەگەر بۆ مەسەلەی بچووکی‌و گەورەیی تەمەن بێ ، ئەوا دیاردەیەکی جووتی هاودژی ـیۆلۆژی‌یەو ، ئەگەر بۆ مەسەلەی بچووکی‌و گەورەیی پایەی کۆمەلایەتیش بێ ، ئەوا دەبێتە دیاردەیەکی جووتی هاودژی کۆمەلایەتی . بەڵام ئەوەی ئێمە لێرەدا مەبەستمانە دیاردەی ـیۆلۆژی‌و دوو تەمەنی جیاوازی ئادەمیزادەو ، لە بارەیەوە پێشینان گوتوویانە :

(عەقڵ بە گەورەیی‌و بچووکی نی‌یە) [21] یاخود دەگوترێ : (ئاقل نە ب بچوکێتی‌و مەزنینی‌یە) [22] واتا : ئەقڵ بە بچووکی‌و گەورەیی تەمەن نی‌یە . هەندێ جارێش (ئەقڵ) دەبێ بە (زانین‌و عەقڵ‌مەندی) و دەگوترێ :

(زانین‌و عەقڵ‌مەندی ل سەر بچویکی‌و مەزنیتیێ نینە) [23]

پیرەمێردی شاعیر ئەم پەندەی بە شیعر پێشکەش کردووین‌و دەڵێ :

عەقڵ بە گەورەو بچووکی نی‌یە
کاری دیوانی بەربووکی نی‌یە [24]

هەندێ جاریش لە جیاتی تەمەنی (بچووکی) ، (منداڵی) دەگوترێ ، هەروەك لەم پەندەدا دەردەکەوێ : (بە منالی لیم باربوو ، بە گەورەیی لێم هار بوو) [25] ئەم پەندە بە سەر زاری یەکێکی هەژاردا دێ کە منداڵەکەی بە هەژاریی بەخێوبکات‌و کاتێکیش ئەو منداڵەی گەورە دەبێ‌و دەبێتە خاوەن نان‌و ژیانی خۆی ، لەجیاتی پاداشتی چاکە ئازاری بدات .

**ب - ئەو دیاردە جووتە هاودژانەی لە بواری سایکۆلۆژی‌دا دەردەکەون :**

پەندی پێشینان گەلێ دەوڵەمەندە بە نموونەی دیاردە جووتە هاودژەکانی‌کە لە بواری سایکۆلۆژی‌دا دەردەکەون‌و لە نێوانی جەمسەرە دژبەکەکانی ئەو دیاردانەدا ، ناوەندێکی پڕ لە کێشەی دەروونی هەیە ، مرۆڤ بە زۆری هەر رووی لە لایەنی چاکەو خۆشی‌یەو نەفرەت لە لایەنی خراپەو ناخۆشیی ئەو دیاردانە دەکات . پێشینان گەلێ نموونەی پتەوو بەهێزیان لەو دیاردە جووتە هاودژانە لە پەندی کوردی‌دا بۆ بەجێ هێشتووین ، وەکو ئەمانەی خوارەوە :

**١ - خۆشی‌و ناخۆشی :**

دیاردەیەکی جووتی هاودژی سایکۆلۆژی‌یە ، لە سەردەمێکی یەکجار زووەوە لەگەڵ ئادەمیزاددا ژیاوەو دەژی . لە نێوانی هەردوو جەمسەرە هاودژەکانی‌دا ئادەمیزاد هەر لە کێشەو هەوڵو کوشش‌دا بووە بۆ ئەوەی خۆی لە ناخۆشی‌و پەستی دووربخاتەوەو بەرەو خۆشی بچێ‌و ، پێشینان بەم جۆرە لەم دوو جەمسەرە دژبەیەکەوە دواون‌و گوتوویانە : (چ خۆشی دبێ نەخۆشیێ نین) [26] یاخود (لە پاش هەموو ناخۆشی‌یەك خۆشی‌یە) [27] ، ئەم دوو پەندە لە ریگەی ئایینی ئیسلامەوە بەم شێوەیە تێکەڵاو بە ئاخاوتنی کوردی بوونی‌و دەچنەوە سەر مانای ئایەتی : (إن مع العسر يسرا) [28] و ، هەر لەبارەی (خۆشی‌و ناخۆشی)یەوە دەشگوترێ : (ئیش چەند بە خۆشی دەکرێ دوو ئەوەندە بە ناخۆشی) [29] .

هەندێ جاریش جەمسەری نێگێتیڤی دیاردەکە لە جیاتی وشەی ناخۆشی دەبێتە (تەنگانە) یان (تەنگی) یاخود (تەنگاڤ) وەیاخود (تاڵی) و بەم جۆرە :

أ - تەنگانەو خۆشی : پێشینان گوتوویانە : (لەپاش تەنگانە ، خۆشی‌یە) [30] و ، پیرەمێرد بە شیعر ئەم پەندەی

پێشکەش کردووین و دەڵێ :

ئەڵێن : تەنگانە خۆشی لە دوایە
باوەڕم هەیە فەرموودەی خوایە (٣١)

پیرەمێردیش مەسەلەی بەدوایەکدا هاتنی تەنگانەو خۆشیش هەر دەباتەوە سەر ئایەتەکەی پێشوو .

ب – خۆشی و تەنگانی : لە ناوچەی بادینان دا ئەم پەندە دەگوترێ :

(هەڤالین خۆشیێ د زۆرن و ، هەڤالین تەنگاڤیان دکێمن) (٣٢)
واتا : دۆستی خۆشی زۆرن و دۆستی تەنگانان کەمن .

ج – خوەشی و تەنگیی : بە هەمان مانای پەندەکەی سەرەوە ، لە ناو کوردەکانی سۆڤیەت دا ئەم پەندە هەیەو بەم جۆرە دەگوترێ :

(هەڤالی خوەشیێ زەعفن ، بێ تەنگیێ کێمن) (٣٣) زەعف : بە (زۆر)ی دەگوترێ.

خۆشی و تاڵی : پێشینان گوتوویانە :
(هەتا تاڵی نەبینی خۆشی نابینی) (٣٤) وەیاخود دەگوترێ : (خۆشی بنۆشی ، ئەبێ تاڵیش قبوڵ بکەیت) (٣٥) .

**٢ – گریان و پێکەنین :**

دیاردەیەکی سایکۆلۆژی جووت لایەنەی هاودژە ، (پێکەنین) لە خۆشی و شادی یەوە دێ و (گریان)یش ، لە پەستی و غەمناکی و ئێش و ئازارەوە هەڵدەقوڵێ :
مرۆڤ لە نێوانی ئەم دوو جەمسەرە هاودژە هەوڵی ئەوە دەدات تووشی ئازارو غەم نەبێت تاکو نەگری و پەژارە دای نەگرێ و روو لە شادی بکات . پێشینان لە بارەی ئەم دیاردەیەوە گوتوویانە :
(پێکەنینی زۆر گریانی لەدوایە) (٣٦) ، یاخود دەگوترێ : (گریان نەبێ قەدری پێکەنین نازانی) (٣٧) واتا : ئەگەر غەم نەبێ ، نرخی شادی نازانی . لە هەندێ ناوچەی سۆران دا دەگوترێ :
(ماڵ بە گریان کۆ دەبێتەوە ، بە پێکەنین دەروات) (٣٨)
مەبەستی ئەوەیە ماڵ پەیداکردن بە ماندووبوون و ئازار چەشتن دەبێ و بە خۆش رابواردن و کەیف و پێکەنینیش بڵاوە دەبێتەوەو لە دەست دەچێ .

**٣ – چاکەو خراپە :**

دیاردەیەکی جووتی هاودژەو مرۆڤ لە نێوانی **هەردوو** جەمسەرەکانی دا ، هەوڵ و کۆششێکی زۆر دەدات تاکو **خۆی** لە خراپەی خراپەکاران دوور بخاتەوەو چاکەی **چاکەخوازان** پەسەند بکات و پەیرەوی بکات ، پێشینان لەبارەی **ئەم دوو** وشە دژەکەوە گوتوویانە : (خراپە بە هەموو کەس ، **چاکە** بەکەم کەس) (٣٩) دەکرێ و یاخود دەگوترێ : (**چاکە بکە** دێتەوە رێت ، خراپە بکە دێتەوە رێت) (٤٠) واتا : **پاداشتی** چاکە هەر چاکەیەو ، پاداشتی خراپەش هەر خراپەیە .

هەندێ جاریش لە جیاتی (چاکەو خراپە) ، (چاکی و خراپی) دەگوترێ و بەم جۆرە لە پەندا بەکاردێن و دەگوترێ :
(بێ خراپی ، چاکی نابیت) (٤١) یاخود لەجیاتی چاکی وشەی (قەنجی) بەکاردێ کە هاوواتان و دەگوترێ :
(بێ خرابی ، قەنجی نابە) (٤٢) واتای ئەم پەندەش هەمان واتای پەندەکەی پێشووەو ، لە بادینان دا دەگوترێ : (مرۆڤ ب دوو رەنگا ب ناڤ و دەنگ دبیت ، ب قەنجی و خرابی) (٤٣)
واتا : پیاو بە دوو جۆر ناودار دەبێت ، بە چاکی و بە خراپی .
هەندێ جاریش دەبێتەوە (چاکی و خرابی)و دەگوترێ :
(نە چاکی دچیت بەلاش و نە خرابی دچیت بەلاش) (٤٤) .

**٤ – خێرو شەر :**

ئەم دیاردە جووتە هاودژە ، ئاشنایەتی یەکی زۆر کۆنی لەگەڵ نەتەوەی کورددا هەیە ، دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی پێش ئیسلام و بۆ ئەو کاتەی کە ئایینی کۆنی کورد لەسەر بنچینەی دوو لایەنی ی (رووناکی و تاریکی)و (خێرو شەر) بنیات نرابوو . لە نێوانی جەمسەرە هاودژەکانی (خێر) و (شەر)دا ، ناوەندێکی پڕ لە کێشە هەبووەو هەیە ، لە پێناوی خۆلادان لە شەرو خراپەو خۆدانە پاڵ چاکەو خێرخوازی ، تاکو مرۆڤ بتوانێ ژیانێکی خۆش و ئاسوودەی دوور لە شەرو خراپەکاری بژی و ، پێشینان

ـه بارەی ئەم دیاردە جوتە هاودژەوە گوتوویانە : (کاری خێر بە تەعجیل . کاری شەڕ بە تەحلیل)[٤٥] مەبەست لەم پەندە ئەوەیە . کاری باش‌و خێر لە جێ‌بەجێ‌کردنی‌دا تا پەلەبکەی چ‌کەو لەکاری شەڕیش‌دا چاکە لێ‌ی وردبیەوە ، لە هەموو ڕووێکەوە لێکی بدەیتەوە و ئینجا دەستی بدەیتێ . یاخود **دەگوترێ : (شەڕی بەیانیان لە خێری ئێواران باشترە)[٤٦]** **مەبەستی ئەوەیە** : سەردەمی بەیانیان کاتی ئیشە دەبێ پیاو **خەریکی** کاروکاسبی بێ ، با شەڕیش بێ‌و بێ قازانجیش بێ ، **بەڵام کاتی ئێواران** کە بەرەو شەو دەچێ ئەگەر دەست لە کەمە **سوودو قازانجیکی** کارەکەشت هەڵگری ئەوە بە زەرەرو زیان **دانانرێ . هەندێ** جاریش لەبارەی ئەم دیاردە جووتە هاودژەوە **دەگوترێ : (خێرت نی‌یەو شەڕیشت بەپێ‌ی خۆی)[٤٧]** **یاخود (خێرو شەڕی** بەرانبەرن)[٤٨] کە بە یەکێك دەگوترێ **چاکەو خراپەی وەکو یەك‌بێ** ، واتا : چاکەش بکاو خراپەش **بکا . یاخود دەشگوترێ** : (خێری خۆت‌و شەڕی **خۆت)[٤٩] و ، هەندێ** کەسی شەڕانیش دەڵێن : (شەڕێك **بێ‌و خێری منی تێدابێ)[٥٠] . ئەو** کەسە دەیڵێ کە بیەوێ لە **ئەنجامی شەڕو دەعوایەکی نێو خەڵکەکە** ئەو قازانج بکات . لە **ناوچەی بادینانیش‌دا ئەم پەندە هەیەو** نەفرەت لە شەڕ دەکا : **(شەڕی خێر تێدا نینە)[٥١] .**

**٥ – درۆو ڕاستی :**

**دیاردەیەکی جووتی هاودژی** سایکۆلۆژی‌یە ، ڕاستی **جەمسەرە موجەبەکەیەتی‌و ، (درۆ)ش** جەمسەرە سالیبەکەی . **سروشتی پاکی مرۆڤ بە ڕاستی‌و ڕاستگۆیی** ئاشنایەو ، بەڵام **هەندێ نموونەی خراپی ناوکۆمەڵ** ، لەبەر هەندێ هۆی وەکو **هەست بە ناتەواوی کردن وەیا خۆدەرخستن** ، یاخود **شاردنەوەی تاوان‌و گوناهێکی** کردبێتی روو لە درۆکردن دەکات . **مرۆڤی هوشیارو تێگەیشتوو هەولێکی** زۆر دەدات لە **پیناوی نەهێشتنی دیاردەی درۆ** لەلای خۆی‌و لەناو **کۆمەڵەکەی‌داو** ، رووکردنە ڕاستی‌و **ڕاستگۆیی** .

**پێشینان** لەبارەی دیاردەی (ڕاستی‌و درۆ)وە گەلێ پەندی بەنرخیان بۆ بەجێ‌هێشتووین ، هەندێکیان تەنیا باسی (درۆ) و خراپەی (درۆو درۆزنی) دەکەن‌و ، هەندێکی دیکەشیان (ڕاستی‌و درۆ) یان گرتۆتەخۆ ، هەروەك لەم نموونانەی خوارەوەدا دەردەکەون :

(ڕاستی د ناڤ ئاگری دا نا سوژیت)[٥٢] واتا ڕاستی لە ناوئاگریش‌دا ناسووتێ ئەمەش هێزی ڕاستی دەردەبڕێ کە هەرگیز لەناوچوونی بۆ نی‌یە ، یاخود دەگوترێ : (ڕاستی وەکی ڕوژێ‌یە ، هەردێ هەلێت[٥٣]) واتا : ڕاستی وەکو ڕۆژی ڕووناك وایە هەر هەڵدێت .

لەبارەی فروفێڵی درۆزن‌و هەوڵدانی بۆ کردنی درۆ بە ڕاستی ، پێشینان گوتوویانە : (هەتا درەو دبیتە ڕاستی ، سەرێ خودانی تێ دچیت)[٥٤] واتا : درۆ کارێکی زۆر گران‌و ناخۆشەو خۆ ئەو کەسەی کە هەوڵ‌دەدات بیکاتە ڕاستی ئەوا کاریکی گەلێ گرانترەو وەختێکی زۆری‌پێ‌دەوێ‌وتا ئەو هەوڵە دەدرێ لەوانەیە سەری خاوەن درۆیەکەی تێدا بچێت .

**ج – ئەو دیاردە هاودژانەی لە بواری کۆمەلأیەتی‌و سیاسی‌دا دەردەکەون :**

پەندی پێشینانی کوردی پڕە لە نموونەی دیاردە جووتە هاودژەکان کە لە بواری کۆمەلأیەتی‌و سیاسی‌دا دەردەکەون ، بۆیەش هەردوو جۆرە دیاردەکە بەیەکەوە وەردەگرین ، چونکە زۆر جار ئەو دیاردانە لە هەردوو بوارەکەدا دەردەکەون و تێکەلأو بە یەکتری دەبن ، وەکو ئەم دیاردانەی خوارەوە :

**١ – شین‌و شایی**

(شین) لە کاتی مردنی خۆشەویستێك‌و ماتەم‌گێران‌دا دەکرێ ، (شایی)یش لەکاتی خۆشی‌و شادی دەربڕین‌و ئاهەنگ گێران‌دا دەکرێ‌و ، لە نێوانی ئەو دوو جەمسەرە دژبەکەدا ، مرۆڤ هەوڵی خۆشی‌و شادی‌و دوور کەوتنەوە لە

غەمو تاڵی دەدات‌و ، پێشینان گەلێ پەندی رەسەنیان لە بارەی ئەم دیاردە جووتە هاودژەوە گوتووە ، لەوانە : (شین‌و شایی ، دەستەوایی)[٥٥] یاخود دەگوترێ : (گشت شتێ قەرزە ، شایی‌و شیوەن فەرزە)[٥٦] یان ئەم پەندە بەم جۆرەش دەگوترێ : (داوەت قەرزن ، تازیی فەرزن)[٥٧] داوەت شایی‌یەو تازیی ، تازیەش ، پرسەیەو لەجیێ شین بەکار هاتووەو ئەمەش هەر ئەم پەندە دەگرێتەوە کە دەڵێ : (شایی قەرزە ، شین فەرزە)[٥٨] لە ناو کوردەکانی سۆڤیەت‌دا ئەم پەندە دەگوترێ : (مەرڤی دین د شایی‌و شینێ عەیانە)[٥٩] واتا : پیاوی شێت لەکاتی شایی‌و شین‌دا بەدیار دەکەوێت‌و کارو کردەوە سەیرەکانی ئاشکرا دەبن .

**٢ – شەڕو ئاشتی :**

ئەم دیاردە جووتە هاودژە لە هەردوو بواری کۆمەڵایەتی‌و سیاسی‌دا دەردەکەوێ ، کاتێك (شەڕ) ، ناخۆشی‌و شەڕو دەعوایێکی ناوخۆی کۆمەڵانی خەڵك بێ‌و (ئاشتی) یەکەیش ئاشت بوونەوەی دوو کەس یاخود دوو دەستەی کۆمەڵ بێ ، ئەوا بە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی دادەنرێ ، بەڵام ئەگەر هاتوو شەڕەکە لە نێوانی دوو دەوڵەت ، یا پتر بێ‌و ئاشتی‌یەکەش لە نێوانی ئەو دەوڵەتانەدا بێ ئەوا بە دیاردەیەکی سیاسی دادەنرێ . پێشینان ئەم دیاردە جووتە هاودژەیان بەم جۆرە لە پەندی کوردی‌دا بەکارهێناوەو گوتوویانە :

(ئاشتی دوای شەڕ خۆشە)[٦٠] یاخود دەگوترێ : (ئاشتی لە دوای دەعوا ، خۆشترە لە حەڵوا)[٦١] ، مەبەستی لە دەعوا شەڕەو ، هەر لە بواری کۆمەڵایەتی‌یەوە دەشگوترێ : (شەڕ دز دروست ئەکاو ، ئاشتی هەڵی – دەواسی)[٦٢] مەبەستیشی ئەوەیە ، لەکاتی شەڕو داواو پشێوی‌دا دز هەلی بۆ هەڵ‌دەکەوێ‌و دزیی دەکات‌و ، بەڵام کە ئاشتی لە ناو کۆمەڵ‌دا دروست‌بوو ، دنیا کەوتەوە سەر باری هێمنی ئەوا ئەو دزە دەگیرێ‌و حوکمی هەڵواسینی بەسەردا دەدرێ یاخود سزایەکی قورسی دەدرێ . دەشتوانین مەبەستی هەر ئەم پەندە لە بواری شەڕی سیاسی نێوان دەوڵەتان‌و ئاشتی سیاسی نێوانیان‌دا بەکاربینین ، چونکە کاتێ شەڕی نێوان دەوڵەتانیش دزو پیاو خراپ پەیدادەبن‌و لەسەردەمی ئاشتی‌دا لەناودەچن .

لەبارەی پەیوەندیی کۆمەڵایەتی‌ی نێوان چینەکانی کۆمەڵگای کشتوکاڵی‌یەوە ئەم پەندە گوتراوە : (شەڕ لە شیف‌و ئاشتی لە خەرمان)[٦٣] مەبەست لەوەیە لەهەر کارو کردەوەو رێکەوتنێك‌دا ، وا باشە لە سەرەتاوە یەکلا بکرێتەوە ئینجا دەستی بدرێتێ .

کورد زۆر بە قوولێ باسی ئاشتی کردووەو لە پەندا دەری بڕیوە ، (بەوە کە شەڕ بە ڕووداوێکی نەمر دانێن لە ژیانی ئادەمیزاد دا ، بەڵکو بەشتێکی ئەوتۆی دەزانن کە دێت‌و دەڕوات‌و لەناودەچێت ، بەڵام ئاشتی‌و هێمنی بە شتێکی هەمیشەو زیندووو جێگیر دائەنین لە ژیانی ئادەمیزاددا . بۆیە کورد لەکاتی شەڕدا هەمیشە ئاشتی لەبیرە)[٦٤] و دەڵێ : (شەڕکەر ئاشتیت لەبیر بێت)[٦٥] یان لەکاتی شەڕدا دەڵێن : (بەشی ئاشتی تیا بهێڵەوە)[٦٦] .

**٣ – دۆستایەتی‌و دوژمنایەتی :**

ئەم دیاردەیە لە هەردوو بواری کۆمەڵایەتی‌و سیاسی‌دا هەستی پێ‌دەکرێ ، لە نێوانی هەردوو جەمسەرە دژیەکەکەی‌دا ناوەندێکی پڕ لە کێشەو هەوڵ‌و تێکۆشان هەیە ، لەپێناوی کۆمەڵگایەکی ئاسوودەو بەختەوەری دوور لە ناکۆکی‌و دوژمنایەتی . کورد نرخی زانین‌و زانایانی باش زانیوەو حەزی کردووە ئەگەر دوژمنایەتیش بکات ، هەر لەگەڵ زانایانی بکات نەك لەگەڵ نەزانان‌داو لەم بارەیەوە گوتوویە : (دوژمنایەتی زانا ، لە دۆستایەتی‌ی نەزان خۆشترە)[٦٧] . مەبەستی ئەوەیە ، ئەگەر دوژمن زانابێ ، ئەوا لە کاتی دوژمنایەتی‌دا شتی لێوە فێردەبی‌و ئەویش شتێکی تێ‌دا دەهێڵێتەوە بۆ ڕۆژی ئاشتی ، بەڵام ئەگەر دۆستت بە نەزانی دۆستایەتیت بکات ، ئەوا چ ئامۆژگاریی‌و سوودێکی زانیاریت پێ‌ناگەیێنێ . یاخود بۆ ژمارەی

دۆست‌و دوژمن‌و مەترسی دوژمنانیەتی‌یەوە پێشینانمان گوتوویانە :
(بۆ دۆستیی هەزار کەمە ، بۆ دوژمنیی یەکێك زۆرە)[68] .

**٤ – سەربەستی‌و ژێردەستی :**

ئەم دیاردەیەش لە هەردوو بواری کۆمەڵایەتی‌و سیاسی‌دا بەکاردێ . ئەگەر لە بواری کۆمەڵایەتی‌یەوە سەیری بکەین ، ئەوا سەربەستی‌و ژێردەستی‌ی ناوخۆو چەوساندنەوە دەگرێتەوە ، ئەگەر لە بواری (سیاسی) ش‌دا سەیری بکەین ، ئەوا سەربەستی وولات‌و دەوڵەت‌و گەل‌و ، ژێردەستی خاك‌و نەتەوە دەگرێتەوە ، لە نێوانی هەردوو جەمسەری هاودژەکان‌دا مرۆڤ هەوڵ‌و خەباتێکی زۆر پێشکەش دەکات تاکو لە ژێردەستی رزگاری‌بی‌و بە سەربەستی لە خاکی وڵاتی خۆی‌دا بژی‌و ، پێشینان لە بارەی ئەو دیاردە هاودژەوە ئەم پەندانەیان بۆ بەجێ‌هێشتووین‌و گوتوویانە :
(لام خۆشە لە دۆزەخا بم بە سەربەستی ، نەك لە بەهەشتا بم بە ژێردەستی)[69] یاخود دەگوترێ : (جەهنەما ب سەربەستی خۆشترە ژ بەهەشتا ل بن دەستی)[70] وەك سەرنج دەدەین ، هەست دەکەین ئەم پەندەی دەڤەری بادینان هەر هەمان پەندەکەی پێشووەو بە کەمێك دەسکاری‌کردنەوە ، بە شێوەی کرمانجی ژووروو دارشتراوەتەوە .

هەر لە بادینان‌دا ئەم پەندەش دەگوترێ : (مرنا ب سەربەستی خۆشترە ژ ژینا بن دەستی)[71] دەشگوترێ : (نوکەکی بخۆ ب سەربەستی ، گایەکی نەخۆ ب بن دەستی)[72]
واتا : تۆ ئەگەر دەنکە نۆکێك بە سەربەستی بخۆی گەلێ باشترە لەوەی گایەکی گەورەو گران بە ژێردەستی‌و چاوشۆری بخۆیت . مەبەستیش ئەوەیە مرۆڤ لەپێناوی خۆشیی دنیا ژێردەستی قبوول‌نەکات‌و ، هەمیشە سەربەستی بوێ بام لەسەر حیسابی ناخۆشی و هەژاریی خۆیشی بێ .

**٥ – سەربەرزیی و مل‌حیزیی :**

ئەم دیاردە بە زۆری لە بواری کۆمەڵایەتی‌دا دەردەکەوێ‌و ، لە بنچینەدا دەگوترێ : (سەربەرزیی‌و سەرشۆڕیی)و ناوەرۆکی ئەمانەش هەر مەسەلەی (سەربەستی‌و ژێردەستی)ی مرۆڤ یا میللەتێك دەگرێتەوە ، لە بارەی ئەم دیاردەیەی کە لێ‌یەوە دەدوێن پێشینان گوتوویانە :
(رۆژێك بە سەربەرزیی بژی نەك سەد ساڵ بە مل‌حیزیی)[73] و لە هەندێ پەندی دیکەدا لە جیاتی (سەربەرزی)یش (مل بەرزی) بەکارهاتووەو گوتراوە :
(رۆژێك بە مل‌بەرزیی ، نەك سەد ساڵ بە مل‌حیزیی)[74] .

**٦ – خورتی‌و زەبوونی :**

ئەم دیاردەیە لە رەوشت‌و خووی کۆمەڵایەتی‌ی رۆڵەکانی میللەت‌دا دەردەکەوێ ، (خورتی) : بە مانای زۆرداری‌و بەهێزی‌و (زەبوونی)یش بە کڵۆڵی دەگوترێ‌و ، ئەم دوو جەمسەرە هاودژی یەکترن‌و ، لە نێوانی هەر دووکیان ناوەندێکی پڕ لە کێشەیەکی بەردەوام هەیەو ، مرۆڤ هەمیشە هەوڵی ئەوە دەدات کە زەبوون‌و کڵۆڵ نەبێ‌و بە سەربەرزیی لە دنیادا بژی‌و لە هەمان کاتیش‌دا مرۆڤی بە ویژدان‌و دڵپاك هەوەسی بە خورتی‌و زۆرداری نایەو ، پێشینان لە بارەی ئەم دیاردەیەوە گوتوویانە :
(هەموو خورتی‌یەك ، زەبوونی‌یەکی هەیە)[75] .

مەبەستی پەندەکە ئەوەیە ، دەبێ مرۆڤ زۆردارو خورت نەبێ‌و ئازاری هاوولاتییان نەدات چونکە ئەوە دنیایەو دەگۆڕێ‌و رۆژان رۆژیان لەدوایەو ، کاتێك دێ لێ‌ی‌دەگۆڕێ‌و تووشی زەبوونی دەبێ ، ئەوسا کردەوەی خراپی دێتەوە رێ‌ی‌و دەبێتە مایەی سەرشۆڕی‌و پەشیمانی‌و ئەم پەندەش لەگەڵ ئەو پەندەدا یەك دەگرنەوە کە دەڵێ :
(هەموو هەورازێ نشێوی‌یەکی هەیە)[76] .

**٧ – چۆڵی‌و ئاوەدانی :**

ئەم دیاردەیەش هەر لە بواری کۆمەڵایەتی‌دا دەردەکەوێ ، مرۆڤ هەردەم هەوەسی بە ئاوەدانی‌و بە کۆمەڵ‌ژیان هاتووەو پشتی لە چۆڵی کردووەو ئەمەیش سروشت‌و رەوشتی ئادەمیزادە

لە سەرەتای پەیدابوونی یەوە تاکو ئەمڕۆ ، پێشینان لەم بارەیەوە گوتوویانە :

(سەد ساڵ بە چۆڵی ، ڕۆژی بە ئاوەدانی)[77] ، واتا : ئەگەر جێگەیەك سەد ساڵ چۆڵ بێ‌و دۆست‌و خۆشەویستی خۆتی تێدا نەبێ بە هیچ حسێبە ، بەلاَم ئەگەر ڕۆژێك ئاوەدان بووەوە ئەوا هەموو ڕۆژانی چۆڵی‌یەتی پێشووی دێنێ . مەبەستیشی ئەوەیە ، ئاوەدانی و ژیان لەگەڵ کەس‌و کارو دۆستان‌دا هەزار جار لە ژیانی تەنیایی‌و بێ‌کەسی باشترە .

**د – ئەو دیاردە هاودژانەی لە بواری ئابووری‌دا دەردەکەون :**

لە پەندی پێشینان‌دا هەندێ دیاردەی جووت لایەنی هاودژ هەنە کە لە بواری ئابووری‌دا خۆیان دەنوێنن و پێشینان بەم جۆرە لەو دیاردانەوە دواون‌و لەم قاڵبانەدا دەریان بڕیون :

**١ – هەژاری‌و دەوڵەمەندی :**

ئەم دیاردەیە ، لە بواری ئابووری‌و کۆمەلاَیەتی‌دا دەردەکەوێ بەلاَم بنچینەکەی ئابووری‌یە ، (هەژار) ئەو کەسەیە کە باری دارایی کزەو دەست‌کورتەو ، (دەوڵەمەند)یش ئەو کەسەیە کە باری دارایی تێرو تەسەڵەو دەست ڕۆیشتووە . ئەو بارە تایبەتی‌یەی کە هەژار تێ‌ی‌دا دەژی پێ‌ی دەگوترێ (هەژاری)و ئەو بارەی کە دەوڵەمەندیش تێ‌ی‌دا دەژی پێ‌ی دەگوترێ «دەوڵەمەندی» ، پێشینان لە بارەی ئەم دوو جەمسەرەی دیاردەکەوە گوتوویانە : (زەنگینی هەنگینی ، فەقیری زەهیری)[78] ، مەبەست لە زەنگینی دەوڵەمەندی‌یەو ، بە (هەنگوین) دانراوەو ، فەقیریش هەژاری‌یەو بە دەردی (زەهیری) چوێنراوە کە دەردێکی ناخۆش‌و کوشندەیە .

هەندێ جار تەنیا وشەی (دەوڵەمەندی) لە پەنددا بەکاردێ‌و دەگوترێ : (دەوڵەمەندی بە دڵە ، نەك بە ماڵ ، گەورەیی بە عەقڵە نەك بە ساڵ)[79] هەندێ جاریش تەنیا وشەی (هەژاری) یان (فەقیری) لە پەندا بەکاردێت بێ ئەوەی وشەی (دەوڵەمەندی) یان لەگەڵ دابێ‌و دەگوترێ :

**(هەژاری کراسی ئاگرینە)**[80] **یاخود (فەقیری خۆشە ، قۆرتی ناخۆشە)**[81] **واتا : فەقیری خۆی ئەوەندە ناخۆش نی‌یە ، ئەوەندەی قۆرت‌و گیروگرفتەکانی ناخۆشەو مرۆڤ زەبوون دەکات .**

**٢ – هەرزانی‌و گرانی :**

دیاردەیەکی جووت لایەنی هاودژی ئابووری‌یەو ، کارێکی ڕاستەوخۆی لەسەر ژیانی ئادەمیزاددا هەیەو ، پێشینان لەبارەیەوە گوتوویانە :

(هەر کەس هەرزانی‌و گرانی لە ماڵی خۆیایەتی)[82] یاخود دەگوترێ :

(ئەرزانی‌و گرانی‌یا ل ماڵی خودانی)[83] مەبەستی هەردوو پەندەکە ئەوەیە : ئەگەر مرۆڤ بیەوێ هەرزانی لەناو ماڵی خۆی‌دا بخولقێنێ ، ئەوا کاروباری خواردن‌و پۆشاك‌و گوزەرانی خێزانەکەی ڕیکوپێك دەخات‌و بە تێرو تەسەڵی پێویستی یەکانی ماڵی خۆی دابین‌دەکات ، بەلاَم ئەگەر کاروباری ماڵی خۆی پشت‌گوێ بخات ، ئەوا دەبێتە گرانی ، بام کابرا دەوڵەمەندیش بێ .

**٣ – زەرەرو قازانج :**

دیاردەیەکی ئابووری‌یەو ، تێکەلاَو بە ژیانی کۆمەلاَیەتی خەڵکەکەوە بووە ، پێشینان لەبارەیەوە گوتوویانە : (زەرەر لە نیوەی بگەڕێتەوە بە قازانج حسێبە)[84] یاخود دەگوترێ : (زەرەر لە نیوەی بگەڕێتەوە قازانجە)[85] هەندێ جاریش تەنیا (زەرەر) لە پەندەکەدا دەردەکەوێ‌و ناوی (قازانج) نایەو دەگوترێ : (زەرەر لە نیوەی بگەڕێتەوە هەر باشە)[86] .

**هـ – ئەو دیاردە هاودژانەی لە بواری تەندروستی‌دا دەردەکەون :**

هەندێ جار لە ناو پەندی پێشینان‌دا هەست بە بوونی دیاردەی تەندروستی‌ی وەکو (پاکی‌وپیسی)و (دەردو دەرمان) دەکەین‌و دەشتوانین بە شێوەیەکی مەجازی بۆ گەلێ بواری

دیکەی وەکو کومەلایەتی و سایکۆلوژی‌و ئابووری بیان گوێزینەوەو ماناو مەبەستیان لێك‌بدەینەوەو ، ئەم دیاردانەش بەم جۆرە بەر چاوی مرۆڤ دەکەون :

**١ – پاکی وپیسی :**

بە بارەی ئەم دیاردە جووتە هاودژەوە پێشینان گوتوویانە : (کراسێ بدرێنە بە پیسی ، هەزار بە پاکی)[٨٧] واتا : ئەگەر یەکێك کراسێکی بە پیسی بدرێنیو ، ئیدی هەزار کراس بە پاکی بدرێنێ ، هەر ناوبانگی بە پیسی دەردەچێ ، بۆیە وا چاکە مرۆڤ تا پێی دەکرێ پاك‌و خاوێن بژی . لە هەندێ ناوچەی دیکەدا ئەم پەندە بەم جۆرە دەگوترێ : (کراسەکی بدرێنە بە پیسی ، سەتی بدرێنە بە پاگژی ، هەر پیسی)[٨٨] . دەبێ ئەوەش بزانین کە لە نێوانی جەمسەرە هاودژەکانی ئەو دیاردەیە ناوەندێکی پڕ لە کێشەو هەوڵدانی ئادەمیزاد هەیە لە پێناوی پاکی‌و دوور کەوتنەوە لە پیسی لە هەموو بوارێکی ژیانی‌دا .

**٢ – دەردو دەرمان :**

دەردو نەخۆشی دیاردەی تەندروستی‌نە ، بە داودەرمان چارەدەکرێن ، کەچی وشەی دەرمان وەك ناوێکی بەرجەستە دیاردە نی‌یە ، بەڵام چونکە دەبێتە هۆی چارەکردنی دەردەکەو ، بەرانبەری دەوەستێ . بۆیە بە هەردووکیان دیاردەیەکی جووتی هاودژی تەندروستی پێکەوە دەنێن . پێشینان لەبارەی (دەردو دەرمان)ەوە گوتوویانە : (هەموو دەردێك دەرمانی هەیە گەوجی نەبێ)[٨٩] دیارە لەوە گەیشتوون کە (گەوجی) یش جۆرە دەردێکی عەقڵی‌یە یاخود دەگوترێ : (چ دەردەك بێ دەرمان نابی)[٩٠]و ، بەهەمان مانا لە بادینان‌دا دەگوترێ : (چ دەرد د بێ دەرمان نین)[٩١] ، جاری وایش هەیە ئەم دیاردە جووتە هاودژە لە بواری سایکۆلۆژی‌دا دەردەکەوێ‌و دەگوترێ : (خۆشەویستی دەردو دەرمانە)[٩٢]و ، لە بواری کۆمەلایەتیش‌دا دەگوترێ : (بۆ خۆ دەردی ، بۆ خەلکی دەرمانی)[٩٣]و ، لەناو کوردەکانی سۆڤیەتیش‌دا ئەم پەندە هەیەو دەگوتری : (کاری بێ رێ ، دەردێ بێ دەرمان ددە)[٩٤] واتا : ئیش و کاری بێ بەرنامەو نەخشە تووشی دەردێکی بێ دەرمانت دەکات .

**و – ئەو دیاردە جووتە هاودژانەی لە بواری سروشتی‌دا دەردەکەون :**

لە پەندی پێشینان‌دا چاومان بە زنجیرەیەك لە دیاردەی جووت جووتی هاودژی سرۆشتی دەکەوێ کە لەناو دەربرین‌و رستەکانی‌دا سەرهەڵدەدەن ، بەڵام لەکاتی بەکارهێنان‌دا خۆیان دەخزێننە بواری کۆمەلایەتی‌و ئابووری یاخود سیاسی‌و چارەسەری گەلێ دابودەستووری ئەو بابەت‌و بوارانە دەکەن ، وەکو ئەم دیاردە جووتە هاودژانەی خوارەوە :

**١ – رووناکی‌و تاریکی :**

ئەم دیاردە جووتە هاودژە ، لەگەڵ پەیدابوونی ئادەمیزادەوە ، مروڤ مامەڵەی لەگەڵ‌دا کردووە . (رووناکی) هۆی بینین‌و لێك جوداکردنەوەی شتەکان‌بوەو (تاریکی)یش پەردەیەکی رەشی سامناك بووە بەسەر دنیای ژیانی ئادەمیزادا هەڵکشاوەو ، لە نێوانی هەر دوو جەمسەرە هاودژەکەی (رووناکی)و (تاریکی)یش‌دا کێشەی هەوڵدان‌و بیرکردنەوەی مرۆڤ بووە بۆ وەدەست هێنانی رووناکی‌و سەرچاوەکانی‌و بەکارهێنانی لە ژیانی رۆژانەی‌دا ، تاکو توانیویەتی ئاگر بدۆزێتەوەو بە گڕی رووناکی تاریکی شەوەزەنگ رۆشن‌بکاتەوەو خۆی پێ‌گەرم بکاتەوە .

پێشینان لەبارەی ئەم دیاردەیەوە گوتوویانە : (هەر تاریکی‌یەك ، روناکی‌یەکی بە دوادا دێ)[٩٥] مەبەستی ئەم پەندە لە قاڵبی چەمك‌و مانای وشەکانی دەردەچێ‌و ئەوە دەگەیەنێ ، کە هەموو تەنگانەیەك خۆشی‌یەکی لەدوایە . هەندێ جار تەنیا ناوی (رووناکی) لەناو پەندەکەدا دێ ، بەڵام بەبێ ئەوەی ناوی (تاریکی) بێ ، بیرمان بۆدەچێ‌و هەست دەکەین هەردوو جەمسەرە هاودژەکەبەرانبەر بەیەکتر وەستاون‌و

دەگوترێ : **(وەك مۆم وایە رووناكی بۆ ژێر خۆی نییە)**[٩٦] **بەو جۆرە كەسانە دەگوترێ كە خێرو بێریان بۆ كەس و كارو دۆستیان نەبێ ، بەڵكو بۆ خەڵكی بێگانەبێ .**

**هەندی جاریش تەنیا تاریكی ناوی دێ و دەگوترێ : (تاریكی شەو ، چرا نای رەوێنیتەوە)[٩٧] . لەم پەندەدا وشەی (چرا) وەك سەرچاوەیەكی (رووناكی) بەكارهاتووە ، مەبەستیشی ئەوەیە ، تەنگانەو گیروگرفتێكی گەورە بە هەوڵ و كردارێكی بچووك و كەم لەناوناچێت .**

**لە ناوچەی بادنیاندا دوو پەند بەم جۆرەی خوارەوە تۆماركراون و دەڵێن :**

**(هند شەڤا تاری بیت ، بەلێ نەشێت روناهیا شەمالكێ بەرزەكەت)[٩٨] یاخود :**

**(چەند شەڤ تاری بیت ، نەشێت روناهیا شەمالكەكێ ڤەمرینیت)[٩٩] . واتا : «شەو هەرچەندە تاریك بێت ، ناتوانێ روناكی مۆمێك بكوژێنێتەوە . كاتێ كە كەمێك لە ناوەروكی ئەم دوو پەندە ورد دەبینەوە ، هەست دەكەین لە چەمكدا زۆر خۆیان لە وتەیەكی چینی نزیك دەكەنەوە كە دەڵێ : (هەرچەند شەو تاریك و شەوەزەنگ بێ ، ناتوانێ رووناكی مۆمێك بشارێتەوە)[١٠٠] مەبەستی وتەچینییەكەو پەندە كوردییەكانیش هەر ئەوە دەگەیێنی كە راستی و چاكەو دادوەری بە هیچ هێزێك ناشاردرینەوە و لەناو ناچن .**

**٢ – شەوو رۆژ :**

ئەم دیاردە جووتە هاودژەیە بە گەلێ جۆر لە ژیانی ئادەمیزاددا رەنگی داوەتەوەو ، لەگەلێ پەندی كوردیدا بەكارهاتووە ، وەكو ئەمانەی خوارەوە :

(خەوی شەو شەرمەزاری رۆژە)[١٠١] مەبەستی ئەوەیە ، ئەگەر لە جێگایەك نائەمینی هەبوو ، مرۆڤ بە شەو بەبێ باك لێی نووست ئەوا لەوانەیە ماڵەكەی تالان بكرێت و ئەو كاتە خەوی شەو شەرمەزاری رۆژمان بەسەربێنێ . لە بارەی گیروگرفتی ژیانەوەش ئەم پەندە گوتراوە : (شەو دەرواو ، رۆژ دەروا ، قەزاو بەلا ناروا)[١٠٢] مەبەستی ئەوەیە كات و سەردەم دێن و دەرۆن ، كەچی گیروگرفتی ژیانی ئادەمیزاد ئەوەندە زۆرن كۆتاییان نایەت .

لە بارەی ئەو جۆرە كەسانەی كە خۆیان لەناو خەڵكی بە پۆشتە و هەبوو پیشاندەدەن ، كەچی لە راستیدا وانین و لە ماڵەوە ژیانێكی ناخۆش دەبەنە سەر ئەم پەندانە گوتراون : (شەو ئەنوێ بە جلی گایە ، رۆژیش ئەڵێی پاشایە)[١٠٣] ، یاخود بە پێچەوانەوە دەگوترێ : (بە رۆژ دەرێی قووچ پاشایە ، بە شەو دەنوی بە جلی گایە)[١٠٤] . پێشینان پیاوی سپڵەیان بە كوێر داناوەو چاكەی لەگەڵ بكرێ یا خراپە لەلای وەكو یەكەو گوتوویانە : (بۆ كوێر شەوو رۆژ چۆن یەكە)[١٠٥] .

لە بارەی رەوشت خراپی ئەو كەسانەی هەردەمە خۆیان بە جۆرێك دەنوێنن گوتراوە : (بە رۆژ دەكا ئەڵڵا ئەڵڵا ، بە شەو دەچێتە دزی كالی)[١٠٦] ، یاخود دەگوترێ : (بە شەو جەردە ، بە رۆژ مەردە)[١٠٧] مەبەستی ئەو جۆرە كەسانەیە كە بە شەوی تاریك كە كەس نایان بینێ دەبن بە دزو جەردەو خەڵكەكە رووت دەكەن ، بە رۆژیش چونكە لەبەر چاوانن خۆیان دەكەنە پیاوچاك و مەرد .

**٣ – زستان و هاوین :**

هەرچەندە ئەم دیاردە جووتە هاودژە لە بواری سروشتییەوە سەرهەڵدەدات ، بەلام بۆ هەڵس و كەوتی ئادەمیزاد بەكاردێ كە لەو دوو كژە دژبەیەكە دەریان دەبرێ . لە بارەی هەڵوێستی مرۆڤەوە بەرانبەر بە سەرمای زستان و گەرمای هاوین گوتراوە : (بە زستانان پینەو پەرۆ ، بە هاوینان ورد ورد برۆ)[١٠٨] واتا : بە زستانی سارد ئەگەر بەپینەو پەرۆش بێ خۆت گەرم كەیتەوە هەر باشە كە هاوینی گەرمیش داهات ئەوا بە جلی كەم و جوانەوە دەتوانی بژی .

لە دەڤەری بادیناندا دەگوترێ : (زڤستانان ئاگرو ئەز ، هاڤینان رەزو پەز)[١٠٩] واتا لە زستاناندا ئاگرو خۆ پاراستن لە

سەرما باوەو ، لە هاوینانیش‌دا کاتی رەزو باخ خزمەت‌کردنی‌و بەروبووم پێگەیشتن‌و مەڕو مالاَت بەخێوکردنە .

هەر لە بارەی ڕەوشت‌و کردەوەی هەندێ کەس لە زستان‌و هاوین‌دا گوتراوە : (هاوینان شل‌و مل ، زستانان جەوالێ لەمل)[١١٠] ، بەو جۆرە کەسانە دەگوترێ کە لە کاتی کارو کاسبی هاوینان‌دا ، بەبێ ئیش‌و کار بێن‌و بچن‌و ، کە وەختی زستانی ساردو سەختی بێ‌ئیشیش داهات بکەونە سوالێ کردن‌و شت خواستن لەم‌و لەو .

**٤ – ساردی و گەرمی :**

دیاردەیەکی جووتی هاودژە لە بواری سروشت‌و ئاووهەوای خاکی ولاَتەوە سەرهەڵدەدا ، بەلاَم لە کاتی بەکارهێنانی لە پەندی پێشینان‌دا لە قاڵبی مانای وشەکانی دەردەچێ‌و مەجازو درکە لە بواری کۆمەلاَیەتی‌و ئابووری‌و سیاسی‌دا بەکاردێ ، پێشینان گوتوویانە :

(تەنوور بە گەرمی نەیهێنێتەوە ، بە ساردی نایهێنیتەوە)[١١١] ، دەتوانین مەبەستی ئەم پەندە بەم جۆرە لێبدەینەوەو بڵێین : «ئەگەر داوای کارێك لە کاربەدەستێك کرا تاکو بۆ خەڵکەکەی جێبەجێبکات ، ئەگەر لە سەرەتاوە تاکو گەرمی لە سەر فرمانەکەی ئەو کارەی ڕانەپەڕاند ، ئەوا کە ساردبووەوەو سەردەمێکی بەسەر تێپەڕی هەر پێی ڕاناپەڕێ .

هەندێ جاریش لە جیاتی ساردی‌و گەرمی کە دوو ناوی مەعنەوی دروست کراون لە ئاوەڵناوی (سارد) و (گەرم) ، جووت ناوی مەعنەوی بنجی (سەرماو گەرما) بەکاردێن‌و لە پەندا دەگوترێ : (بە سەرما نوستوو ، بەگەرما هەستاو)[١١٢] ئەمەش بە یەکێکی تەمەڵ دەگوترێ کە لەکاتی خۆی‌دا ئیش‌و کارەکانی خۆی نەکات .

**٥ – تەڕی‌و وشکی**

دیاردەیەکی جووتی هاودژە ، لە بواری سروشتی‌دا سەرهەڵدەدا ، بەلاَم بە زۆری بۆ مەبەستی کۆمەلاَیەتی لە پەندی پێشینان‌دا بەکاردێ‌و پێشینان لە بارەیەوە گوتوویانە : (چیڤ هەکە ژ تەڕیێ نەهات چەماندن ، ژ هیشکی ناهێت)[١١٣] واتا : دار ئەگەر بە تەڕی نەچەمێنرێتەوە ، بە وشکی ناچەمێتەوە ، مەبەستی پەندەکەش ئەوەیە ، ئەگەر مرۆڤ بە منداڵی باش پەروەردەنەکرا ، کە گەورەبوو زۆر بە زەحمەت پەروەردە بکرێ‌و فێری خوو ڕەوشتی باش بکرێ . یاخود دەگوترێ : (لە تەڕیێ دەخوا ، لە هیشکی دەنوێ)[١١٤] ئەم پەندەش ئەو جۆرە کەسانە دەگرێتەوە کە گوزەرانێکی باشیان بێ‌و بە خۆشی رابوێرن .

**٦ – هەورازیێ‌و نشێوی :**

دیاردەیەکی جووتی هاودژە ، لە بواری سروشت‌و باری رووی خاکی وولاَتەوە سەر هەڵدەدات ، بەلاَم کاتێ لە پەندی پێشینان‌دا بەکاردێت ، مەبەست‌و ناوەڕۆکی دەپەڕنەوە بۆ بواری کۆمەلاَیەتی‌و سایکۆلۆژی یاخود ئابووری ، وەکو ئەم نموونانەی خوارەوە :

(هەر ئەڤرازی‌یەکی ، نشیڤیەکی ل دوی)[١١٥] واتا : هەر هەورازی‌یەك نشیوی‌یەکی لەدوایە ، دەتوانین بڵێین مەبەستی ئەوەیە : هەر بەرزبوونەوەیەك نزم‌بوونەوەیەکی لەدوایە ، یاخود ئەگەر هەورازیێ ڕێگا بە ناخۆشی دا بنێین دەتوانین بڵێین مەبەستی ئەوەیە هەر ناخۆشی‌و تەنگانەیەك خۆشی‌یەکی لەدوایە . هەروەها دەگوترێ : (هەموو هەورازێك نشێوی‌یەکی هەیە)[١١٦] یان : (ئەرڤازیێ بێ نشویڤ نین)[١١٧] واتا : هەورازیێ بێ نشێویێ نی‌یە .

**ز – هەندێ دیاردەی جووتی هاودژ کە لە بواری جیاجیادا دەردەکەون :**

جگە لەو دیاردە جووتە هاودژانەی کە باسمان‌کردن . دەبینین هەندێ دیاردەی تریش هەنەو لە بواری جیاجیادا بەدەرکەون‌و خۆیان لەناو پەندی پێشینان‌دا دەنوێنن وەکوو ئەمانەی خوارەوە :

**١ – زۆری‌و کەمی :**

دیاردەیەکی جووتی هاودژە ، لە بواری چەندی (کمي)دا خۆی دەنوێنی ، پێشینان بەم جۆرە لە پەندیان بەکارهێناوەو گوتوویانە : (زۆریی لە بن کەمی دەشاریتەوە)[١١٨] واتا : هەندێکی زۆر بە هەندێکی‌کەومەوەدەخوات ، مرۆڤیش لە کۆنەوە هەستی بە جیاوازیی نێوانی ئەم دوو جەمسەرە هاودژەی (زۆریی و کەمی) کردووەو ، هەوڵی ئەوەی داوە لە شتی چاك‌و بەکەڵك زۆری هەبێ‌و لە شتی خراپ‌و بێ‌کەڵکیش کەمی بێ یاخود هەر نەبێ . پیرەمێرد بەم جۆرە بە شیعر لەم دیاردە جووتە هاودژەوە دواوەو دەڵێ :

کەمی خۆت مەدە بە زۆریی خەڵکی
کە چاو لەدەست‌بێ دیارە بێ کەڵکی[١١٩]

**٢ – ئەستووریی‌و باریکی :**

ئەم دیاردە جووتە هاودژە پەیوەندی بە پێوانی قەربارەی شتەوە هەیە ، ئەستووریی پێوانەی گەورەیی قەبارەیەو باریکیش پیوانەی بچووکی . لەبارەی ئەم دیاردەوە پێشینان گوتوویانە : (هەموو شتێك لە باریکی ئەپچرێ ، بەڵام زۆرداری لە ئەستووری‌دا)[١٢٠] دەبینین هەمان پەند لە بادینان‌دا هەیەو بەم شێوەیە دەگوترێ : (هەموو تشت ب زراڤی د پرچیێت ، بەس زۆر داریی ب ستویریی)[١٢١] و لە هەندێ ناوچەش لە جیاتی (زۆرداری) (بەشەر) بەکارهاتووەو گوتراوە :.(هەموو شتێ لە باریکی دەپسێ ، بەشەر لە ئەستووریی)[١٢٢] مەبەستیش ئەوەیە ، ئەگەر هەمووشتێك لە باریکی‌و بێ‌هێزی‌دا بپچرێ ئەوا زۆرداریی‌و ئادەمیزاد لە گوڕرەی هێزو توندیی‌دا لە پڕ نوشوستی دێنن‌و لەناودەچن .

خوێنەری بەڕێز ، ئەمە بوو لێکۆڵینەوەیەکی خێرا لەسەر ڕەنگدانەوەی دیاردە جووتە هاودژەکانی ژیانی ئادەمیزاد لەناو پەندی پێشینانی کوردی‌دا ، هیوادارم توانیبێتم خزمەتێکی بچووکی ئەدەبی فۆلکلۆریی نەتەوەییان بکەم .

**پەراوێزو سەرچاوەکان :**

١ – التوراة ، سفر التكوين ، الاصحاح ، ١ : ٤
٢ – هەمان سەرچاوە ، ٢ : ٩
٣ – ئیدمۆندلیچ : زانایەکی ئەنترۆپۆلۆژی‌ی هاوچەرخی ئینگلیزە ، لە ساڵی ١٩١٠دا لەدایك‌بووە . لە ساڵی ١٩٣٢دا لیسانسی لە ئەدەبیات وەرگرتوە و لە جەنگی دووەمی‌جیهانی دوکتۆرای وەرگرتووە و بووە بەیەکێك لە زاناهەرە دیارەکانی ئەنترۆپۆلۆژی کۆمەلایەتی .
٤ – الجوهري ، محمد (٠٢) علم الفولكلۆر ، ط ١ ، القاهرة ، ١٩٧٥ ، ص ١٣٢
٥ – هەمان سەرچاوە ، ل : ١٣١
٥ – بۆدوستنیك‌و یاخوت – عرض موجز للمادية الدياليكيتيكية – مكتبة النهضة ، بغداد ، ص ٩١ .
٧ – هەمان سەرچاوە ، ل : ٩٢
٨ – شێخەڵلاّ ، عومەر ، پەندی‌کوردی – ب ٤ «دەسنووس»
٩ – هەمان سەرچاوە ، ي ٤ «دەنووس»
١٠ – هەمان سەرچاوە ، ب ١ ، هەولێر ١٩٧٢ ، ل : ٤٠
١١ – هەمان سەرچاوە ، ب ٤ «دەنووس»
١٢ – قەرەنی ، ئەحمەد ، کانی ، بەغدا ١٩٨٤ ، ل : ١٠٦
١٣ – خالّ ، شێخ محمدی ، پەندی پێشینان – چ٢ ، بەغدا ١٩٧١ ، ل : ٤١٨
١٤ – جعفر ، حجی ، گوتنێت مەزنان ل دەڤەرا بەهدینان – بەغدا ١٩٨٦ ، ل ٩٧ .
١٥ – هەمان سەرچاوە ، ل : ٩٨
١٦ – شێخەڵلاّ ، عومەر – پەندی کوردی – ب ٤ (دەنووس»
١٧ – خالّ – پەندی پێشینان – چ٢ ، ل : ٢٤١
١٨ – شێخەڵلاّ – پەندی کوردی – ب ١ ، هەولێر ١٩٧٢ ، ل : ٧٣
١٩ – فەلـلاح ، کاکەی – لەپەندەکانی پیرەمێرد – ب ٢ ، بەغدا ١٩٦٩ ، ل : ٨٣
٢٠ – قەرەنی – کانی – ل : ٢٥
٢١ – خالّ – لەپەندی پێشینان – چ ٢ ، ل : ٣٠٥
٢٢ – جعفر ، حجی – گوتنێت مەزنان – ل : ١٢
٢٣ – قەرەنی – کانی – ل : ٦٢
٢٤ – فەلـلاح ، کاکەی – لەپەندەکانی پیرەمێرد – ب ١ ، ل : ٢٥
٢٥ – خالّ – پەندی پێشینان – ل : ١٢٣
٢٦ – جعفر – گوتنێت مەزنان – ل : ٣٥
٢٧ – شارەزا ، کەریم – پەندی بەراوردکاری – بەغدا ١٩٨٣ ، ل : ٤٧
٢٨ – القرآن الكريم – سورة الانشراح – الاية (٦)
٢٩ – شێخەڵلاّ – پەندی‌کوردی – ب ٢ ، بەغدا ١٩٨٠ ، ل : ١٢٣
٣٠ – خالّ – پەندی پێشینان – ل : ٣٨٥
٣١ – فەلـلاح ، کاکەی – لەپەندەکانی پیرەمێرد – ب ٤ ، ل : ١٣٨
٣٢ – قەرەنی – کانی – ل : ١٢٠
٣٣ – کوردۆییف (پرۆفیسۆر) – کۆمەڵە تێکستی فۆلکلوری کوردی – بەغدا ١٩٧٦ ، ل : ٢٥٣
٣٤ – رەسوول ، شوکریة (٠٢) پەندی پێشینان وقسەی نەستەق کوردی – بەغدا ١٩٨٤ ، ل : ٨١
٣٥ – خالّ – پەندی پێشینان – ل : ١٩٦
٣٦ – هەمان سەرچاوە – ل : ١٤٢
٣٧ – شێخەڵلاّ – پەندی کوردی – ب ٤ «دەنووس»

٣٨ – هەمان سەرچاوە ، ب ٢ ، ل : ١٦١
٣٩ – هەمان سەرچاوە ، ب ١ ، ل : ٤٢
٤٠ – رەسوول – شوکریة (٠٢) پەندی پێشینان‌و قسەی نەستەق کوردی – ل : ١٢٤
٤١ – قەرەنی – کانی – ل : ٢٥
٤٢ – کوردۆییف (پرۆفیسۆر) ، کۆمەڵە تێکستی فۆلکلۆری کوردی – ل : ٢٢٧
٤٣ – جعفر ، گوتنێت مەزنان ، ل : ١٠٠٠
٤٤ – هەمان سەرچاوە ، ل : ١٠٧
٤٥ – خاڵ – پەندی پێشینان – ل : ٣٢١
٤٦ – خاڵ ، ل : ٢٩٧
٤٧ – شێخەڵلا پەندی کوردی – ب ٢ ، ل : ١٤٠
٤٨ – شارەزووری ، عەلی مەعرووف ، پەندی پێشینانی کورد ، بەغدا ١٩٨٠ ، ل : ٤٩
٤٩ – شارەزووری ، ل : ٤٩
٥٠ – خال ، پەندی پێشینان ، ل : ٢٩٧
٥١ – جعفر ، گوتنێت مەزنان ، ل : ٧٤٣
٥٢ – جعفر ، ل : ٥٨
٥٣ – جعفر ، ل : ٥٧
٥٤ – ئالیخانی ، پێزان ، دوو مراری ژ گەنجینا فولکلوری کوردی ، ١٩٨٥ ، ل : ٠١
٥٥ – خاڵ ، پەندی پێشینان ، ل : ٣٠٢
٥٦ – خاڵ ، ل : ٣٦٥
٥٧ – شارەزووری ، ل : ٨٧
٥٨ – لە دەماو دەمەوە وەرگیراوە
٥٩ – کوردۆییف – کۆمەڵەتێکستی فۆلکلۆری کوردی – ل : ٢٤٧
٦٠ – رەسووڵ ، عیزەدین مستەفا (د٢٠) لێکۆڵینەوەی ئەدەبی فولکلوری کوردی – چ ٢ ، ل : ١٤٠ .
٦١ – خاڵ ، ل : ١٦
٦٢ – خاڵ ، ل : ٢٧٠
٦٣ – سەجادی ، عەلائەدین ، مێژووی ئەدەبی کوردی – بەغدا ١٩٥٢ ، چ١ ، ل ١١١ .
٦٤ – رەسوول ، عیزەدین مستەفا (٠٢) لیکۆڵینەوە ، ل : ١٤٠
٦٥ – هەمان سەرچاوە ، ل : ١٤٠
٦٦ – هەمان سەرچاوە ، ل : ١٤٠
٦٧ – خاڵ ، پەندی پێشینان – ل : ٢٢١
٦٨ – خاڵ ، ل : ٨٩
٦٩ – خاڵ ، ل : ٣٨١
٧٠ – جعفر ، گوتنێت مەزنان – ل : ٣٣
٧١ – جعفر ، ل : ٩٧
٧٢ – قەرەنی ، کانی ، ل : ١١٧
٧٣ – رەسوول ، شوکریة (٠٢) پەندی پێشینان .. ل : ١١٠
٧٤ – خاڵ ، ل : ٢٥٠
٧٥ – شێخەڵلا ، پەندی‌کوردی ، ب ٢ ، ل : ١٧٢
٧٦ – خاڵ ، ل : ٢٥٧
٧٧ – خاڵ ، ل : ٢٥٧
٧٨ – شێخەڵلا ، ب ٢ ، ل : ٤٥
٧٩ – خاڵ ، ل : ٢٤٢
٨٠ – خاڵ ، ل : ٤٩٢
٨١ – خاڵ ، ل : ٣٠٨
٨٢ – خاڵ ، ل : ٤٨٨
٨٣ – قەرەنی ، کانی ، ل : ١٤
٨٤ – شێخەڵلا ، ب ١ ، ل : ٥٢
٨٥ – شارەزووری ، ل : ٥٧
٨٦ – خاڵ ، ل : ٢٦٢
٨٧ – خاڵ ، ل : ٣٦٢
٨٨ – شێخەڵلا ، ب : ٤ (دەستنووس)
٨٩ – خاڵ ، ل : ٤٩٣
٩٠ – شێخەڵلا ، ب ٤ (دەستنووس)
٩١ – جعفر ، گوتنێت مەزنان ، ل : ٣٥
٩٢ – شێخەڵلا ، ب ٤ ، (دەستنووس)
٩٣ – جعفر ، گوتنێت مەزنان – ل : ٤٥
٩٤ – کوردۆییف ، ل : ٢٤١
٩٥ – شێخەڵلا پەندی کوردی – ب٤ (دەستنووس)
٩٦ – خاڵ ، ل : ٤٧٠
٩٧ – خاڵ ، ل ١٤٧
٩٨ – ئالیخانی ، پێزانی ، دوو مراری ، ل : ١٠٥
٩٩ – جعفر ، گوتنێت مەزنان ، ل : ٣٨
١٠٠ – گۆڤاری هیوا ، ژمارە (٢) ساڵی (١) بەغدا ١٩٥٧ ، ل : ٥٨
١٠١ – خاڵ ، ل : ٢٠٩
١٠٢ – خاڵ ، ل : ٣٠٠
١٠٣ – خاڵ ، ل : ٣٠٠
١٠٤ – شێخەڵلا ، ب ٢ ، ل : ١٢٦
١٠٥ – خاڵ ، ل : ٩٠
١٠٦ – شێخەڵلا ، ب ٢ ، ل : ١٢٦
١٠٧ – خاڵ ، ل : ١٧٧
١٠٨ – خاڵ ، ل : ١١٥
١٠٩ – قەرەنی ، کانی ، ل : ٦٣
١١٠ – شێخەڵلا ، ب ١ ، ل : ٨٨
١١١ – خاڵ ، ل : ١٦١
١١٢ – خاڵ ، ل : ١١٦
١١٣ – جعفر ، گوتنێت مەزنان ، ل : ٣٩
١١٤ – شێخەڵلا ، ب ١ ، ل : ٧٣
١١٥ – قەرەنی ، کانی ، ل : ٢١
١١٦ – خاڵ ، ل : ٤٩٦
١١٧ – دێرشەوی ، مەلا مەحموود ، مشتاخا چیا ژگوتنێن پێشیا – بەغدا ١٩٨٠ ، ل : ٢٣
١١٨ – شێخەڵلا ، ب ٣ ، بەغدا ١٩٨٥ ، ل : ٥٠
١١٩ – فەللاح ، کاکەی ، لە پەندەکانی پیرەمێرد – ب ٣ ، ل : ٦٨
١٢٠ – هیوا (گۆڤار) ژمارە (٣) ساڵی (١) بەغدا ١٩٥٧ ، ل : ٢٠
١٢١ – قەرەنی ، کانی ، ل : ١٢٦
١٢٢ – شێخەڵلا ، پەندی کوردی – ب ٢ ، ل : ١٧٥

محمدی مەلا کرم

# هەڵسەنگاندنی بۆچوونەکانی کاکەی فەللاح لە دستنیشان کردنی هەڵە لە «دیوانی گۆران» دا

پاش پیاچوونەوەی بەشی یەکەمی وتارەکەی کاکەی فەللاح کە بە ناوونیشانی «دیوانی گۆران‌و چەند سەرنجێکی درەنگ‌وەختە» لە ژمارە (١٢٣)ی ئەیلوولی ساڵی ڕابوردووی گۆڤاری (بەیان)دا بڵاوی کردبوەوە ، دێمەسەر لێکۆڵینەوەی ئەو بەشەی ، بە بۆچوونی خۆی ، وشە بەهەڵەدانراوەکانی ناو دیوانی ناوبراوی تیا دەستنیشان کردووەو ، لام‌وایە زۆر بەجێ‌یە ئەم وتارەم بەو چەند وشەیە دەست‌پێ‌بکەم کە لە وەڵامی برای بەڕێز هۆگری کوڕی مامۆستا گۆراندا نووسیبوومن ، کە ئەویش لە ژمارە (٨٢)ی ئابی ١٩٨٢ی دیسانەوە گۆڤاری (بەیان)دا وتارێکی بە ناوونیشانی «هەڵەی چاپ لە بەرگی یەکەمی دیوانی گۆراندا» بڵاوکردبوەوەو ، منیش لە ژمارە (٨٧) و (٨٨)ی حوزەیران‌و تەمووزی هەمان گۆڤاردا بە ناوونیشانی «هەڵەی ڕاستەقینەو ڕاستی بەهەڵەدانراو لە دیوانی گۆراندا» وەڵام دابووەوە .

بەرلەوەی ئەو چەند وشەیەی باسم‌کردن لێرەدا بنووسمەوە ، بە پێویستی ئەزانم بڵێم بەشێکی زۆر لەو وشانەی کاکەی فەللاح بە هەڵەی داناون ، جا خوا باشی بزچووبێ یا نە ، کاك هۆگریش بە هەڵەی دانابوون . هەندێ لەوانەیش ئەوەندە بەئاشکرا دیاربوو کاك هۆگر تیایاندا کەوتبوە هەڵەوە ، بە هیچ کلۆجێ بۆ ئەوە نەشێن کەسێکی تریش دووبارە – بەتایبەتی پاش وەڵامدانەوەکەی من – تیایاندا بکەوێتە هەڵەوە ، بێ‌ئەوەی چەشی شیعرو هەستی ڕەخنەگری خۆی بخاتە گەرداوێکی ئەوتۆوە بەزەحمەت جارێکی‌تر بتوانێ بە سەلامەتی لێی ڕزگار بێ ، چونکە هی‌وایان تیایە مامۆستا گۆران خۆی کە خاوەنی شیعرەکانە هەڵەی تیا ڕاست‌کردوونەتەوەو وای لێ‌کردوون کە من لە دیوانەکەدا نووسیومەتەوە . جا ئیستا کە کاکەی فەللاح دیسانەوە بەشێ لەو بەهەلەزانراوانەی کاك هۆگر بە هەڵە دائەنێتەوە ، ئەبێ ئاگای لەو وتارەی من نەبێ‌کە لە وەڵامی کاك هۆگردا نووسیبووم . ئەمەیش بە هیچ کلۆجێ شایانی کەسێ نی‌یە ئەرکی ڕاستکردنەوەی دیوانی گۆرانی گرتبێتە ئەستۆو لەسەری بنووسێ ، چونکە کەسی‌وا پێویستە ئاگای لە هەموو ئەو شتانە بێ لەبارەی بابەتەکەوە نووسراون . خۆ ئەگەر بۆچوونەکانی منی بەدڵ نەبووبێ ، ئەوە سەیرترە ، چونکە وەك وتم هی‌وایان تیایە من دەق لە نووسینی مامۆستا گۆران خۆیم وەرگرتووە .

ئیستا دێمە سەر ئەو چەند وشەیەی لە وتارەکەی وەڵامی کاك هۆگردا نووسیبوومن . لە سەرەتای ئەو وتارەما نووسیومە :

«سەرچاوەی بەردەستی من بۆ ئامادەکردنی (دیوانی گۆران) بریتی‌بووە لە دوو دیوانی (بەهەشت‌و یادگار)و (فرمێسك‌و هونەر)و ، (پەیامی کورد)ی چاپی سەردەمی مامۆستا گۆران خۆی‌و ، بەشێکی زۆری چەکامەکانی‌تری کە تا تەمووزی ١٩٥٨ لەچاپ‌نەدرابوون‌و لە بەر دەستنووسی خۆی نووسیومنەتەوەو تێکستە ئەسلی‌یەکەیانم لەگەڵ نوسخەیەکیاندا بە خەتی خۆم دایەوە بە خۆی‌و ، نازانم ئیستا لای کاك هۆگرو

براکانی ماوە یا نەو ، دەسنووسی زوربەی شیعرەکانی تری کە نەپاش تەمووزی ١٩٥٨ەوە تا کۆچی دوایی کردنی دایناون‌و خۆی خستوونیەتە بەردەستم‌و ، هەندێ چەکامەی تری کە لە چەند گۆڤارو رۆژنامەیەکدا بڵاوکراونەتەوە ، جا یا پێشان دەستنووسی هەندێکیانم لابووە یا نەو ، چەند پارچەیەکیش سروودو شیعری منالآن کە لەم‌لاو لەولا دەستم‌کەوتوون‌و ، لەبەرئەوە رێی تێ‌ئەچێ هەندێ هەڵەیان تێکەوتبێ .

«بۆ دیاری‌کردنی تێکستی راست ، دیارە ئەگەر لە بەر دەستنووسی مامۆستا گۆران خۆی نووسرابێتەوە ، ئەوە جێگەی قسە بۆ کەس نامێنێ‌و مەسەلەکە تەنها ئەکەوێتە سەر جۆری خوێندنەوە لەو وشانەدا کە لەوانەیێ بە زیاتر لە جۆرێ بخوێنرێنەوەو ، لەم‌جۆرە شوێنانەدا من بەپێی لێ‌تێگەیشتنی مەعنا بریارم داوە چۆن ئەخوێنرێنەوە . خۆ ئەگەر دەستنووسی مامۆستا گۆران خۆیم لە بەردەستدا نەبووبێ‌و شیعرەکەم لە دیوانە لەچاپدراوەکان یا لە گۆڤارو رۆژنامەکان وەرگرتبێ یا لەرووی دەستنووسی کەسانی‌تر نووسیبێتمەوە ، ئەوە دیارە رێ‌تێ‌چوونی روودانی هەڵە هەیە ، نەخوازەلاّ هەڵەی چاپ . .» .

ئەنجا نۆرە دێتە سەر هەڵسەنگاندنی ئەو هەلآنەی کە (کاکەی فەللاح) دەسنیشانی کردوون‌و روونکردنەوەی ئەوە ئاخۆ راستە هەڵەن یا نەو ، ئەڵێم :

سەرتۆپی هەڵە دەستنیشانکراوەکانی کاکەی فەللاح ئەوەیە لەبارەی بەیتی :

**پێی ناز ئەنێ بەسەر ئەرزا :**
**جوانێ لە بەژنێکی بەرزا ! . . .**

(ب ٦ ، ل ١٢)وە ، ئەڵێ : «پێم‌وایە (جوانێ) نی‌یەو (جوانی)یە ، چونکە شاعیر (جوانی) لە بەژنێکی بەرزا ویستووە ، ئەگینا مەرجە هەموو جوانێك بەژن‌و بالآ بەرز بێت‌و تەنانەت هەموو ئافرەتێکی کورتەبالآش تاسەی بالآی بەرز دەکات با جوانیش بێت» .

بەرلەوەی بێمە سەر وەلآم‌دانەوەی ئەم بۆچوونەی کاکە ، داوا لە هەموو ئەو برایانە ئەکەم کە ئەم وتارە ئەخوێننەوە ، ئەگەر دیوانی گۆرانیان لایە بیهێننە بەردەسیان‌و ، کە گەیشتنە باسی هەر بەیتێ دیوانەکە لەئاستی ئەو بەیتەدا بکەنەوەو چاوێك بەو بەیتەو بە تێکرای پارچە شیعرەکەدا بگێرن ، چونکە ئەوە یارمەتی‌یەکی باشیان ئەدا بتوانن بە شێوەیەکی بێ‌لایەن لەنێوان من‌و کاکەدا بێن بە دەمراست‌و ، ئەوانیش ، بەوە ، دەوری خۆیان لە راستکردنەوەی هەڵەی ناو دیوانی گۆراندا ببینن .

ئەنجا دێمە سەر بۆچوونەکەی کاکەو ئەڵێم : وانی‌یە کە ئەو بۆی‌چووە ، چونکە یەکەم گۆران لە تێکرای پارچە شیعرەکەیا ویستوویە کۆمەڵە نموونەیەکی رەوتی جوانێ پیشان‌بداو ، پارچە شیعرەکەیشی هەر بۆیە ناوناوە (رەوتێکی جوان)و ، بۆ نموونەی ئەم رەوتە جوانە مەبەستە رەوتی‌قازو مراوێی بەسەر چیمەنی گوێ ئاوی بەرخۆراو ، کشانی کەوی سەربەفری لاێزار بۆسەر لووتکەو ، قونەقونی بەر مانگەشەوی کەروێشك‌و ، کۆمەڵێ نموونەی جوانی‌تری هێناوەتەوەو ، سەرەنجام دوایی شیعرەکەی بەوە هێناوە کە پێی ناز نانە سەر زەوێی ئافرەتی جوانی بەژن‌و بالآ بەرز لە هەموو ئەو نموونانەی باسی‌کردوون‌و ، لەگەڵێ نموونەی جوانی‌تری وەك شنەی بای شەوو ، لەرەی پرشنگ‌و ، ئاوازەی مۆسیقاو ، شیعری تازە لەدایك‌بووی نە بە شێوەو نە بە بابەت نەسواو ، جوانترو خۆشترو بە گوێی دڵ ئاشناترە .

دووەمیش چونکە (جوانێ) لە بەژن‌و بالآی بەرزی ئافرەتی جوانا خۆی بنوێنێ ، یا لە هەر جۆرە بەژن‌و بالآیەکی‌ترا ، شتێکی مەعنەوی‌یەو توانای ئەوەی نی‌یە پێی ناز بەسەر عەرزا بنێ .

لەبارەی بەیتی :

**ئەی چاو ! چەشنی بازی قەفەس هەڵوەری پەرت**
**کوا باڵە تیژەکانی نیگای حوسنی دلبەرت ؟**

(ب ١ ، ل ١٣)یشەوە ، ئەڵێ : «وشەی (هەڵوەری) نی‌یەو

(هەڵوەریێ)یە . شاعیر لێرەدا وەك خواستو وەك دوعا لەگەڵ چاوی جوولاوەتەوە ، چونکە وەك جاران (نیگای حوسنی دلبەری) نەماوە» .

منیش ئەڵێم : بە هەردووجۆر ئەگونجیێو مەعنای تەواو ئەدا بەدەستەوە .

لەبارەی بەیتی :

**پایزە ، گەڵای دار رژاوە ، باغ رووتە**
**گوڵ کوانیێ ؟ گوڵ لێوی بە بزە پشکووتە**

(ب ٦ ، ل ١٦)یشەوە ، ئەڵێ : «وشەی (پشکووتە) ، (نەپشکووتە)یە ، چونکە ئەگەر وانەبێ ماناو مەبەستی شاعیر پێچەوانە ئەکەوێتەوە» . ئەنجا پاش نووسینەوەی بەیتەکە ، بەگوێرەی بۆچوونەکەی خۆی ، نووسیویە ئەڵێ : «واتە : گوڵ کوا هەیە ، چونکە پایزان گوڵ لێوی بە بزە نەپشکووتووەو هەر نی‌یە» .

منیش ئەڵێم : بەر لە هەرچی سادەترین بەڵگەی ناراستیی بۆچوونەکەی کاکەی فەللاح ئەوەیە هەر لەو نیوە بەیتەدا کە وشەی (پشکووتە)ی تیایە ، وشەی (بزە)یش هەیە کە لە (بەهەشتو یادگار)ەکەی چاپی سەردەمی مامۆستا گۆران خۆیدا بە (برە) لەچاپدراوەو ، مامۆستا خۆی لە داوێنی (فرمێسكو هونەر)ەکەیەو ڕاستی کردووەتەوەو سەردێری ئەو هەڵە ڕاستکردنەوانەیشی بەمجۆرە نووسیوە : «لیستەی ڕاستکردنەوەی ئەو چەند هەڵەیە کە لە چاپی بەرگی (بەهەشتو یادگار)دا ڕوویدا» . دیارە ئەگەر (پشکووتە)یش ، وەك کاکەی فەللاح ئەڵێ ، (نەپشکووتە) بووایە ، بەپەلەتری ڕاستئەکردەوە ، چونکە زۆر زەحمەتە کەسێ هەڵکەوێ بە هەڵەیی (برە) نەزانێ ، کەچی هەڵەیی (پشکووتە) – ئەگەر ڕاست بێ هەڵە بێ – ئەمە حەوت ساڵە تەنها هۆگرو کاکەی فەللاح پیێیان زانیوە !

ئەنجا دێمە سەر لێکدانەوەی هەڵەیی بۆچوونەکەی کاکە لەبارەی هونەریو مەعناوەو ئەڵێم : کاکە بەم بۆچوونەی

هەموو ئەو بینا هونەری‌یەی دارماندووە کە مامۆستا گۆران لەم بەیتەدا بینای‌ناوە . بناغەی کارەکەی مامۆستا گۆران لەسەر شوبهاندنی لێوی بەبزەی دڵداری پشکووتووی یار بە گوڵ – دامەزراوە . گۆران لەم بەیتەدا ئەڵێ : وەرزەکەی وەرزی پایزە ، گەڵا بەدارەوە نەماوەو هەمووی وەریوەتە بن درەختەکان . باخ ڕووتوقووت بووەتەوەو هیچی پێوە نی‌یە داپۆشیێ ، نە گەڵاو نە گوڵ . . ئیتر ئەبێ لە وەرزیوادا ، ئازیزەکەم ، گوڵ لەکوێ دەسگیر بیێ بۆتی بهێنم ؟ نی‌یە . تەنها تاقە گوڵێ هەیە کە گوڵی لێوی ئاڵی خۆتە کە بە بزەی دڵداری پشکووتووەو لە خونچەیی‌یەوە بووە بە گوڵو کراوەتەوە . ئەو گوڵەیش بەخۆتەوەیەو لای خۆتەو گوڵێ نی‌یە لە شوێنێکی‌تر بێ بچم بۆتی بهێنم .

کەچی کاکەی فەللاح بە کردنی (پشکووتە) بە (نەپشکووتە) ، مەعنای بەیتەکەی والێکردووە قسەیەکی زۆر ئاسانو سادەو ناهونەرمەندانە بێ کە ئەوەتە پایزان گوڵ دەس‌ناکەویێ ، بەڵکو بە بەکارهێنانی وشەی (نەپشکووتە) مامۆستا گۆرانی خستووەتە ناکۆکی‌یەکی سەیرەوە کە ئەوەتە بلێ پایزان خونچە هەیە بەڵام ناپشکویێ ، لەکاتێکا کە هەموومان ئەزانین مادەم خونچە هەبێ ئەبێ بپشکویێو کەس نەیدیوە درەخت پایز خونچە بکاو بەهار خونچەکەی بپشکویێ ! کاکەی فەللاح بەم بۆچوونەی ، ئەو هەمووە سامانە هونەری‌یەی مامۆستا گۆران بەو تەشبیەو ئیستیعارانەی لەو بەیتەیدا کردوونی ، بەجاریێ بەخۆڕایی دانی بە ئاوا .

ئەمەیش هەموو سەرەڕای ئەوە کە وشەی (نەپشکووتە) هەرگیز ئەو مەعنایە نادا بەدەستەوە کە کاکە مەبەستیەتی کە (نەپشکووتووە)یە . ئەگەر گۆران ئەمەی مەبەست بووایە ئەیوت (ناپشکویێ)و بەجۆریێ بەیتەکەی ڕێك‌ئەخست . زیاد لەمەیش ئەگەر مەسەلەکەمان ، وەك کاکە ، لە خونچەی لێوی بە بزە پشکووتووی بە گوڵ بووی یار دوورخستەوە ، هیچ بیانوویەك بەدەستەوە نامێنیێ بۆ هێنانەئارای وشەی (بزە)و (لێو)و ئەو

هەموو کارە هونەری‌یانەو ، گۆران ئەیتوانی سووكو ئاسان بڵێ : گوڵ بە پایزا دەسگیر نابێ !

بۆ ئەوانەیش لەدووی سەنگو ترازووی شیعر ئەگەڕێن ، کە بێ‌گومان ئەبێ شاعیران خۆیان لە ڕیزی پیشەوەی ئەم جۆرەکەسانەوە بن ، ئەڵێم : (نەپشکووتە) بڕگەیەك لە نیوە بەیتەکەی زیاد ئەکا کە بەیتەکە خۆی (١٢) بڕگەیی‌یەو (نە) کە ئەیکا بە (١٣) بڕگەیی ، مەگەر (نە) کە بخەینە سەر (بزە)کەو (بزە)کەیش لەگەڵ (بە)کەی پێشی لێك بئاڵێنین‌و بە هەرسێکیان (بەبزەنە)یەکیان لێ دروست بکەین تا بتوانین بڕگە بڕگەیان بکەین بە سێ بڕگە : (بەب – زە – نە).کە

**ـ نازانم ئەمجا دێت بۆ شایی‌و هەڵپەڕکێ ؟**

**ـ نایەم ، گوڵ ماوەتی بۆ سەرم سوور چەپکێ**

(ب ٦ ، ل ١٧) یشەوە ، ئەڵێ : «(نازانم ئەمجا) ، (ئەمجا نازانم)ە ، وا سوارترو ئاوازدارترە» .

منیش ئەڵێم : هەرچەند نیوە بەیتەکە بە هەردوو جۆر هەر دوانزە بڕگەیی‌یە ، بۆ پارچەبڕ کردنی ئەوە لەبارەترە کە لە دیوانەکەدا چاپ‌کراوە ، چونکە بەپێی دیوانە چاپەکە وا پارچەبڕ ئەکرێ (نازانم – ئەمجا دێت – بۆ شایی‌و – هەڵپەڕکێ) ، بەڵام بەپێی بۆچوونەکەی کاکە بەم‌جۆرە پارچەبڕ ئەکرێ : (ئەمجا نا – زانم دێت – بۆ شایی‌و – هەڵپەڕکێ) ، کەواتە ئەوەی ئەو نووسیویە کە گوایە (ئەمجا نازانم دێت . . تاد) سوارترو ئاوازدارترە ، لەجێی خۆیا نی‌یە . ئەمە هەمووی لەلایەك . لە لایەکی‌تریشەوە لە (بەهەشت‌و یادگار)ە لەچاپدراوەکەی سەردەمی مامۆستا گۆران خۆیشیا هەر (نازانم ئەمجا دێت . . .) نووسراوەو لە ڕاستکردنەوەی هەڵەی چاپیشا لە داوێنی (فرمێسك‌و هونەر)ەوە لەم‌بارەوە هیچ نەنووسراوە .

کەواتە مامۆستا گۆران خۆی (نازانم ئەمجا دێت . .)ی نووسیوە . بۆیە ئەگەر کاکەی فەللاح ڕەخنەیەکی لەم جۆرە دارشتنەی ڕستەکە بێ ئەبێ بەرەوڕووی مامۆستا گۆران خۆی بکاتەوە ، نەك من کە خاوەن شیعر نیم‌و تەنها هەر ئەوەندەیە دیوانی خاوەن شیعرم بە چاپ گەیاندووە .

لەبارەی بەیتی :

**منیش ئەگەرچی بە جیلوە ، بە جاذیبەی جوانی**

**گەلێ لە فەوق گوڵامو ، گرانترم لە گوهەر**

(ب ١ ، ل ٢٠)یشەوە ، ئەڵێ : «وشەی (جوانی) ، جوانیم)ە کە هاوقافیەی (زیندانیم)ە ، وەك تەرتیبی قافیەکانی پێش خۆیان» .

منیش ئەڵێم : ئەم پارچە شیعرە لە شەش دووبەیتی پێکهاتووە ، لە چواری یەکەمیانا نیوەی یەکەم لەگەڵ نیوەی سێهەم‌و ، نیوەی دووەم لەگەڵ نیوەی چوارەم هاوقافیەن . لە پێنجەمیانا تەنها هاوقافیەیی نیوەی دووەم لەگەڵ چوارەم ڕەچاو کراوە . لە شەشەمیانا نیوەی یەکەم لەگەڵ دووەم‌و ، نیوەی سێهەم لەگەڵ چوارەم هاوقافیەن . لەمەوە دەرئەکەوێ کە گۆران خۆی ویستوویە ئەم سێ جۆرە جیا جیایە لە پارچە شیعرەکەدا بەکاربێنێ . زیاد لەمە گۆران مەبەستیشی لە (جوانی) جوانیی خۆی نی‌یە ، قسە لە جوانی وەك سیفەتێك ئەکا با لەخۆیشیا هاتبێتەدی ، ئەگینا ئەبوو لە (جیلوە)یشا بیوتایە (بە جیلوەم) . . گۆران هەر ئەوەندەی مەبەستە بڵێ : منیش ئەگەرچی بە جیلوەو جاذیبەی جوانی لەژوور گوڵ‌و گەوهەرەوەم . . تاد . سەرەرای هەموو ئەمەی کە وتمان . ئەگەر (جوانی) هەڵە بووایە ، گۆران خۆی لە لیستەی چەوت‌و ڕاستەکانی کتێبی (فرمێسك‌و هونەر)دا ڕاستی ئەکردەوە .

کەواتە ڕاستەکەی (جوانی)یەو (جوانیم) نی‌یەو ، کاکە لەمەیشدا باشی بۆ نەچوە .

لەبارەی بەیتی :

**نە زۆر چاوڕەشی**
**نە ئێجگار گەشی**

(ب ٧ ، ل ٢٨)یشەوە ، ئەڵێ : «دڵنیام لەوەی کە (چاوڕەش)و (گەش)و ، کە چوار برگەیین‌و ئاوازیان بۆ دانراوە وەك هاوبرگەکانیان لە بەیتەکانی تردا» .

منیش ئەڵێم : نازانم کاکەی فەللاح بەچیدا ئەوەندە دڵنیایە ؟ شیعر شیعری ئەوە یا هی گۆرانە ؟ نازانم بۆ وا نووساوە بە هەڵەکانی هۆگرەوەو لێیان نابێتەوەو ، هیچ گوێ بە ڕاستکردنەوەکانی من نادا ، تەنانەت ئەگەر پشتم بە نووسینی مامۆستا گۆران خۆیشی قایم بێ ؟ !

حەزم‌ئەکرد کاکە نەختێ وردبوایەتەوەو ، وا بە دڵنیایی‌یەوە قسەی نەکردایەو ، ماڵی لە خاوەن‌ماڵ حەرام نەکردایە . دەسا با چاوێك بە لاپەرە (٨٧)ی (فرمێسك‌و هونەر)ی چاپی سەردەمی مامۆستا گۆران خۆیدا بگێڕی‌و ، لەجیاتی دڵنیایی‌یە بێ‌بەڵگەو لەخۆوەکەی خۆی ، دڵنیا بێ لەوە کە مامۆستا گۆران لە لیستەی ڕاستکردنەوەی هەڵە چاپی‌یەکانی (بەهەشت‌و یادگار)دا (ڕەش)و (گەش)ی کردووە بە (ڕەشی)و (گەشی) .

هەروا زیاد لەمە حەزئەکەم لەڕووی مەعنایشەوە بۆ کاکەو بۆ هەموو خوێندەوارانی ڕوونکەمەوە کە هەر

نە زۆر چاوڕەشی
نە ئێجگار گەشی

ڕاستە کەوا لە دیوانەکەدا نووسراوە . ئەم بەیتە لەپاش بەیتی :

نە باریکی ، نە گۆشتن
نە کچۆڵەی ، نە شاژن

هاتووە کە ڕووی دەمی تیا کراوەتە (کچە کورد)ەکە کە لە برگەی پێشووی شیعرەکانا باسی‌کراوەو ، لەبەرئەوە پێویستە ئەو (ی)ی ضەمیری خیطابە بە (چاوڕەش)و (گەش)یشەوە بنووسی‌و بی‌یانکا بە (چاوڕەشی)و (گەشی) .

هەرچی مەسەلەی (چوار برگەیی)و شتی‌وایشە ، ئەوە بە هیچ کلۆجێ نابێ بە بەڵگە ، چونکە وەنەبێ پارچە شیعرەکە هەمووی لە بەیتی چوار برگەیی پێکهاتبێ ، بەڵکو لە (٣٠) بەیتی (٧) بەشیا تەنیا (٦) نیوبەیتی (٤) برگەیی تیایە ، لە (٥) بەشیشیانا بەیتی یەکەم ٧+٧و بەیتی دووەم ٥+٥و لە (١) بەشیشیانا بەیتی سێهەم ٧+٧و بەیتی چوارەم ٥+٥و ، ئەم بەیتی .

نە زۆر چاوڕەشی
نە ئێجگار گەشی

یەی لێرەدا باسی لێ ئەکەین ، لە بەیتە دووەمەکانە ، واتەزۆر بەجێ‌یە وەك ئاوەڵەکانی لە (٤) پارچەی‌ترا (٥) برگەیی بێ .

لەبارەی بەیتی :

**لێت بێ بزەی مانگەشەوی**
**بەژنی ڕێك‌و ڕەوتی کەوی**

(ب ٢ ، ل ٢٩)یشەوە ، ئەڵێ : «(بزەی) نی‌یەو (بزە)یە ، وەك چاپەکەی سەردەمی گۆران‌و هەڵەیش نەبوە . مەبەستی شاعیر ئەوەیە : وەك مانگەشەو بزەت لێ بێ ، نەك بزەی مانگەشەوی» .

منیش ئەڵێم : خۆیشم دەمێکە ڕام‌گۆڕاوەو لام‌وایە هەر (بزە)یەو چاپەکەی سەردەمی مامۆستا گۆران هەڵە نەبوە ، بەڵام لێرەدا ئەبێ ئەوەیش بڵێم کەوا کاکەی فەللاح ، چونکە مەسڵەحەتی خۆی تیا بووە ، لەم هەڵە ڕاستکردنەوەیەدا پشتی بە چاپەکەی سەردەمی مامۆستا بەستووە . . ئەی باشە بۆ لە (چاوڕەشی)و (گەشی)یەکەدا کە کەمێك پێشتر باسمان‌کرد ، ڕاستکردنەوەکەی مامۆستای بە هیچ نەزانی ؟

لەبارەی بەیتی :

**بەردەرگەکەتان قیبلەیی ڕووی ئەهلی نیازە**
**ئێوارەیە وا ، هەڵگرە سا گۆزەیی تازە**

(ب ٢ ، ل ٣٢)یشەوە ، ئەڵێ : (دەرگەکەتان) ، (دەرکەکەتان)ە ، چونکە ناسکترو مۆسیقاوی‌ترە» .

منیش ئەڵێم : بەڵگەی‌وا ئەوەی پێ ئیسپات ناکرێ کە (بەردەرگەکەتان) هەڵەیەو (بەردەرکەکەتان) ڕاستە ، چونکە

ئەگەر بیشیسەلمێنین کە (بەردەرکەکەتان) ناسکترو مۆسیقاویتر بێ ، کە نایشیسەلمێنین ، هیچ ناچارییەك لەئارادا نییە کە مامۆستا گۆران ئەو ناسکترو مۆسیقاویترەی وتبێ . کاکەی فەللاح ئەیتوانی بڵێ : ئەبوو مامۆستا وا بڵێو وا نەڵێ ، نەك بڵێ : وای وتووەو وای نەوتووە .

ئەم پارچە شیعرەی مامۆستا گۆران لە شیعری سەردەمی هەڵەبجەیەتی . خەڵکی هەڵەبجەو دەوروبەریشی (بەردەرگا) ئەڵێن ، (بەردەرك) ناڵێن . لە (بەهەشتو یادگار)ە لەچاپدراوەکەی سەردەمی گۆران خۆیشیدا (بەردەرگەکەتان) نووسراوە ، کەواتە هەر (بەردەرگەکەتان) ڕاستە .

ئەنجا نازانم بۆ ئەبێ (بەردەرکەکەتان) لە (بەردەرگەکەتان) ناسکترو مۆسیقاویتر بێ ، کاکەی فەللاح هیچ بەڵگەیەکی دەنگناسیو مۆسیقاییی لەم مەیدانەدا پیشان نەداوە .

لەبارەی بەیتی :

**حەسرەتکەشی ئەو شانو ملوگەردنە ڕوونەم**

**وەختە بمرم بۆ نەفەسی بۆنی تواڵێت**

(ب ٢ ، ل ٣٦)یشەوە ، ئەڵێ : «وشەی (نەفەسی) ، (نەفەسیێ)یە چونکە ماناکەی چڕترو تامەزرۆیاویترە» .

منیش ئەڵێم : وانییە ، چونکە گۆران مەبەستی ئەوەیە بڵێ وەختە بمرم بۆ بەلووتاچوونو هەڵمژینی بۆنی عەتری سەرو قژی یار . بەڵام نازانم کاکە چۆن لە مەعنای وشەی (تواڵێت) حاڵیبووە وا شەرمیکردووە بینووسیو شوێنەکەی بە چوار نوختە پڕکردووەتەوە ؟

لەبارەی وشەی (تۆ بی)یەوە لەبەیتی :

**تۆ بی زەردەخەنەی چاوت**

**لێوی بەعاستەم تۆراوت**

و چوار بەیتی پاشەوەیدا (ب ٣-٧ ، ل ٤٠)یشەوە ، ئەڵێ : « هەموو (تۆ بی)یەکان (تووبی)ن ، واتە : شاعیر یار سوێند ئەدا بەو جوانییانەی کە باسیکردوون . (تۆ بی) مانای بەیتەکان ئەشێوێنێتو تێك ئەدات» .

منیش ئەڵێم : (تۆ بی)و (توو بی) هەردوو هەر یەك شتنو یەك مەعنا ئەگەیەننو ، بە هەردوکیان سوێندداناکە دێتەدیو . جیاوازییان تەنها لەوەدایە کە لە هەندێ ناوچە (تۆ بی)و لەهەندێ ناوچەیتر (توو بی) ئەڵێنو ، هیچ مەعنا شێواندنو تێکدانێ لەئارادا نییەو ، بریا کاکە بیوتایە ئەمەی لە چی وەرگرتووە ؟ لە هەڵەبجەی زێدو ژینگەی قۆناغی یەکەمی ژیانی گۆران (تۆ بی) ئەڵێنو ، پارچە شیعرەکەیش لە شیعرە کۆنەکانی گۆرانە . وادیارە کاکە بەگوێرەی دیالێکتی ناوخۆی سولەیمانی مامەڵە لەگەڵ شیعری گۆران ئەکا ، بەڵام هیچ مەرج نییە گۆران هەرچیی وتبێ دەق لەگەڵ دیالێکتی ناوخۆی سولەیمانی بگونجێ . کەواتە وشەکە (تۆ بی)یەو (توو بی) نییە ، هەرچەند دانیشتووانی ئەو ناوچانەی (توو بی) ئەڵێن ئەتوانن وای بخوێننەوە .

لەبارەی بەیتی :

**گا ماچم ئەکرد لێوی قوتوو و چاوو برۆی مەست**

**چەند ساڵێ وەها ئولفەتی تۆم بووبوو بە عادەت**

(ب ٤ ، ل ٤١)یشەوە ، ئەڵێ : «لەنگە . وشەی (قوتوو) نییەو (قوت)ە ، واتە : کوڵ» .

منیش ئەڵێم : لەبارەی لەنگییەوە هیچ لەنگییەك لەئارادا نییە ، بەڵام ڕاستە ئەبێ (قوتو) بێ واتە وشەی (قوت)و (و)ی عەتف . لە ئەدەبیاتا (دەم) بە (قوتوو) شوبهێنراوە نەك (لێو) . هەڵەکەی منیش لەوەوە هاتووە کە مامۆستا گۆران لە چاپەکەی سەردەمی خۆیدا (و)ی عەتفەکەی نووساندووە بە وشەی (قوت)ەوەو نووسیویە (قوتو) ، وەك لە زۆر شوێنیتریشدا (و)ی عەتف ئەنووسێنێ بە وشەی پێشەوەیەوە .

لەبارەی بەیتی :

**تـــــەلی عـوودو کــــــەمـــــانم بس ، کـوی شمشــــــاڵم**

**بــــــــــەسرابـو وەك گرێ دڵو زمــــــــــانی لاڵم**

(ب ٧ ، ل ٤٢)یشەوە ، لەسەر پەراوێزی بەیتەکەی ، کە نووسراوە : (پس) لە پسانەوە ، (بەمەعنا) پچڕانو خاوبوونەوە

**هاتووه» ، نوسیوه ، ئەڵێ : «وشەی (پس) ، کە لە پەراوێزی (٣) دا مانای لێکدراوەتەوە ، لە پسانەوە ، پچڕان ، خاوبوونەوەوە نەهاتووە . ئەڵێن : فلاّن زمانی پسە ، واتە (س) بە (ث) ئەڵێت‌و (ز)یش بە (ذ)» .**

منیش ئەڵێم : **ئەم پەراوێزە هی ماموٚستا گوٚران خوٚیەتی‌و لە چاپی یەکەمی (بەهەشت‌و یادگار)ەکەی سەردەمی خوٚی وەرگێراوەو ، منیش لە سەرەتای دیوانەکەدا ڕوونم کردووەتەوە ئەو پەراوێزانەی هی ماموٚستا خوٚینی ناوی کەسیان لە داوێنەوە نەنووسراوەو ، پەراوێزەکانی من بە (م.م.ك) ئیمزا کراون .** جارێکی‌کەیش برادەرێکی‌تر ، هەر لە گوٚڤاری (بەیان)دا ، **ڕەخنەی لەسەر یەکێ لەم‌جوٚرە پەراوێزانە لێ گرتبووم ، چونکە هەر ویستبووی ڕەخنە لە من بگرێ ، لەوە وردنەبووبووەوە کە پەراوێزەکە هی ماموٚستا گوٚران خوٚیەتی . بە هەرحاڵ لەگەڵ** ئەوەیش کە (پس) بەو مەعنایەیش هەیە کە کاکەی فەللاح باسی‌کردووە ، ئەوە ڕێ لەوە ناگرێ کە ئەم مەعنایەیش بدا بەدەستەوە کە ماموٚستا گوٚران مەبەستیەتی‌و ، هەرچوٚن بێ کوردی‌یەکەی ماموٚستا گوٚران لە زمانی منیش‌و کاکەی فەللاحیش سەدجار ڕەسەنترەو ، ئەگەر ئەمڕوٚ هەر گەجەرو گوجەرێك بگری بوٚ خوٚی خوٚی‌کردەوە بە پسپوٚڕی زمانەوانی‌و وشەی نابارو ناپەسەندو ناکوردی بوٚ زمانی کوردی دائەتاشێ‌و بەزوٚریش بەسەر بنووس‌و خوێندەوارانیا ئەسەپێنێ‌و کەسیش دەرفەتی نی‌یە بەگوێی نەکاو ملی بوٚ نەنەوێنێ ، ماموٚستا گوٚران هەزار کەڕەت زیاتر هەقی هەیە لە چاوگی (پسان) – نەك (پسانەوە) – وشەی (پس) بەمەعنای پچڕاوو خاوبووەوە بەکاربێنێ .

لەبارەی بەیتی :

**نە لەرزینی چینی سەر ڕووی گوٚماوی‌شینم**
**نە بریقەی دووری چەمی پاش زوٚر بارینم**

(ب ٢ ، ل ٤٣)یشەوە ، ئەڵێ : « پێم‌وایە (دووری) نی‌یەو (دووڕڕی) بێ ، واتە پاش ئەوەی بارانێکی زوٚر دەبارێت‌و چەم هەڵدەستێت ، دوای نیشتنەوەی ، بەردە شوٚراوەکانی کەنار چەم وەك (دوڕ) بریقەیان هەیە» .

منیش ئەڵێم : پێشەکی شادمانیی خوٚم لەوە دەرئەبڕم کە کاکە لێرەدا ئەوەندەی تەوازوع پیشان‌داوە نووسیویە «پێم وایە» و نەینووسیوە «دڵنیام» ، چونکە زوٚر جوانە مرۆ ئەوەندە لە خوٚی ڕازی نەبێ‌و چەردەیەکیشی بوٚ خەڵکی‌تر تیا بیلێتەوە ، لەبەرئەوە کە لە هەموو حاڵێکا ڕێی تێ‌ئەچێ خوٚی بەهەڵەدا چووبێ‌و بەرانبەرەکەی باشی بوٚچووبێ . ئەنجا ئەڵێم هەر (دووری)یە ، چونکە (دوڕ) لە چەمدا نی‌یە لە دەریادا هەیەو ، لە بنی دەریایشەوە دەرناکەوێ‌و ، هیچ پێوەندێکیشی بە بارینەوە نی‌یە ، چ کەم‌و چ زوٚر . هەر چەمی پاش بارینی زوٚرە کە دنیا ئەنیشێتە سەر ئاو ، لەدوورەوە ئەبریسکێتەوە ، نەخوازەلاّ ئەگەر سایەقەیشی کردبێتەوەو تیشکی خوٚر بدا لە ڕووی ئاوەکە .

لەبارەی بەیتی :

**سەرچاوەکەی عومری جوانیم هاتوٚتەوە قوڵ**
**باغچەی ژینم پڕبوٚتەوە لە نەمامی گوڵ**

(ب ٤ ، ل ٤٤)یشەوە ، ئەڵێ : «وشەی (باغچەی) بە (باخچەی) ئاسانترو موٚسیقاوی‌ترە لەسەر زمان ، خوٚزگە هەموو ئەم وشانە بە (خ) بوونایە . هەروەها هەموو وشەکانی (تیژگی) کە قورس‌و نالەبار دێن بە دەستی زمان‌و خوێندنەوەوە ، (تیشکی) بوونایە کە وشەیەکی ئێسك‌سووکی شیعرانەیە» .

منیش ئەڵێم : منیش لەبارەی (باغچە)و (باخچە) وە هەروا ئەڵێم (سەد خوٚزگە) ، بەلاّم مەسەلە مەسەلەی (خوٚزگە)و خوٚزگەکاری نی‌یە ، مەسەلە مەسەلەی زمانی ئەو سەردەم‌و شوێنەیە کە شاعیر شیعرەکەی تیا وتووە . ئەم پارچە شیعرەی گوٚران لە شیعری قوٚناغە پێشینەکانیەتی کە هێشتا بەتەواوی خوٚی لە داوی چاو لێکەریی قوتابخانەی کوٚن ڕزگار نەکردبوو و لە هەڵەبجە ئەژیا . گوٚران خوٚی لە سەرەتای (بەهەشت‌و یادگار)ا باسی ئەوەی کردووە کە لەوانەیە ئێستا

(واتە کاتی چاپکردنی کتێبەکە) لە زۆر شتی ناو شیعری زووی بێزار بێ ، بەڵام بۆ سوودی ئەوانەی شوێن‌پێی گەشەکردنی زمان‌و ئەدەبی کورد هەڵ‌ئەگرن ، رێگای بە خۆی نەدا دەسکاریی هیچ شیعرێکی بکا . بەڵام بەش‌بەحاڵی (تیژگی) ئەوە مەسەلەکە شێوەیەکی‌تر وەرئەگرێ . لە کوردیدا وەك (تیشك) هەیە ، (تیژگ)یش هەیەو لەوانەیە رەسەنتریش بێ ، چونکە چاوگی وشەکە (تیژ)ە . هەرچۆن‌بێ ناوچەی هەڵەبجە (تیژگ)ی تیا باوەو ، ئەوەی لەو ناوچەیەدا لە زمانی دەوروبەرەکەی خۆی لانەدا هەر (تیژگ) ئەڵێ‌و ، مامۆستا گۆرانیش لە هەڵەبجە هاتووەتە دنیاوەو هەر لەوێ‌یش پەروەردە بووەو بووە بە شاعیر.

لەبارەی بەیتی :

**بۆی نەشکانووم تونیەتی‌و ئارەزووی دڵ**
**هەر گەڕاوە مەلی ئارەزووم چلاوچڵ**

(ب ٢ ، ل ٤٨)یشەوە ئەڵێ : «وشەی (تونیەتی) ، (تینووێتی)یە کە رەوان‌و سوارە» .

منیش ئەڵێم : بەیتەکانی ئەم پارچە شیعرە (١١) بڕگەیین . لێرەیشدا بۆ ڕاگرتنی ژمارەی بڕگەکان ئەبێ (تونیەتی) بێ . ئەگەر بکرێ بە (تینووێتی) ، ژمارەی بڕگەکان لە نیوەبەیتەکەدا ئەبێ بە (١٢) . لە (بەهەشت‌و یادگار)ەکەی چاپی سەردەمی گۆران خۆیشیا هەر (تونیەتی) نووسراوە . لام‌وایە ئەبوو کاکە ، وەك شاعیرێك ، ئەمە لە من زۆر چاکتر بزانێ .

لەبارەی بەیتی :

**هەر سەرگەردان ، هەر ئاوارە ، هەر برسی . .**
**(بۆچی ؟) باشە ، پێت‌بڵێم با ، ئەپرسی :**

(ب ٧ ، ل ٤٨)یشەوە ، ئەڵێ : «بەیتێکی ئاڵۆزەو بەم‌چەشنەیە :

بۆچی ؟ باشە پێت‌بڵێم ، یا ئەپرسی»

منیش ئەڵێم : بەر لە هەرچی ئەوەی لە دیوانەکەدا نووسراوەتەوە ، بە نیشانەی پرسیارو وێرگول‌و دوونوختەوە لەو شوێنانەیاندا کە تیایاندا دانراون ، دەق ئەوەیە لە چاپی (بەهەشت‌و یادگار)ەکەی سەردەمی گۆران خۆیا لەچاپ دراوەو ، ئەمانە بە هەموویانەوە دەورێکی گەورە لە ڕوونکردنەوەی مەعنای بەیتەکەدا ئەبینن‌و ، بەتایبەتی دانانی ئەو دوو نوختە ستوونی‌یە لەپاش وشەی (ئەپرسی)یەوە بەڵگەیەکی ئاشکرای ڕاستیی تێکستی دیوانەکەو هەڵەیی بۆچوونەکەی کاکەی فەللاحە ، چونکە بەیتەکانی پاشەوە وەڵامی پرسیارەکە ڕوون‌ئەکەنەوە .

ئەنجا با بێینە سەر لێکۆڵینەوەی بۆچوونەکەی کاکە . بەگوێرەی بۆچوونەکەی کاکە ڕستەی (یا ئەپرسی) نەك هەر زیادەو شوێنی لە نیوەبەیتەکەدا نابێتەوە ، بەڵکو لەگەڵ مەعنای (باشە ، پێت‌بڵێم)ەکەیشدا ناکەوێتە یەك . گۆران کە وتی : پاش دیتن‌و چەشتنی ئەو هەموو جوانی‌یانەیش هێشتا هەر سەرگەردان‌و ئاوارەو برسیی جوانیی‌ترم‌و ، خۆیشی لەجیاتیی بەرانبەرەکەی پرسیی : بۆ؟ و پاشان وتی باشە پێت‌بڵێم (ئەیشبوو (پێت ئەڵێم) بوایە) ، ئیتر ئەبێ پێی‌بڵێ‌و (یا ئەپرسی)یەکە قسەیەکی بێ‌مەعنا ئەبێ ، چونکە ئەو کە خۆی لەجیاتیی بەرانبەرەکەی کرد بە پرسیارکەرو وتیشی باشە پێت‌بڵێم ، بەوە گفتی پی‌وتنی پی‌داو تازە گەڕانەوە بۆ (ئەپرسی)یەکی سەرلەنوێ کارێکی ناپەسەند ئەبێ . ئەنجا ئەو (یا)یە دەوری چی‌یە ؟ (یا) بۆ ئەوە دائەنرێ مرۆ یەکێ لە دوو شت هەڵبژێرێ کە لەوانە نەبن هەردوکیان پێکەوە کۆبکرێنەوە . دوو شتەکەیش لێرەدا پی‌وتنی گۆران‌و پرسینی بەرانبەرە . ئەم دوو شتەیش لەوانە نین پێکەوە کۆنەکرێنەوە ، کەواتە ئیتر (یا) بۆچی‌یە ؟ خۆ ئەگەر بیشڵێین مەبەستی گۆران ئەوەیە بڵێ من خۆم پێت‌بڵێم ، یا تۆ خۆت ئەپرسی بۆچی ؟ ئەوا لەوەڵاما ئەڵێین ئەمە قسەیەکی زۆر بێ‌تام‌و ناشاعیرانەو نامەنتیقی‌یەو تەنانەت بەتەواوی لە داب‌و ڕەوشتی گفتوگۆیشەوە دوورە ، چونکە وای‌لی‌دێتەوە : باشە ، خۆم پێت‌بڵێم بۆ وایە ، یا تۆ خۆت ئەپرسی بۆ؟ لە حاڵەتی پرسیاری وا بێ‌جێ‌و ناپەسەندا

ئەبێ بەرانبەر وەڵامێکی بداتەوە بڵێ : خۆت بۆم باس‌بکە بۆ ، یا من لێت ئەپرسم بۆ لە هەردوو حاڵەکەدا وەڵامەکە هەر یەکەو پرسیارەکە بێ‌مەعنای لێ دەرئەچێ‌و ، لە هەموویش ناپەسەندتر ئەوەیە کە لە بەیتی پاشەوەدا شاعیر بێ چاوەڕوانی‌کردنی بەرانبەرەکەی لەخۆیەوە دەستی‌کردووە بە ڕوونکردنەوەی ڕازی (بۆچی)یەکە . ئیتر بەکورتی ئەم نیوە بەیتە ، بەوجۆرەی کە کاکەی فەللاح دایڕشتووەتەوە ، قسەیەکی ئەوەندە بێ‌تام‌و چێژە بە هیچ کلۆجێ پاساو نادرێ‌و ڕووی ئەوەی نی‌یە بێتە کۆڕی شیعرەوە . . کاکەی فەللاح ئەگەر هەر ئارەزووی لە دەسکاری کردنی شیعری خەڵکە ، با بەجۆرێ دەسکاری بکا مەعنای تیا بێڵێتەوە ، بۆنموونە لێرەدا لەجیاتیی (یا) کە (گەر)ی دانایەو بیوتایە : «بۆچی ؟ باشە ، پێت‌بڵێم ، گەر ئەپرسی» ، مەعنایەکی نزیك لە مەعنای تێکستە ئەسڵی‌یەکەوەی ئەبەخشی بە نیوەبەیتەکە !

لەراستیدا تێکستی بەیتەکە بەوجۆرە کە گۆران خۆی وتوویە ، هیچ جۆرە ئاڵۆزی‌یەکی تیا نی‌یەو ، شاعیر کە وتی هەرگیز لە جوانی تێر نابم ، هات بە فەرزیش فەرزی‌کرد کە بەرانبەرەکەی ڕازی ئەو لە جوانی تێرنەبوونەی لێ ئەپرسی‌و ، لەبەرئەوە هات وتی : ئەپرسی : بۆچی وایە ؟ با پێت‌بڵێم : چونکە جوانی تەنها جوانیی سیما نی‌یە ، جوانیی دەروونیشە ، جوانیی دەرەوەو ناوەوەیەو ، منیش تائێستا ئەو جوانەم نەهاتووەتەرێ کە لە هەردوو ڕووەوە جوان بێ ، لەبەرئەوە تا جوانێکی وام دێتەرێ ، هەر عەوداڵم‌و هەر لەدووگەڕی جوانێکم خۆزگەی چاوو دڵ بێنێتەدی .

لەدواییشدا ئەڵێم : خۆزگە کاکەی فەللاحی برادەریشمان لەجیاتیی ئەو بەسووك‌و ئاسان بڕیاردانەی ئاڵۆزیی بەیتەکەو لەجیاتیی ئەو دەسکاری‌کردنەی بەئارەزووی خۆی ، چەند دێڕێکی بۆ باسکردنی بەڵگەی ئاڵۆزیی بەیتەکەو ڕاستیی دەسکاری‌یەکەی خۆی تەرخان کردایەو ، تەنها بە شێوەی فەرمان دەرکردن نەیوتایە وایەو وانی‌یە .

لەبارەی بەیتی :

**منیش چەشنی پەپوولەیەك گوڵ دابێتە ناو**
**لە بەردەما هەڵئەپەڕێ گا گوڕج‌و گا خاو**

(ب ٧ . ل ٥١)یشەوە ، ئەڵێ : «مانا ئاڵۆزو شێواوە . وشەی (دابێتە) ، (دابێتیە)یە» .

منیش ئەڵێم : مانا نە ئاڵۆزو نە شێواوەو ، ئەگەر ڕاستە ئاڵۆزو شێواوە ، ئەی چارەسەری چۆن ئەکرێ ؟ بۆ هیچی باس‌نەکردووە ؟ خۆ ئەگەر ئاڵۆزی‌و شێوانەکە خەتای (دابێتە) بێ‌و بە کردنی بە (دابێتیە) هەمووشتێ ڕاست‌بێتەوە ، ئەوا ئەڵێم (دابێتە)و (دابێتیە) هەر یەك مەعنایان هەیەو ، لە هەردوکیانا فیعلەکە هەر (دا – دابێتی)یەو ، جیاوازی‌یان تەنها شوێنی (ی)ی ضەمیری مەفعوولە . وشەکە بە هەردوو جۆر بەکاردێ . مامۆستا گۆرانیش بۆیە لێرەدا (دابێتە)ی وتووەو (دابێتیە)ی نەوتووە ، چونکە ئەو چوارینانەی لەم پارچە شیعرەدا (شوان) ئەیانڵێ هەموو (١٣) بڕگەیین‌و ، ئەگەر (دابێتیە)ی بووتایە لەوانەبوو لە خوێندنەوەدا ببێ بە (دا – بێ – تی – یە)و ببوایە بە (٤) بڕگەو نیوەبەیتەکەی بکردایە بە (١٤) بڕگەیی . شایانی وتنە ئەمە کە لە (بەهەشت‌و یادگار)ەکەی چاپی سەردەمی گۆران خۆیشیا هەر (دابێتە)یەو ، تەنانەت بەم‌جۆرەیش نووسراوە (دای‌بێتە) کە هیچ گومانێك لەوەدا ناهێڵێتەوە (دابێتە)یەو (دابێتیە) نی‌یە .

لەبارەی وشەی (نمی)یەوە لە دووەمی ئەم دوو بەیتەدا :

**ئاغای خاوەن هێزو شکۆ ، خاوەن سامداری**
**لەکاتێکا درێژ ئەکا دەستی دڵداری**
**بۆ گەردنی گوڵەکێویی لە جێ هەڵکەنراو**
**نمی فرمێسك بەدی ئەکا لەسەر کلی چاو**

(ب ١ ، ل ٥٨)یشەوە ، ئەڵێ : «وشەی (نمی) ، نمێ)یە» .

منیش ئەڵێم : وانی‌یە ، چونکە (نم) (دڵۆپ) نی‌یە (شێ)یە ، لەسەر کلی چاویش شێ بەدی‌ئەکرێ ، دڵۆپی فرمێسك بەدی‌ناکرێ ، (شێ)یش یەك‌و دووی بۆ

بەکارناهێنرێ . زیاد لەمە بەیتی پاشەوەیش کە ئەڵێ :

موو چرکەیەك بە سەرتاپای لەشیا ئەگەرێ

ئاگادارە فرمێسکی سۆز ، دێتە خوار بۆ کێ ؟ . .

بەئاشکرا دەری ئەخا کە فرمێسك دڵۆپ‌و دوو دڵۆپ نەبوە ، ئەوەندە زۆر بووە کلەی چاویشی شێدار کردووەو دڵۆپ دڵۆپیش بەسەر گۆنای کچەدا هاتووەتە خوار . .

لەبارەی بەیتی :

**کللك‌و یـــاڵی چـــەن چـــارەوێی قـــەل کـــرد بـــە خـــەنجەر**

**بـــەسەر ڕانی ئـــاغـــایـــا داو مـــەری دایـــە بـــەر**

**(ب ٥ ، ل ٥٩)یشەوە ئەڵێ : «وشەی (قەل) نی‌یەو (قل)ەکە بۆ برین بەکاردێت» .**

**منیش ئەڵێم : (قەل) ڕاستە نەك (قل)و هەر ئەو (قەل)ەیشە لە هەندێ لا بە (کەل)ی بەکاردێنن . لە (فرمێسك‌و هونەر)ەکەی چاپی سەردەمی مامۆستا گۆران خۆیشیا هەر (قەل)ە .**

**لەبارەی بەیتی :**

**ئیستە خەڵەلی عافیەتیش باری بەدەنە**

**هەر دەردە ئەدا پاچی لە بونیانی خەرابم**

**(ب ٥ ، ل ٦٧)یشەوە ، ئەڵێ : «وشەی (پاچی) ، (پاچێ)یەو ، (بونیانی)ش (بونیاتی)یە» .**

**منیش ئەڵێم : بەش‌بەحاڵی (پاچی)و (پاچێ) کەسیان لە ڕێگای لێکدانەوەی مەعناوە نەبێ بەڵگەیەکیان بۆ بووچوونەکەمان بەدەستەوە نی‌یە . من لاموایە (پاچی)یەو نیوەبەیتەکە واتە : هەر دەردەو هاتووەو بەربووەتە خانووی تەنی بەدەردوداو وێرانەم‌و خەریکە بە پاچ لەبنی‌دێنێ ، نەك هەر دەردێ دێ‌و پاچێکی لێ‌ئەداو ئەڕوا . بەش‌بەحاڵی (بونیانی)و (بونیاتی)یش لە (فرمێسك‌و هونەر)ەکەی چاپی سەردەمی مامۆستا خۆیا (بنیانی) نووسراوە . لە کوردیدا (بونیات) نی‌یە ، (بنیات) هەیە کە لەگەڵ (بونیاد) لە یەك ڕیشەوە هاتوون‌و ، بەمەعنای بناخەی خانوو بەکاردێ نەك تێکڕای خانووەکە کە لە**

بەیتەکەی گۆراندا ئەوە مەبەستە .

لەبارەی بەیتی :

**هۆن هۆن فرمێسکم برژێتە داوێن**

**فرمێسکی تاسەر جەرگ‌و دڵ تاوێن .**

(ب ١ ، ل ٩)یشەوە ، ئەڵێ : «وشەی (تاسەر) نی‌یەو (تاسەو)ە ، ئەگینا بۆچی ئەو فرمێسکە (تاسەر جەرگ‌و دڵ) ئەتاوێنێتەوەو واز لەوانی‌تر دێنێت ؟ بەیتەکە بەم‌شێوەیە :

فرمێسکی تاسەو ، جەرگ‌و دڵ تاوێن

واتە : فرمێسکی شەوق‌و سۆزو جەرگ‌و دڵ توێنەرەوە .

مەعنای بەیتەکە بەم‌ڕەنگە بەپێزتر ئەبێت» .

منیش پێشەکی ئەڵێم : سەد حەیف‌و سەد مخابن کەوا مامۆستا گۆران بۆی‌نەلوا دوای (فرمێسك‌و هونەر)یش کۆمەڵە شیعرێکی‌تر بڵاوبکاتەوە تا ئەگەر هەڵەیەکیش کەوتبێتە ئەم ، تیا ڕاست‌بکاتەوە ، وەك هەڵەکانی (بەهەشت‌و یادگار)ی لە (فرمێسك‌و هونەر)ا ڕاست‌کردەوە . ئەگەر ئەوە بووایە ، وەك چۆن گەلێ لە بەناو «ڕاستکردنەوە»کانی کاکەی فەلـلاحم بۆ شیعرەکانی (بەهەشت‌و یادگار) بە هەڵە دەرکردو بەڵگەیشم مامۆستا گۆران خۆی بوو ، هەندێکی‌تریشم لە بەناو «ڕاستکردنەوە»کانی (فرمێسك‌و هونەر)یش هەرواو هەر بە پشتیوانیی مامۆستا گۆران خۆی بە هەڵە دەرئەکرد .

ئەنجا دێمەسەر (تاسەر)و (تاسەو)ەکەو ئەڵێم : سەرەڕای ئەوە کە لە (فرمێسك‌و هونەر)ەکەدا (تاسەر) نووسراوە ، لاموایە ڕاستی‌یەکەیشی هەر وایە ، چونکە ئەگەر (تاسەو) بێ ئەبێ (جەرگ‌و دڵ) عەتف بنە سەری‌و (تاوێن)ەکە بەسەر هەموویانا بچێتەوە ، واتە : تاسەیش‌و جەرگ‌و دڵیش بتوێنێتەوە .

کەواتە ئەبێ بە یەکەم کوڵی گریان تاسەی دیداری کۆستە کەوتووەکە بتوێتەوەو ئیتر باسی لەئارادا نەمێنێ ، فرمێسکی‌وایش بێ‌گومان شتێکی چاکە ، چونکە یادی مردووەکە لەبیرئەباتەوە ، بەڵام ئەمە ئاواتی کەسێ نی‌یە کە

ئازیزێکی زۆر ئازیزی مردبێ که لەم‌شوێنەدا منالێکی خۆشەویستی مامۆستا گۆرانە . بۆ گەیاندنی ئەو مەعنایە که کاکەی فەللاح به بۆچوونی خۆی بۆ بەیتەکەی داناوە ، ئەبوو بووترایە «فرمێسکی تاسەی ، جەرگ‌و دڵ تاوێن» .

کاکەی فەللاح لە مەعنای (تاسەر) نەگەیشتووە ، بۆیە ئەو ڕەخنەیەی گرتووە که ئەڵێ : «ئەگینا بۆچی ئەو فرمێسکە (تاسەر جەرگ‌و دڵ ئەتاوێنێتەوە)و واز لەوانی‌تر دێنێت» . مەبەست لەم (تاسەر)ە (سەرانسەر)ە ، واتە جەرگ‌و دڵ بەتەواوی ئەتوێنێتەوە ، ئیتر ئەوە بەخەیاڵا نەهاتووە که سی‌و قوڕقوڕاچکەو دەم‌وچاوو لووت‌و گوێ‌یش تا سەر بتوێنێتەوە ! لەم مەیدانی سۆز دەربڕینەدا تەنها (جەرگ سووتان)و (جەرگ‌و دڵ توانەوە) وتراوەو ، کەس لەوەی تێ‌نەپەڕاندووەو ، بەڵکو لەبنەڕەتیشا بۆ گەیاندنی مەعنا حەرفی‌یەکەی ناوترێ‌و تەنها مەعنای زیادەڕەوی‌یەك لە سۆز دەبڕینا ئەگەیەنێ .

لەبارەی بەیتی :

**چ داوێکـــــه چ ئـــیـــــنســـــافـــێکــــه ، زاڵم**
**جـــهـــەنـــەم تـــاو ئـــەدەی ئـــەیـــکـــەی بـــەحـــاڵم**

(ب ٣ ، ل ٩٨)یشەوە ، ئەڵێ : « وشەی (داوێکە) هەر زۆر بە بەیت‌و مەبەستی شاعیر نامۆیە .

ئەم وشەیە (دادێکە ؟)یە . بەم‌شێوەیە ڕاست‌دەبێتەوە ، ئەگینا (داو) هیچ پەیوەندی‌یەکی بە مەسەلەکەوە نی‌یە» .

منیش ئەڵێم : ڕاستە ئەبێ وابێ‌و ، لە (فرمێسك‌و هونەر)ەکەدا بەهەڵە نووسراوە (چ‌داوێکە) .

لەبارەی بەیتی :

**یاکام دەریازۆر قووڵە**
**بنی ، بیخەمە جووڵە**

(ب ٤ ، ل ١٠٧)یشەوە ، ئەڵێ : «پێم‌وایە بەم‌شێوەیە سوارترو ڕەوانترە :
بنی بخەمە جووڵە» .

منیش ئەڵێم : هەر (بیخەمە)یەو ، بەپێی گراماتیکای زمان‌و مەعنای بەیتەکەیش هەر ئەبێ وابێ . (بنی) مەفعوولی (بیخەمە) نی‌یە تا بڵێین ئەبێ (بخەمە) بێ ، (موبتەدا)ی دواکەوتووەو (قووڵە) خەبەریەتی‌و لێی پێش‌کەوتووە . گۆران لەم‌بەیتەدا ئەڵێ : کام دەریا بنی قووڵەو لە هەموو دەریایەك مەنگترە ، بیخەمە جووڵەو بیهەژێنم ، نەك : کام دەریا قووڵە ، بنەکەی بخەمە جووڵە . لە (فرمێسك‌و هونەر)ەکەیشدا هەر بەم‌جۆرەیە کە لە دیوانەکەدا نووسراوەو ، تەنانەت وێرگولە زۆر پێویست‌و مەعنا ڕوونکەرەوەکەیش مامۆستا گۆران خۆی دایناوە .

لەبارەی بەیتی :

**کۆمـــــەڵە شاخـــــێك سەخت‌و گەردنــــــکــــــەش**
**ئـــــــاسمانی شنی گرتـــۆتــــــــــە بـــــــــاوەش**

(ب ١ ، ل ١٢٧)یشەوە ، ئەڵێ : «وشەی (شنی) ، (شینی)یەو لە هەڵەی چاپ ئەچێت» .

منیش ئەڵێم : باوەڕناکەم کەسێ هەبێ نەزانێ هەڵەی چاپەو ڕاستەکەی (شینی)یە ، بەڵام نازانم کاکە بۆ ئەڵێ : «لە هەڵەی چاپ ئەچێت»و دڵنیا نی‌یە کە هەڵەی چاپە ؟ تۆبڵێی ئەوەندە شارەزای من نەبێ بزانێ (شینی)م لێ نابێ بە (شنی) ، یان نایەوێ تەنانەت دانم بەوەندەیشدا بۆ بنێ ؟ ! سەیرە !

لەبارەی بەیتی :

**ئـــەم کۆمـــەڵانـــە تـــیـــایـــەتی ، جـــار جـــار**
**جـوانــــــــــێکی لاوی کۆڵەوانـــــــــــــە لار**

(ب ٣ ، ل ١٣٨)یشەوە ، ئەڵێ : «وشەی (لاوی) ، لادێ‌ی) وا ماناو مەبەست ڕاست دەبێتەوە» .

منیش ئەڵێم : لەوانەیە هەر (لاوی) بێ ، چونکە ئەوانەی گۆران باسیان ئەکا هەموو لادێ‌یین ئەچن بۆ شار بۆ مامەڵەو فرۆشتنی کەل‌وپەلی لادێ‌و کڕینی پێویستی‌یان لە شار .

ئەمانەیش تێکرا پیاوو ژنی قەدرەن‌و لەوانەن لە ڕێی ئەوەدا نەبن نە هاتوچۆیاندا تووشی شتێکی‌وا ببن ببێ بە مای شوورەیی بۆ خۆیان‌و کەس‌وکاریان ، لەبەرئەوە کەم‌جار ڕێ ئەکەوێ کچی گەنج‌و جوانیان تیابێ . کەواتە زیادەیە گۆران بڵێ (جوانێکی لادێ) چونکە کەسیان شاری نین ، بەڵکو ئەبێ بڵێ جاروبار کچی تازە پێگەیشتووی جوانیشیان تیا ئەبێ .

بەڵام شتێکی‌تر هەیە بۆچوونەکەی کاکەی فەللاح بەهێز ئەکا ، ئەو خۆی هەستی پێ نەکردووە تا بیکا بە بەڵگەو پشتی پێ ببەستێ . وا من باسی ئەکەم تا ئەوە پیشان‌بدەم بنیادەم چۆن بەدوای بەڵگەی بەهێزا بگەڕێ بۆ بیروڕای خۆی‌و ، بە مەبەستی ساغکردنەوەی شیعری گۆران‌و هەڵە لێ‌دوورخستنەوەی . ئەوەیش یەکەم ئەوەیە لە چاپەکەی (فرمێسك‌و هونەر)ی سەردەمی گۆرانا (لاوی‌ی) نووسراوە کە لەبەرئەوەی ئەگەر ڕاست‌بێ (لاوی) بێ دوو (ی)ی ناوێ ، بوونی دوو (ی) ئەو بۆچوونەی پێ بەهێز ئەبێ کە (و)ەکە (د) بووبێ‌و بەهەڵە بووبێ بە (و) ، واتە وشەکە (لادێ‌ی = لادێی) بێ . دووەمیش ئەوەیە کە هەر لەو برگە شیعرەدا ، هەر پاش دوو بەیت ئەڵێ :

ئەی جوانی لادێ ! بە سەرنج‌و سڵ
لێت ورووژاندووم خــــەیاڵاتی دڵ

کە ئەمە وائەگەیەنێ وشەی پێشوویش هەر (لادێ) بووبێ‌و بەهەڵە گۆڕابێ . لەبەر ئەم بەڵگەیە لەگەڵ بۆچوونەکەی کاکەم‌و (لاوی) بەهەڵە دائەنێم .

لەبارەی بەیتی :

**بۆ قوازتنەوەی تا ئەکەوتە کـــــار**
**زۆر دار لێــی ئەفڕان یەکەم پەلامار**

(ب ۳ ، ل ۱٤۰)یشەوە ، ئەڵێ : «وشەی (قوازتنەوەی)نی‌یەو (قۆزتنەوەی)ە» . هەروەها ئەڵێ : «وشەی (یەکەم) ، (بە کەم)ە ، واتە : زۆردار بە پەلامارێکی کەم لە (بێ‌زۆر)ەکەی ئەسەند ، ئەوەندە بێ‌دەسەڵات بوو» .

منیش ئەڵێم : بەش‌بەحاڵی (قواستنەوە) هەر (گواستنەوە) عادەتی‌یەکەیە ، ئیستا کەمێك تایبەتێتی دراوە بە مەعناکەی . هەر لەم سیغەیە (خواستن)یش هەیە . کەواتە بوونی ئەو (ا)ە پێچەوانەی ڕێبازی زمانی کوردی نی‌یە . لە (فرمێسك‌و هونەر)ەکەیشدا هەر (قواستنەوەی) نووسراوە . بەش‌بەحاڵی (یەکەم)و (بە کەم)یش ، هەرچەند لە چاپی سەردەمی گۆرانی (فرمێسك‌و هونەر)ەکەدا دوو نوختەکە زیاتر بە یەك نوختە ئەخوێنرێتەوە ، من هەر لام‌وایە (یەکەم) بێ ، چونکە (بە کەم پەلامار) نیمچە ڕستەیەکی ناتەواوە ، ئەبێ (بە پەلامارێکی کەم) یا هەر هیچ نەبێ (بە کەم پەلامارێ) بێ ، بەڵام (یەکەم پەلامار) هیچ ناتەواوی‌یەکی تیا نی‌یەو مەعناکەیشی ئاشکرایەو ئەڵێ : زۆردار هەر لە یەکەم پەلامارا لە بێ‌دەسەڵاتی ئەسەند ، چونکە ئەم هیچی پێ نەئەکرا بەرانبەری .

لەبارەی بەیتی :

**نەختێك ڕۆیشتن نەما جێگای غار**
**چەشنی مێروولە کشا ڕێچکەی سوار**

(ب ۷ ، ل ۱٥۰)یشەوە ، ئەڵێ : «وشەی (ڕۆیشتن) ، (ڕۆیشتین)ە ، چونکە شاعیر خۆیشی لەگەڵیاندایە» .

منیش ئەڵێم : وانی‌یە . گۆران لەم‌بەیتەدا باسی ڕمبازی‌کەرەکان ئەکا کە غارغارێنیان کردووە ، باسی هەموو ڕێبوارەکان ناکا کە دیارە تێکەڵ بوون لە سوارو لە پیادە ، هەرچەند خۆیشی‌و هاوڕێ گەشتکەرەکانیشی سوار بووبن ، چونکە ئاشکرایە ئەوان ، وەك کومەڵێ میوانی شاری لە مووچەخۆرانی دەوڵەت ، لەو ڕمبازی‌یەدا بەشدار نەبوون ، لەبەرئەوە کە لە هەموان پاش‌ئەکەوتن‌و وەك سواری لادێ‌یی پێشبرکەیان پێ نەئەکرا . بەیتەکانی پێش ئەم بەیتەیش نیشانەی ڕاستێی ئەم لێکدانەوەن . لە (فرمێسك‌و هونەر)ەکەی چاپی سەردەمی گۆران خۆیشیا هەر (ڕۆیشتن) نووسراوە .

لەبارەی بەیتی :

**لێو لێك‌نێ ئیتر شابێ تەواو بوو**

**هاورێت سەفەرین لەگەڵ شەبەق زوو**

(ب ٨ ، ل ١٥٤)یشەوە ، ئەڵێ : «ئاڵۆزو نەگونجاوە . (هاورێت) ، (هاوریێی)ە» .

منیش ئەڵێم : ئەم بۆچوونەی کاکەی فەللاح نیشانەیەکی زەق حاڵی نەبوونە لە مەتڵەب . لە چەند بەیتی پێش ئەم بەیتەوە گۆران قسە لەگەڵ خۆی ئەکاو ئەڵێ : ئیتر با بەسی بێ بەزم‌و رابواردن ، تۆ ماندووی رێی ، خەڵك هەموو نووستوون ، تەنانەت بووك‌و زاوایش لە بەزم‌ورەزمی خۆیان بوونەتەوەو نووستوون ، ئاوایی کروکپە ، دنیا کش‌وماتە ، هاورێکانت لەسەر سەفەرن‌و سبەینێ زوو لەگەڵ دەرکەوتنی سپیدەی بەرەبەیانا ئەکەونەرێ بەرەو شار ئەگەڕێنەوە ، ئیتر تۆ بۆ ناخەوی ! دە لێوێ لێك‌نێ‌و چاوت بچێنە خەو . سەرەرای ئەمە لە (فرمێسك‌و هونەر)ەکەی چاپی سەردەمی گۆران خۆیشیا هەر (هاورێت) نووسراوە .

لەبارەی بەیتی :

**من مات، تۆ زیز ،**

**هەردوکمان جووت**

(ب ٧ ، ل ١٦٣)یشەوە ، ئەڵێ : «پێم‌وایە (هەردوو هاوجووت)ە» .

منیش ئەڵێم : بەچیدا پێت‌وایە ؟ ئەگەر تویش ئەپرسی : ئەی تۆ بەچیدا ئەڵێی راستەکەی (هەردوکمان جووت)ە ؟ ئەڵێم : ئەم پارچە شیعرە لەوانەیە لەبەر دەسنووسی گۆران خۆی نووسراونەتەوەو لەوا بەم‌جۆرە بووکە لێرەدا نووسراوەتەوە ، جا ئەگەر تۆ لات پەسەند نی‌یە ، رووی دەمی رەخنەت بکەرە گۆران خۆی !

لەبارەی بەیتی :

**تاوێك نەغمەی مەل، تاوێك شنەی با**

**تا ئەودیو شاخی ئەندێـــشەم ئـــەبا**

(ب ٦ ، ل ١٦٧)یشەوە ، ئەڵێ : «وشەی (ئەبا) ، ئەبا)یەو لە هەڵەی چاپ ئەچێت» .

منیش ئەڵێم : سوپاس بۆخوا کە کاکە بە ری‌تێ‌چوونیش بێ ئیحتیماڵێکی ئەوەی هێشتووەتەوە کە هەڵەکە هەڵەی چاپ بێ‌و ، من ئەوەندە ناشی نەبم نەزانم (ئەیا) نی‌یەو (ئەبا)یە .

لەبارەی بەیتی :

**تاریکە شەوێ : نوقمی رەشی چیهرەیی دنیا**

**دیلی تەمی ئەسرار بوو دەروو دەشتی حەقایق**

(ب ١ ، ل ١٧١)یشەوە ، ئەڵێ : « (شەوێ) ، (شەوی)یەو ماناکەی ئاودامانترە» .

منیش ئەڵێم : وا نی‌یە . ئەو دوو نوختە ستوونی‌یە کە گۆران خۆی لەدوای وشەی (تاریکەشەوێ)وە دایناوەو ، منیش لەرووی دەسنووسی خۆی نووسیومەتەوە ، بەئاشکرا نیشانەی ئەوەیە کە (تاریکە شەوێ)یەو (تاریکە شەوی) نی‌یە . گۆران لەم بەیتەدا ئەڵێ : تاریکە شەوێ ، تاریکە شەوێکی چۆن ؟ تاریکە شەوێکی‌وا رووی دنیا هەموو نوقمی رەشیی تاریکایی بوو . . تاد . جا لە بەیتەکانی پاشەوەدا وەسپی شەوەکە زیاتر روون ئەکاتەوە . ئەگەر (تاریکە شەوی) بێ قسەکە هەموو لەم‌بەیتەدا ئەبرێتەوەو تابلۆکە زۆر ناشیرین‌و بابەتەکە زۆر ناتەواو دێتە بەرچاو . . من نازانم کاکەی فەللاح چ‌جوانی‌یەکی لەوەدا بەدی‌کردووە کە مەعنای ئەم بەیتە کە لەراستیدا تەنها وەك کلیلی دەرگای سەرانسەری پارچە شیعرەکە وایە ، بەم‌جۆرە لێك‌بداتەوە کە (تاریکە شەوی . .) ئەیگەیەنێ : دەرودەشتی حەقایق لە تاریکەشەوی نوقمی رەشیی چیهرەی دنیادا ، دیلی تەمی ئەسرار بوو .

لەبارەی بەیتی :

**تاوتاو لێی‌ئەدا تەپڵی هـــوموم تەرزە بە ئاهەنگ ،**

**وەختێ کە ئەهات حەملەیی با تونگ‌و خورۆشان**

(ب ٨ ، ل ١٧١)یشەوە ، ئەڵێ : «وشەی (هوموم) بێ‌جێ‌و نامۆیە بەم شوێنەو بە تەرزە ، لەبەرئەوە (هوجووم)ە کە هێرشی لێدانی تەپڵی تەرزەیە» .

منیش ئەڵێم : کاکە لێرەدا تۆڵەی هەڵەی پێشووی بە باشی

کردەوە . زۆر بەجێیەو (هوجووم)ەو ، (هوموومو) نی‌یەو ، من خراپم خوێندووەتەوەو خراپم نووسیوەتەوە .

**لە چاوی تۆوە پرشنگی ئەگاتە ڕۆحی بەدبەختم**
**ئەکا مەستی تەسەللی تا شەوی دوایی سەری سەختم**

(ب ٦ ، ل ١٧٣)یشەوە ، ئەڵێ : «(تەسەللی) ، (تەسەللا)یە» .

منیش ئەڵێم : لە دەسنووسەکەی مامۆستا گۆران خۆیشیا کە من لەڕووم نووسیوەتەوە ، هەر (تەسەللی) نووسرابوو . ئەمەیش ڕاستیی وشەکەیە بە عەرەبی‌و ، بە زمانی ئەدەبی کلاسیکی خۆیشمانو ، ئەم پارچە شیعرەیش لە ڕیزی شیعرە کلاسیکی‌یەکانی مامۆستادا دائەنرێ .

لەبارەی بەیتی :

**لێوی تینووی کەل وەك دڵۆپ ئەیرژێ**
**ئەی داخەکەم ، مەرگی نیشتن ئەیکوژێ !**

(ب ٢ ، ل ١٧٥)یشەوە ، ئەڵێ : «وشەی (ئەیکوژێ) ، (ئەیکوژێ)یەو هەڵەی چاپە» .

منیش ئەڵێم : ڕاستە ، وایە وەك کاکە نووسیویە .

لەبارەی بەیتی :

**لە بەرپێی نەمامی چوالەدا سەوزاو**
**لە ڕوومەت تــــکاوە رژاوەتە ئاو**

(ب ٤ ، ل ١٧٩)یشەوە ، ئەڵێ : «وشەی (سەوزاو) ، (سووراو)ە کە ڕەنگی گوڵی دارچوالەیە ، ئەگینا (سەوزاو) کوا هەیە ؟ بڕوانە شیعری ل ١٧٦ (ب ٤– ٥ ، پارچە شیعری (دارچوالەی پشکوتوو) –م) :

ڕیزێك نەمامی دارچوالەی نازدار
کە ڕێك وەستابوون لەسەر گیای بەهار
وەك بووك ئەندامیان لە سووراو نابوو
لەنجەی تاوتاویان بۆ چیەی با بوو»

منیش ئەڵێم : ئەمەیە جاران لە حوجرەی فەقێدا پی‌یان‌ئەوت «قیاسی کەشك لە مەشك !» . کاکە لەم بۆچوونەیا زۆر بەهەڵەچووە . بەر لە هەرچی‌و سووك‌و ئاسان ، لەبەرئەوە کە ئەم پارچە شیعرەم ، وەك بەشی زۆری پارچە شیعرەکانی کۆمەڵەی سێهەم – سروشت‌و دەروون ، لە ڕووی دەسنووسی گۆران خۆی نووسیوەتەوە . کەوابوو ئیتر هیچ قسەی تیا نامێنی‌و مەسەلەکە ئەبڕێتەوە . لە ڕووی مەعنایشەوە لەبەرئەوە کە مەبەست لە (سەوزاو) ئاوی پاش‌بارانی لە بنی نەمامی دارچوالەی بە گەڵای سەوز داپۆشراودا وەستاوە ، کە پڕبووە ، نەك لە گوڵاڵەی سووری وەریوی دارچوالە کە بیکا بە سووراو ، بەڵکو لە گەڵای سەوزو هەڵاڵەی سەوزی هێشتا نەپشکوتووی بەگوڵ‌نەبووی وەریوە ناو ئاوی بنی نەمامەکە ، کە وەك سەوزاوی لێ‌کردووە . ئەم کاتەی گۆران قسەی لێ ئەکا ، وەك لەم دووبەیتەی پێش بەیتە مەبەستەکەیشمانەوە دەرئەکەوێ کە ئەڵێ :

درەختی هەڵووژەی بەفر داپۆشیو
دار سێوی ڕازاوە بە پۆپلانەی زیو
هەڵاڵەی وەراندوون تەوژمی باران
وەك بووکی ڕووتکراو کەوتۆتە گریان

(ب ٢ – ٣ ، ل ١٧٩) ، کاتێك نی‌یە بەهار بەتەواوی هاتبێ‌و دارو درەخت بە گوڵی ڕەنگاوڕەنگ ڕازابێتەوە ، سەرەتای بەهارەو ، بەڵکو هێشتا بەفریش ئەبارێ‌و ، درەخت لە گەڵاو هەڵاڵەی نەپشکوتوو بەولاوەی پێوە نی‌یە ، بەڵام لەم دوو بەیتەدا کە کاکە کردوونی بە بەڵگە بۆ بووچوونەکەی (ڕیزێك نەمامی . .) ، بەهارێکی تەواوەو ، هەڵاڵە بەجارێ پشکوتووەو ، درەخت بە گوڵ ڕازاوەتەوە ، وەك ناوونیشانی پارچە شیعرەکەیش (دار چوالەی پشکوتوو) شایەتیمان بۆ ئەدا . لێرەدا دار چوالە وەك نۆبووك ئەندامیان لە سووراوی گوڵی سووری باران چۆڕاوگە لێ‌بەستوو ، ناوەو ، جارجاریش لەو پەرەی گوڵانەوە وەریوەتە بنی ئاو . . سووراو لێرەدا بە درەختەکانەوەیە ، بەڵام لە بەیتە مەبەستەکەمانا سەوزاو ئاوی

سەر گیای سەوزو پڕ لە گەڵای سەوزو هەڵاڵەی سەوزی وەریوی دارچوالەیەو ، ئەم دوانە زۆر جیان لە یەك .

**وردەکاری‌یەکیش لە دروستکردنو بەکارهێنانی وشەی (سەوزاو)ا هەیە بەداخەوە کاکەی فەللاح بیری بەلایا نەچوە . ئەویش ئەوەیە ئەوەی لە رووممەت ئەتکێ ئەبێ رەنگی روومەتەکەی پێوەبێ** . ڕووممەتی درەختیش کە هەر گەڵای **پێوەبێ دیارە سەوزە** ، کەواتە ئەوەی لێی ئەتکێ سەوزاوە . زیاد لەمەیش لە ئەدەبی کلاسیکمانا کە باسی خولامی تازە گەنەتووك دەرکردوو ئەکرا ، ئەو گەنەتووکانەیان بە (خەتی سەبز) دائەنا . (خەت)ی یەکەی لەبەرئەوە کە لەسەر تەختی سپی ڕوو وەك خەتی ڕەش وایەو ، (سەبز)ی‌یەکەیشی لەبەرئەوە کە (ڕواوە)و ڕواویش سەوزە . جا چونکە گەڵای لە دار ڕواویش وەك مووی لە ڕووی یار ڕواو وایەو سەوزیشە ، ئەوەی لەوەوە داچۆڕێتە خوار بە (سەوزاو) وەسپ‌کراوە .

لەبارەی بەیتی :

**بە کۆمەڵ بگرن گوێ لە هاواری**
**کۆمەڵ جەلب ئەکا ڕیقەتی باری**

(ب ٦ ، ل ١٨٨)یشەوە ، ئەڵێ : «وشەی (هاوار) دەبوایە لە کەوانەدا بوایە ، چونکە ئاماژەیە بۆ گۆڤاری (هاوار) خۆی» .

منیش ئەڵێم : پێویست ناکا ، چونکە لە ناوونیشانی پارچە شیعرەکەدا نووسراوە : ئیلهامی «هاوار»و ، لە داوێنیشیەوە نووسراوە گۆڤاری «هاوار»و ، دووجاریش وشەی (هاوار) لە خودی پارچە شیعرەکەدا دووبارە بووەتەوە کە ئیشارەت بۆ گۆڤاری «هاوار» لە هەر دوانیانەوە دەرك ئەکرێو ، (هاوار) لە هەرکام لەو دوانەدا دوو مەعنای هەیە یەکێکی نزیك کە (هاوارکردن)ەو یەکێکی دوور کە ناوی گۆڤارەکەیەو ، ئەبێ ئەوە جێ‌بهێڵرێ بۆ خوێندەوار کە نەختێ بیری خۆی بەکاربێنێ ، نەك لە هەموو شتێکا پەنجەی بگیرێو بخرێتە سەر مەعنای مەتڵەب .

لەبارەی بەیتی :

**ئێستا – ئۆخەی ! – ئاسمانێکەو هەتاوێ**
**گیایەو ، گوڵەو ، مەلەو ، خورەی چەماوێ . . .**

(ب ٤ ، ل ١٩٤)یشەوە ، ئەڵێ : (هەتاوێ) ، (هەتاوی)یە ، واتە : ئاسمانێکی هەتاوی‌یە . . وشەی (چەماوێ) . . . (چەماوی)یە» .

منیش ئەڵێم : وانی‌یە ، چونکە (و)ی (ئاسمانێکەو) لێ‌ناگەرێ . ئەگەر (و)ەکەیش لابەرینو (هەتاوێ) بەزۆر بکەین بە (هەتاوی) وەك کاکە ئەیەوێ ، ئەی ضەمیری (ی)ی (چەماوی) بۆکوێ بگێڕینەوە ؟ تۆزێ مێشك خستنەکار نیشانمان‌ئەدا کەوا وەك چۆن (ئاسمانێکە) (ێك)ی تەنکیرو وەحدەی تیایە ، (هەتاوێ)و (چەماوێ)یش هەر وان .

لەبارەی بەیتی :

**ئا ، سەیری دیمەنی وەها کاریــــگەر**
**کام ویجدان ناداتە بەر نووکی نەشتەر**

(ب ٦ ، ل ١٩٨)یشەوە ، ئەڵێ : «ئەو (ئا)یە بێ‌جێ‌یە . ئەسڵی ئەم بەیتە وایە :

توخوا دیمەنی وەها کاریگەر . .» .

منیش ئەڵێم : ئێستایش ئەو دەفتەرەم لە بەردەستایە کە لە ساڵی ١٩٥٧دا ، بۆ یەکەمجار ، لە کتێبخانەی هەموانی کەرکووك ، ئەو پارچە شیعرەم لە ڕووی کتێبێکی لەچاپدراوی ساڵانی چل ، کە بەداخەوە ئێستا ناوەکەیم لەیاد نی‌یە ، نووسی‌یەوە تیادا . لەوێ‌یشدا هەر (ئا ، سەیری)یە کە بە وێرگولەکەی پاش (ئا)کەداو ، بە شارەزاییا لە شێوەی نوختەو وێرگول دانانی مامۆستا گۆران ئەزانم تەنانەت ئەو وێرگولەیش یەکەم‌جار ئەو خۆی دایناوە ، سەرەڕای ئەوە کە بەکارهێنانی ئەم جۆرە تەعبیرە میللی‌یانە لە خاسیەتەکانی زمانی شیعری گۆرانە .

ئەنجا نازانم کاکەی فەللاح پشت بە چ بەڵگەیەك ئەڵێ ئەبێ لەجیاتی (ئا ، سەیری) (توخوا) بێو ، چ‌ناتەواوی‌یەکی لە مەعنای (ئا ، سەیری)دا دیوەو بۆ دەستنیشانی ناکاو ، لە

چ سەرچاوەیەکدا دیویە نووسراپێ (توخوا) تا ئێمەیش هەڵەی خۆمانی لە ڕوو ڕاستکەینەوە ؟ شیعر شیعری گۆرانە ، هی کاکەی فەللاح نی‌یە تا هەق دەسکاری کردنی بێ . دیارە ئەو ساڵێك‌و چەند مانگ ژیانی وەزیفەیەیشی لەگەڵ گۆران ئەم (حەق شوفعە)یەی ناداتێ !

لەبارەی بەیتی :

**زۆر شەرمە لە چەرخی بیستەما ئینســـانێ**
**برسی بێ‌و سکی خۆی هەڵ‌لووشێ بۆ نانێ ! . .**

(ب ١٠ ، ل ٢٠٠)یشەوە ، ئەڵێ : «وشەی (هەڵ‌لووشێ) هەر تەواو سەقەتە ، ئەسڵەکەی (هەڵوشێ)یە کە لە هەڵگوشینەوە هاتووە . مەسەلەش برسێتی‌و هەڵگوشینی ورگە لەبرسانا» .

منیش ئەڵێم : لە هەمان دەفتەردا کە هەر ئێستا باسم‌کرد ئەم وشەیەم بە (هەڵ‌لووشێ) نووسیوەتەوە . وایش‌نازانم هەڵەم کردبێ لە ڕوونووس‌کردندا . نایشزانم ئاخۆ لەم‌شوێنانەدا (هەڵ‌لووشین) بەکاردێ یانە ؟ ئەگەر بەکاربێ ، مەعنایەکی وردو ناسك ئەبەخشێ‌و زیادەڕەوی‌یەکی جوانی تیا ئەبێ کە ئەوەتە کابرای بێکاری برسی لەبرسانا سکی خۆی ئەخوا . . ئەگەر بەکاریش نەیەت ئەوە دیارە من بە هەڵەم نووسیوەتەوەو ڕاستەکەی بەوجۆرەیە کە کاکەی فەللاح نووسیویە .

لەبارەی بەیتی :

**ئەڵێی ئەو زەڕنەقووتەی پەپکەمارە فەرشی هێلانەی**
**چ ئیشێکە ،کوڕم ،بۆچی لەسەر ئەم هەڵکڕووزانەی ؟**

(ب ٦ ، ل ٢٠١)یشەوە ، ئەڵێ : «وشەی (ئیشێکە) ، (ئێشێکە)یە کە پەیوەندی بە خەولی‌زڕانەکەوە هەیە» .

منیش ئەڵێم : لە دەسنووسەکەی مامۆستا گۆراندا کە من بەشێکی زۆر لە پارچە شیعرەکانم لە ڕوو نووسیوەتەوە ، بە هیچ کلۆجێ نیشانەی (٧) بەکارنەهێنراوە ، بەڵکو تێکڕا مامۆستا گۆران شێوەنووسینی ساڵانی بیست‌و سی بەکارئەهێنا .

شوێنەکەیشی بۆ (ئیشێکە)و (ئیشێکە) دەست‌ئەدا کە بەمەعنا (چ کارێکە) ، (چی‌یە ، چی‌ڕووی‌داوە) بێ . سەرەرای ئەوەیش گۆران لە تێکڕای پارچە شیعرەکەیدا ئەیەوێ بوعدێکی فەلسەفی بدا بە هەڵوێستی مناڵەکەو گریانەکەی بگێڕێتەوە بۆ خەمێکی گەورە کە هێشتا ئەو لەئاستیا نی‌یەو ، بە هیچ کلۆجێ لە پارچە شیعرەکەدا باسی ئازاری نەخۆشی نەکراوە . لەبەرئەوە لام‌وایە بۆچوونەکەی کاکەی فەللاح تارادەیەکی زۆر ئاستی قووڵیی مەعنای نەك بەیتەکە بەتەنها ، بەڵکو سەرانسەری پارچە شیعرەکە دێنێتە خوارێ .

لەبارەی بەیتی :

**ئەوڕۆژەی کە ڕەنگی پێست ، ژمارەی سەر ،**
**جیاوازیی چین‌و دین ئەگـــــــرێ بەرامبەر**

(ب ٩ ، ل ٢٥٩)یشەوە ، ئەڵێ : «وشەی (ئەگرێ) نایەت ، (ئەکرێ) واتە بەرامبەر ئەکرێ» .

منیش ئەڵێم : لە (پەیامی کورد)ەکەی چاپی سەردەمی گۆران خۆیدا کە لە چاپخانەی (ژین) لە سلێمانی لەچاپ‌دراوەو مامۆستا خۆیشی سەرپەرشتیی لەچاپدانی کردووە ، (ئەگرێ) نووسراوەو مەعنایشی زۆر تەواوە ، واتە : ڕۆژێ کە ئەم هەموو جیاوازی‌یانەی کۆمەڵگای چینایەتی بەرامبەر بە یەك ئەگرێ‌و لە یەك ئاستیاندا دائەنێ‌و بە یەك چاو سەیری هەموویان ئەکا . (ڕۆژ)ەکەیش لەبەیتەکانی پێش ئەم بەیتەدا دەسنیشان کراوە کە چ ڕۆژێکە . (ئەکرێ) لەم شوێنەدا زۆر کۆڵ‌و ناشی‌یانەیە .

لەبارەی بەیتی :

**خۆیشم ، لە بنی بێ‌ئەرزم**
**بۆ تاریکی‌و ترس ئەلەرزم**

(ب ٥ ، ل ٢٧٢)یشەوە ، ئەڵێ : «بنی بێ‌ئەرز کوا هەیە ؟ ڕاستی‌یەکەی وەهایە :

خۆیشم لە بن بنی ئەرزم» .

منیش ئەڵێم : ئەم پارچە شیعرەم لە ڕووی ڕۆژنامەی (ژین)ی ژمارە ١١٦٢ی ١٩٥٣/٨/١٧ نووسیوەتەوە کە ئەو

**سەردەمە مامۆستا گۆران** بەرێوەبەرو بنووسی بوو و هەر **خۆیشی سەرپەرشتیی لەچاپدانی** ئەکرد . لەوێدا بەمجۆرە نووسراوە «**خۆیشم لە بنی** – بێ ئەرزم» . ئەگەر ئەمە هەڵە بێو بەسەر **مامۆستا گۆرانا تێپەڕیبێ** ئەبێ دوو هەڵەی بەجارێ تێکەوتبێ : (بنی) **کە ئەبێ** (بن) بێو (بێ) کە ئەبێ (بنی) بێ . ئەمە **تارادەیەك زەحمەتە** . لەرووی مەعنایشەوە بەئاسانی ئەتوانرێ مەعنای (**بنی بێ**ئەرزم) وا لێبدرێتەوە کە بووترێ مەبەستی ئەوەیە **خۆیشم لە قوولایی** یێکدام هیچ زەویەکی نی یە خۆمی لەسەر ڕاگرمو هەر بەناخدا ئەچمە خوارەوە ، واتە ڕستەکە کینایە بێ لە قووڵیی لەڕادەبەدەری بیرەکەو بارو دۆخی سەختی ژیان تیایا . بەڵام شتێك هەیە لەوانەیە بکرێ بە نیشانە بۆ ڕاستیی بۆچوونەکەی کاکەی فەللاح ، ئەوەیش دانانی کەشیدەکەیە (–) لە چاپەکەی ڕۆژنامەی ژیندا کە مامۆستا گۆران عادەتی وابوو لەنێوان دوو بەشی چونیەکی یەك وشەدا دای ئەنا . من خۆم دەمێکە بۆچوونەکەی کاکەی فەللاحم ، کە لەڕاستیدا بۆچوونی هۆگری کوری مامۆستا گۆرانەو ئەو پێشتر وتوویەتی ، لە تێکستی ڕۆژنامەکەو دیوانەکە لا پەسەندترە .

لەبارەی بەیتی :

**هەوای نەفەس گەروو گیرە**

**قەنارەم قوولاییی بیرە**

(ب ٨ ، ل **٣٧٢)یشەوە** ، ئەڵێ : «وابزانم ئەم (قوولاییی)یە (**قوللاپی)یە**» .

منیش ئەڵێم : ئەمەیش دیمەنێکی‌ترە لە وردنەبوونەوە لە مەعنای شیعر . بەڵێ ڕاستە کرێکاری نەوت بە جۆرە قولاپێکی تایبەتی داهێڵراوەتە خوارەوە بۆ بنی بیر ، بەڵام پێشی هەڵبرراوە بۆ سەر زەوی‌و ، ئەگەر بتوانین داهێڵانەکەی بەو قولاپە بە نیمچە مردنێك دابنێین ، چونکە لە بارو دۆخێکی زۆر سەختا کاری کردووە لە بنی بیرا ، خۆ بە هەڵبرینەوەکەی هێنراوەتەوە بۆ سەر دنیای ڕۆشن . ئیتر چۆن ڕەوایە ئەم قولاپە بشوبهێنرێ بە قەنارە کە مرۆ هەر هەڵئەبرێ‌و تەنها بۆ مردنیشی

هەڵئەبرێ ؟ ! نەخەیر . **هەر (قوولاییی)یەو گۆران بە زمانی کرێکاری** نەوتەوە لە ڕژێمی خوێنمژین‌و **چەوساندنەوەدا** ئەڵێ : بارو دۆخی کارکردنم هەموو ڕۆژێ **مردنێکەو . هەرچەند داپئەهێڵرێمە** خوارەوە بۆ بنی بیر ئەگەیەنرێمە **شەرای مەرگ‌و** ، کارێکی ئەوەندە سەختم پێ‌ئەکرێ لە **حوکمی مردنا بێو** ، **ئەو قوولاییی** بیرەی کاری تیائەکەم لە حوکمی **قەنارەی** کوشتنمدایە . دوو بەیتەکەی پاشەوەی ئەم **بەیتەیش بەئاشکرا** ئەوە ئەگەیەنن کە وشەکە (قوولاییی)یە . گۆران بەم **شوبهاندنە** مەبەستی بووە بڵێ هی‌وا هەیە بە (هەڵبرین) **ئەکوژرێ‌و** ، هی‌وایش هەیە بە (داهێلان)و ناسکی‌و **وردی‌یەکی** هونەرمەندانە لە بەیتەکەیدا هەیە .

لەبارەی بەیتی :

**جەورێکە کراوە لە باوەڕ بـــــە داد ،**

**لە سەربەستیی زانست ، لە بیری ئازاد**

(ب ٢ ، ل **٢٧٥)یشەوە** ، ئەڵێ : «(بە) نی‌یەو (لە)یە . **واتە :**

جەورێکە کراوە لە باوەڕ ، لە داد

لە سەربەستیی زانست ، لە بیری ئازاد

جەورو ستەم لە هەر چواریان کراوە» .

منیش ئەڵێم : با کاکەی بەرێز بەر لە هەرچی سەیرێکی ژمارە ١١٦٥ی ١٩٥٣/٩/١٧ی ڕۆژنامەی (ژین) بکا بزانێ چی نووسراوە ، جا منیش مەعنای بەیتەکەی بۆ لێ‌ئەدەمەوەو ئەڵێم : ئەم تاوانی بە کورسیی کارەبا کوشتنەی ژن‌و مێردی زانای ئەمەریکایی ئەسیل‌و جۆلیۆس ڕۆزەنبرگە ، کە بۆ تۆڵەسەندنەوە لە خەباتیان لەپێناوی ئاشتی‌خوازی‌و دژایەتیی دروست‌کردنی چەکی ئەتۆما کوژران ، تاوانێکە بەرامبەر باوەڕ بە داد کردن ، بەرامبەر بە سەربەستیی زانست‌و بیری ئازاد کراوە .

لەمەیش بەولاوە باسکردنی (باوەڕ) بە موتڵەقی‌و بێ ڕوونکردنەوەی ئەوەی باوەڕ بێ بە چی ، یا نیشانەی ناهوشیاریی سیاسی‌یە یا نیشانەی عەوام خەڵەتێنی‌یە ، چونکە

تەنانەت بکوژەکانی ئەو زانایانەیش باوەڕێکیان هەیە کە باوەڕە بە مافی ئیمپریالیزمو جەنگو دروستکردنی چەکی قڕخەرە ئادەمیزاد بۆ تۆقاندنی گەلانو داگیرکردنی ولاّتیان . جا تۆ بڵێی کوشتنی ئەو دوو زانایە تاوان بێ بەرامبەر بە باوەڕێکیوایش ؟ دیارە ، نەء . کەواتە ئەبێ مەفهوومی ئەم باوەڕە دیاری بکرێ تا هەموو جۆرە باوەڕێکی ڕاستو ناڕاست نەگرێتەوەو ، **گۆرانیش وەك شاعیرێکی** هۆشیارو مولتەزیم وایکردووەو ، **وتوویە : «جەورێکە** کراوە لە باوەڕ بە داد»و باوەڕەکەی بە **موتڵەق نەهێشتووەتەوە .**

**لەبارەی بەیتی :**

**لە ڕێی گوێوە برژێرە گیان ،**

**زیندانم پڕکە لە کۆڵدان**

**(ب ٥ ، ل ٢٨٠)یشەوە** ، ئەڵێ : «ئەم کۆڵدانە ، کە بەزین **ئەگرێتەوە ، تەواو پێچەوانەی** ماناو مەبەستی شیعرو شاعیرە . **لەبەرئەوە (کۆڵدان) نیبەو** (گوڵدان)ە وەك کاك هۆگر گۆرانیش **وەختی خۆی وتی» .**

**منیش ئەڵێم : وانیبە ، چونکە** زیندان هەرگیز ، بە **بەراورد لەگەڵ ژیانی ئازادیدا ، پڕ** نابێ لە گوڵدان . زیندان **جێگەی سەرکوتکردنی ئازادی**و مافی زیندانیبە . ئەگەر **وشەکە (گوڵدان) بێ ، ئەبێ گۆران** مەتڵەبی نەبێ لە زیندان **دەرچێو تەنها کەمێك خۆشکردنی** بارو دۆخی ژیانی ناو **زیندانەکەی مەبەست بێ . ڕاستەکەی** ، وەك لە دیوانەکەدا **نووسراوە ، (کۆڵدان)ە ، چونکە** تا بەرەبەیانی ١٤ی **تەمووزیش زیندانەکەی گۆران بۆ ئەوە بوو** کۆڵ بە گۆرانو **هاوڕێکانی بدا . پاش ڕوودانی شۆڕشیش ئەبوو** ئەو سیستێمە **سیاسیەی گۆرانی بەندکردبوو بۆئەوەی** کۆڵی پێبدا ، خۆی **کۆڵبداو زیندانەکەی لەوە بکەوێ** کە دەسگایەکی **سەرپانکردنەوەی خەباتکاران بێ** بەدەست ڕژێمی نۆکەرو **کۆنەپەرستەوە ، بەڵکو ئەبوو بێ** بە جێگەی ئەوانەی گۆرانو **هاوڕێکانیان زیندانی کردبوو . بۆیە** گۆران ڕووی دەم ئەکاتە **دەنگی لەدوورەوە بەرگوێ کەوتووی** جەماوەری ڕاپەڕیوو **ئەڵێ : نزیك‌بیەرەوە لێرەیش‌و بگەرە ئێرەیش‌و** ، کۆڵ بە زیندانو زیندانەوانەکانمان بدەو ئازادیمان بۆ بگێڕەوە تا بێینە دەرەوە . ئەوەی داوای زیندان پڕ لە گوڵو گوڵدان کردن ئەکا لەجیاتی ڕێ تەختکردن بۆ ڕووخاندنی یەگجاریو هەمیشەی ، نەك هەر شۆڕشگێڕ نیبە ، بەڵکو لە ئیسلاّحیش بەمینیترە . سەد حەیفو مخابن هۆگری کوڕی گۆرانو کاکەی فەللاحی دۆستو برادەری ، هەڵوێستیوا نابارو ناپەسەندی پێ ڕەوا ئەبینن . .

لەبارەی وشەی (ڕابوردوو)یشەوە (یەکەم دێڕی پاش ناوونیشانی پارچە شیعری (بت – بتەوان) ، ل ٢٨٢) ، ئەڵێ : «وشەی (ڕابوردوو) کە ناونیشانی ڕوونکردنەوەی دووەمە ، دوای (بت – بتەوان) کە ناونیشانی سەرەکیی قەسیدەکەیە ، بەشێك یان بەیتێك نیبە لە قەسیدەکە . کێشیشی لەگەڵ بەیتەکانیتردا نیبە . ناونیشانێکە وەك (١٤ی تەمووز)ی دواترەوە . دەبوو بەجیا بنووسرایە» .

منیش ئەڵێم : ڕاستە وایەو ، قسەکەی کاکەی فەللاح لێرەدا زۆر بەجێیە .

لەبارەی بەیتی :

**هەر شەیتان ، بت ، هەر بتەوان**

**برواکانیتر هەموو بان**

(ب ٢ ، ل ٢٨٣)یشەوە ، ئەڵێ : «ئەم (بان)ە (یان)ە بۆئەوەی بێ بە (هەموویان) . هەڵەی چاپە» .

منیش ئەڵێم : ئەمەیشی زۆر بەجێیەو ڕاستە وایە کە ئەو ئەڵێ .

لەبارەی بەیتی :

**دوژمنم : شەیتانی نەگریس**

**ئەمریکا بێ یان ئینگلیس**

(ب ١ ، ل ٢٩٢)یشەوە ، ئەڵێ : «بڕگەیەکی ناتەواوە هەتا

هاوکێش بێ لەگەڵ بەیتی سەوەوەدا (واتە : تا نیو بەیتی دووەم هاوکێش بێ لەگەڵ نیو بەیتی یەکەم – م) . (ئەمریکا بێ) ، (ئەمریکایی بێ)یەو ڕاست دەبێتەوە» .

منیش ئەڵێم : وانی‌یە ، چونکە ئەبێ لەسەرچی (ئەمریکایی) واتە خەڵکی ئەمریکا دوژمنی گۆران بن‌و گۆران دوژمنی ئەوان بێ ؟ ئەمە لە بیروباوەڕی پێشکەوتخوازی گۆرانەوە دوورە . وشەکە هەر (ئەمریکا)یە کە بە وڵات ئەوترێ‌و مەبەست لێی ڕژێم واتە ئیمپریالیزمی ئەمریکایە . (ئینگلیس)یش هەروا . گۆران دوژمنی (ئینگلیز) نی‌یە بە مانای خەڵکی بەریتانیا ، دوژمنی ئینگلیزە بە مەعنای ئیمپریالیزم . بۆ مەسەلەی هاوسەنگی دوو نیوە بەیتەکەیش (گیرە)یەك بخەرە (گاف)ەکەی (ئینگلیس) ، بەوە ئەو ناهاوسەنگی‌یە چارئەکرێ . خۆ ئەگەر (ئەمریکایی)یش بووایە ، (ئینگلیس) سەنگی نیوە بەیتەکەی تێك‌ئەدا ، مەگەر بە (ئینلیس)مان بخوێندایەتەوە .

لەبارەی بەیتی :

**مشتی وەك پۆلای ڕقتان**
**ڕاست‌ئەکەنەوە لەوانەی**
**تەم ئەخەنە شەبەقتان**

(ل ٣٣٣)یشەوە ، ئەڵێ : «ئەم وشەی (ڕقتان)ە (ڕەقتان)ە ، چونکە هەم مشتی بە پۆلا چوواندووە کە ڕەقەو هەم (ڕەقتان) هاوقافیەی (شەبەقتان)ە» .

منیش ئەڵێم : ئەمەیش ڕاستەو هەڵەی چاپە .

لەبارەی بەیتی :

**دڵنیا بوو لە ئەنجامو ، بە بێ‌دەنگ**
**کێشایەوە بۆسێبەری خەوی مەنگ**

(ب ١ ، ل ٣٣٨)یشەوە ، ئەڵێ : «وشەی (کێشایەوە) مانای نایەت‌و ئاڵۆزە . (کشایەوە)یە لە شێوەی پرسیاریشدا نی‌یە» .

منیش ئەڵێم : ئەمەیشی هەروا ڕاستە ، بەڵام نیشانەی پرسیارەکە گۆران خۆی دایناوە ، نازانم بۆ ؟

لەبارەی بەیتی :

**لەوڕۆژەوە جێی پیرەمێـــــرد .**
**(قۆچی تینوو بۆ دەمی کێرد)**

(ل ٣٤٢)یشەوە . کە لە پەراوێزیا نووسراوە : «ئیشارەتە بۆ ئەم شیعرەی پیرەمێرد لە قەسیدەی (هاتن شەهیدەکان)دا :

**من وامئەوێ کە حەشر ئەکرێم خوێن بە بەرگەوە**
**بەو عەشقی میللی‌یەوە ، بە کزەی سۆزی جەرگەوە»** ،

ئەڵێ : «تێ‌نەگەیشتم بۆ ئیشارەتە بە قەسیدەی (هاتن شەهیدەکان ؟» .

منیش ئەڵێم : بۆیە ئیشارەتە بۆ ئەو بەیتە ، چونکە کە لە بەیتە ئیشارە بۆکراوەکەدا بڵێ حەزئەکا بە جلی خوێناوی‌یەوە حەشر بکرێ ، دیارە حەزیش ئەکا بێ بە قۆچی قوربانی‌و ، تینووی دەمی کێردە .

هەر لە مەودای نووسینی لەسەر ئەم بەیتەدا نووسیویە : «(میللی‌یەوە) ، (میللی‌یەو)یە تا کێشەکەی ڕاست بێتەوە» .

منیش ئەڵێم ڕاست‌ئەکا ، بەڵام من بەیتەکەم بەم‌جۆرە لە (پیرەمێردی نەمر)ەکەی دۆستی دووروڵات کاك موحەممەد ڕەسووڵ هاوار وەرگرتووە . ڕاستەکەیشی لام‌وایە زۆر لە شیعرەکانی پیرەمێرد کە لەو کتێبەدا بەچاپ‌گەیەنراون لەنگی‌یان تێ‌کەوتووەو ، ئەبوو بە جۆرێ بنووسرانایەتەوە لەنگی‌یەکانیان ڕاست‌کاتەوە . بۆنموونە ئەم بەیتە بەم‌جۆرە بنووسرایەتەوە :

**من وامەوێ کە حەشرەکرێم : خوێن بەبەرگەوە**
**بەو عەشقی میللی‌یەو ، بە کزەی سۆزی جەرگەوە**

لەبارەی بەیتی :

**لەناو هەزارو یەك گوڵا**
**من هێرۆم زۆر (چۆ) بە دڵا**

(ل ٣٤٣)یشەوە ، ئەڵێ : «وادیارە ئەم (چۆ)یە بۆیە خراوەتە کەوانەوە (ماناکەی) ساغ‌نەکراوەتەوە . (چۆ) نی‌یەو (چوو)ە ، واتە :

**لەناو هەزارو یەك گوڵا**

**من هێرۆم زۆر چوو بە دلا**
**زۆر چۆتە دڵمەوەو پەسەندم کردووە»** .

منیش ئەڵێم : نەخەیر ، مامۆستا گۆران لە دەسخەتەکەی خۆیدا کە لێم وەرگرت کاتێ لە (ئازادی) پێکەوە کارمان ئەکرد ، ئەو (چۆ)یەی خستبوە کەوانەوە . هەر ئەوکاتەیش تێگەیشتبووم کەوا بۆیەی خستبووەتە کەوانەوە تا سەر لەو کەسانە نەشێوێنێ کە ئەیخوێننەوەو بزانن ئەمە شێوەی تایبەتیی سلێمانی‌یەو ئەسڵەکەی (چووە)یە نەك (چوو) ، چونکە (چوو) بۆ ئەم شوێنە دەس‌نادا . کە یەکێك باسی حاڵەتێکی هەمیشەیی‌و بەردەوام بکا ئەڵێ : تۆم چووە بە دلا ، ناڵێ : تووم چوو بەدلا ، چونکە ئەمەی دوایی مەعنای بەردەوامی ناگەیەنێ .

لەبارەی بەیتی :

**بزانن ئەوحەلە من یا ئامۆزا**
**قەلآنتر ئەنوێنین گەردنی رەزا**

(ب ٩ ، ل ٣٨٢)یشەوە ، ئەڵێ : «وشەی (قەلآنتر) مانای نایەت . (قەلانترە) واتە دانەواوتر . گەردن قەلان‌کە = گەردن دانەوێنە» .

منیش ئەڵێم : ئەگەر مەعنا نەهاتنەکە لە جیاوازیی (ل)ی (قەلآنتر)و (قەلانترە)وە بێ ، ئەوا من دانی پیائەنێم نەمزانیوە وشەکە بە کام‌جۆر راستەو پارچە شیعرەکەیشم لە رۆژنامەی (ژین) وەرگرتووە کە هیچ ئیشارەتێکی (٧)ی تیا بەکارنەهێنراوە . ئەگەر لەبەرئەوەیش بێ کە راستەکەی وەك کاکە نووسیویە (قەلآنترە) بێ بە زیادەی ئەو تیپی (ە)یە لەدوایی وشەکەوە ، ئەوە من لاموایە هەڵەیەکی زەقەو نیوە بەیتەکەی پێ لەنگ ئەبێ‌و شوێنی وشەکەیش لە رستەدا دیار نی‌یەو نازانرێ (ە)ی (قەلآنترە) بۆکام سەرچاوە ئەگەڕێتەوە .

لەبارەی بەیتی :

**ناڵێم : مەخۆن ، چێش لە خواردن**
**چێش لە ورگیش پەتی کـــــردن**

(ب ٦ ، ل ٣٨٤)یشەوە ، ئەڵێ : «وشەی (پەتی) هیچ مەعنایەك نابەخشێت . بەڵکو (بە تێ)یە ، یانێ : چێش لە ورگیش بە تێ‌کردن ئەتەقێت» .

منیش ئەڵێم : بەپێچەوانەوە ، بۆچوونەکەی کاکە هیچ مانایەك نابەخشێ بۆ ئەم شوێنە دەس‌بدا . یانی‌چی «چێش لە ورگیش بە تێ‌کردن ئەتەقێت» ؟ بۆچی ئەو نوێنەرە ساختانەی پەرلەمان‌کە مردووە ناو بۆ دەنگ‌دان زیندوو کراوەکان قسەیان لەگەڵ ئەکەن لەم پارچە شیعرەدا ، بە تەقاندنی ورگی خۆیان زیان لەگەڵ ئەدەن تا گۆرانیش بە زمانی مردووەکانەوە پێ‌یان‌بڵێ قەی‌ناکا چەند ئەخۆن تا بتەقنەوە بخۆن ، کەس رێتان لێ ناگرێ ؟

مەعنای بەیتەکە پێوەندی بەوەوە هەیە کەسانی تەماڵ‌و مفتەخۆر ، وەك دەرەبەگەکانی نوێنەری پارلەمانە ساختەکان ، تا مرئەبوون ئەیانخواردو ورگیان ئەئاخنی . . جا لەتاو گەدەتا پشتێنیان ئەکردەوەو سکیان لێ بەرەڵلا ئەکرد . گۆرانیش کە باسی ئەو نوێنەرە ساختانە ئەکا پێ‌یان‌ئەڵێ : هەرچەند ئەخۆن ، بخۆن . چەندتان حەز لێ‌یە ورگتان رووت‌و بەرەڵلا بکەن . . من تەنها ئەوەندەم لێتان ئەوێ مادەم بە دەنگی مردوو بوون بە نومایندەی پارلەمان ، وەك مردوو کروکپ‌و بێ‌دەنگ بن . جا نازانم ئێستا دەرکەوت (پەتی) مەعنا ئەبەخشێت ، یا هێشتا هەر دەرنەکەوتووە ؟ !

لەبارەی بەیتی :

**دۆڵی کپ‌و چەمی خورت**
**دارستانی زەبەندو چرت**

(ب ٤ ، ل ٤٠١)یشەوە ، ئەڵێ : «(نیوەی دووەمی بەیتەکە) لەگەڵ ئاوازە تایبەتی‌یەکەی ئەم سروودە نایەت ، چونکە برگەیەکی کەمە . لەبەرئەوە وشەی (دارستانی) ، (دارستانانی)یە» .

منیش ئەڵێم : راستە وایە وەك کاکە نووسیویەو ، لە دەسنووسەکەی لای خۆیشما کە لەرووی دەسنووسی گۆران خۆی نووسیومەتەوە هەر (دارستانانی)یە ، هەر لەبەرئەوە کە

گۆران لەبەر ڕاگرتنی سەنگی نیوە بەیتەکە وایوتووە ، ئەگینا کوردییانەتر ئەوەبوو (دارستانی) بووایە وەك (لووتکەی)و (نزاری)و (دۆڵی)و (چەمی) کە جەمعی نەکردوونەتەوە . چونکە ئەم جۆرە ئیسمی جینسانە پێویسیتان بە جەمع کردنەوە نی یە .

لەبارەی بەیتی :

**بگرمێنە وەك شێر ، بچۆ ناوی بەرد**

**بڵێ : کوا هەق ژینی ئینسانی مەرد**

(ب ۷ ، ل ٤٠٣)یشەوە ، ئەڵێ : «(بچۆ ناوی بەرد) هەر زۆر بێتامە ، ڕاستییەکەی ئەوەیە کە لە پەراوێزیدا بەگومانەوە نووسراوە «بچۆرە نەبەرد» واتە : بچۆرە جەنگەوە .

منیش ئەڵێم : لە دەسنووسەکەی گۆران خۆیا (بچۆ ناوی بەرد) نووسرابوو ئەگینا منیش ئەوەم لا جوانتر بوو وەك لە پەراوێزەکەدا نووسیومەتەوە . کە شیعریش شیعری گۆران بێ‌و خەتیش هەر خەتی خۆی بێ ، ئەبێ من‌و کاکەی فەلاح بە چ هەقێك بۆمان ڕەوا بێ دەسکاریی بکەین ، مەگەر بە هەق دەسدرێژیی‌و ئارەزووبازی . . لەوانەیشە مەبەستی گۆران لە چوونە ناوبەرد پەنابردنە بەر چیاو سەنگەرو بەردەلآن بێ‌و ، بەم مەعنا گۆران هەر لەو سەردەمەوە گەلێ لە ئێمەمانان دوورتر بیری کردووەتەوە .

لەبارەی بەیتی :

**ئاهەنگی نەورۆز تۆز ئەکەم**

**نەورۆز ئەکەم ! نەورۆز ئەکەم**

(ب ۳ ، ل ٤٠٥و چەند جاریتریش لەو پارچە شیعرەدا دووبارە بووبێتەوە)یشەوە ، ئەڵێ : «هیچ مانای نایەت‌و ئاڵۆزو شێواوە . لە هەموو بەندەکانیتردا ئەم (تۆز)ە دووبارە بووەتەوە ڕاستیێکەی (قۆز)ە ، واتە ئاهەنگەکەی نەورۆز شەنگ‌و قۆز ئەکەم‌و زۆر خۆش‌ئەکەم» .

منیش ئەڵێم : کاکەی فەلاحیش وەك هۆگر ڕاستی بۆچووەو ، لە دەسنووسەکەی لای خۆیشمدا هەر (قۆزئەکەم) نووسراوەو . بە هەڵە لەو نوسخە دووەمەدا کە خستوومەتە بەرچاپ نووسیومە (تۆزئەکەم)و بەوجۆرە لەچاپدراوە . وەختی خۆی لە وەلآمی هۆگریشدا دانم پیانا کە هەڵەی منە . وادیارە کاکە زۆر مەبەستیەتی ژمارەی ئەو هەلآنەی درەنگ‌وەخت ، ئەیاندوزێتەوە . تا پێی‌ئەکرێ ، زۆرتر بێ !

لەبارەی بەیتی :

**وەك ئاڵتوون زەردە**

**پاك‌و بێگەردە**

(ب ۳ ، ل ٤٢٧)یشەوە ، ئەڵێ : «بەم پێنج برگەیی یە لەگەڵ ئاوازە تایبەتییەکەی ئەم سروودەدا ڕێك‌ناکەوێت . ئەم بەیتە چوار برگەیی یە بەم‌چەشنە :

وەك ئاڵتوون زەرد

پاك‌و بێگەرد»

هەروەها لەبارەی بەیتی :

**ئەیگرێ خوا**

**هەر کەسێ بیخوا**

(ب ٦ ، ل ٤٢٧)یشەوە ، ئەڵێ : «لە خوێندنەوەدا لەنگەو دێڕی دووەمیش لەگەڵ ئاوازەکەیدا ناگونجێت . جا بۆئەوەی هەردوو میسرەع وەك یەك چوار برگەیی بن پێویستە وشەی (هەرکەسێ) بێ بە (هەرکەس) . ئەسڵی شیعرەکەش هەر وایە» .

منیش بەرامبەر بە هەردوو بۆچوونەکەی کاکەی فەللاح ئەڵێم ڕاست‌و بەجێ‌یە .

لەبارەی بەیتی :

**بەرازی شەخەڵی کۆ**

**دوژمن نەیخوا گەنم‌و جۆ**

(ب ۷ ، ل ٤٢٨)یشەوە ، ئەڵێ : «پێم‌وایە وشەی (شەخەڵی) ، (شێخەڵی)یەو بەریزە دەرونمی (؟) چڕ دەڵێن لە لادێ کە بەرازو جانەوەریتر خۆیانی تیا مەلآس‌و حەشار ئەدەن» .

منیش ئەڵێم : لەو ناوچەی شارەزوور هەورامانە (شەخەڵ) ئەڵێن‌و گۆرانیش خەڵکی ئەو ناوچانایە .

لەبارەی بەیتی :

**هەرچەند عابیدین لە ماڵ دەرئەچوو**
**ئەو خۆی ئە کووپە ئەگەیاند زووزوو**

(ب ٥ ، ل ٤٧٥)یشەوە ، ئەڵێ : « (ئەکووپە) ، (لە کووپە)یەو دیارە هەڵەی چاپە» .

منیش ئەڵێم : لە رۆژنامە (ژین)ەکەیشدا کە مامۆستا گۆران ئەم پارچە شیعرەی تیا بڵاوکردووەتەوە ، هەر بەوجۆرەیە کە لە دیوانەکەدا نووسراوەو ، راستیشە ، چونکە لە زۆر ناوچە ئەوترێ «خۆی گەیاند ئە ماڵەکە»و تەنانەت کە ئێمەیش ئێستا ئەڵێین «خۆی گەیاندە ماڵەکە» ئەسڵەکەی «خۆی گەیاند ئە ماڵەکە» بووەو سووك‌و ئاسان کراوە . کەواتە ئەوەی لە دیوانەکەدا نووسراوە راستەو نە هەڵەی چاپەو نە هەڵەی نووسینەوە .

لەبارەی ئەو بۆچوونەی کاکەیشەوە کە نووسیویە : «بەپێی بۆچوونی خۆم واتێ‌ئەگەم کە بەشی دوایی شیعرەکەی (داستانی هەیاسی‌و کاکە عابیدین) ، واتە بەندی دوایی کە لەم دێڕەوە دەست پێ‌ئەکات :

لەم سەرگروشتە نیازم پەندە

هەر بەتەواوی هی مامۆستا گۆران خۆی بێت‌و لەژێر پەردەی ئەو وەرگێڕانەدا ، لەو رۆژگارەدا ئەو هێرشی‌یە ( ؟) بیری‌و رامیاری‌یەی کردبێتە سەر ئیمپریالیزم‌و داردەستەکانی ئەو سەردەمە» .

منیش ئەڵێم : کە گەڕامەوە سەر کتێبی (کلیات مصور عشقی در شش کتاب)و لە لاپەڕە ١-٤ی (کتاب پنجم)یدا ئەم پارچە شیعرەم تەماشاکرد ، بۆم دەرکەوت ئەو چەند بەیتەی کاکە باسی کردوون ، دوو بەیتی دوایی‌یان نەبێ ، هەموو هەر هی عیشقی خۆیی‌و ، بەڵکو گۆران بەشێکی زۆری لە دوایی ئەو پارچە شیعرەوە وەرنەگێڕاوە ، چونکە پێوەندی بە خوێندەواری کوردەوە نی‌یە .

* * * *

ئێستا کە لە پیاچوونەوەو هەڵسەنگاندنی بەسەرکردنەوەو سەرنجە درەنگ وەختەکانی کاکەی فەللاح ئەبمەوە ، ئەبێ رووی دەمی تێ‌بکەم‌و پڕ بە دڵ پێی‌بڵێم : سوپاس ، سوپاسێکی زۆر ! چونکە ، هەرچۆن بێ ، ئەویش ، وەك هۆگری کوری مامۆستا ، چەند هەڵەیەکی راست‌کردەوەو ، بەمە کارێك کرا ئەگەر جارێکی‌تر دیوانەکە لەچاپ‌درایەوە ئەو هەڵانەی لێ دەربکرێ . هەروا چونکە لە لایەکی‌تریشەوە بوو بە هۆی ئەوە کە لەوشوێنانەی تیایانا بەهەڵەچووە ، لە رێگای راستکردنەوەی هەڵەکانیەوە دەرفەتی ئەوەم بۆ بلوێ چەردەیەك لە مەعناو رازی هەندێ شوێنی چەند شیعرێکی گۆران بکۆڵمەوە . بەڵام نایشێ ئەوە بشارمەوە کە پڕ بە دڵ متمانەم هەیە کاکەی فەللاح بۆ وێنەی شیعری نەگەڕاوە – وەك خۆی ئەڵێ – تا ئەم هەموو هەڵە راست‌و ناراستانە بدۆزێتەوە . بەرو دوای مەبەستی کاکە گەڕان بووە بەدوای هەڵەدا بۆ هەڵەگرتن لە من . بۆیەیش ئەڵێم متمانەم هەیە چونکە ئەقڵ نایبڕێ دیوان لە ١٩٨٠دا دەرچووبێ‌و کاکەی فەللاح سەرەڕای دۆستایەتی‌و هاورێ‌یەتیی گۆران ، خۆیشی لە ئامادەکردنی دیوانەکەدا بە هاوبەش بزانێ‌و لەگەڵ ئەوەیشا تا ساڵی پار چاوێك بە دیوانەکەدا نەگێڕێ ، بەڵکو لەمەیش زیاتر هۆگری کوری مامۆستا گۆران لە مانگی ئابی ١٩٨٢دا وتارێکی بڵاوکردبێتەوە کۆمەڵێ هەڵەی لە دیوانەکەدا تیا دەسنیشان کردبێ کە لە بەشێکیانا لەگەڵ کاکەی فەللاحدا هاودەنگ بێ‌و ، منیش لە حوزەیران‌و تەمووزی ١٩٨٣دا بە دوو وتار وەڵامم دابێتەوەو تەنانەت ئەمەیش گوێی کاکەی نەزرنگاندبێتەوەو ئەم هەموو رووداوانە وەك با بە لای گوێ‌یا تێپەر بووبن . . لەگەڵ ئەمەیشا دیسانەوە ئەڵێمەوە : سوپاس‌و ، چاوەڕوانم هەر برادەرێکی‌تریش بتوانێ ئەم چەشنە بەشداری‌یە بکا ، درێغی و کەمتەرخەمی نەنوێنێ .

# کاروانی ئێمە

○

دوکتۆر عیزەدین مستەفا رەسوڵ

○

«. . . . بەهاری ساڵی ١٩٨٠ بوو ، لەگەڵ هەندێ قوتابیی بەشی کوردیی ئادابی بەغدادا بۆ گەشتی زانیاری روومان کردە کوردستان ، ئەو دەشتە پانو بەرینەی نێوان هەولێرو ئاکرێ سەوز ئەچۆوە ، لە میکرۆفۆنی ئۆتومبێلەکەدا ، قوتابیان گۆرانیان ئەووت ، منیش شیعرم بۆ خوێندنەوە ، دیمەنی وولاتو یادی رابردووو تێ‌بینی رۆژو ئەو شیعرە کۆنانە هەر لەویدا ئەم چەند دێرەی خستە سەر کاغەز ، کە پێداچوونەوەو ئیشارەتو شوێن پەنجەو یادی شاعیرانی وەك : «نالی ، سالم ، سائیب ، ئاتیق ، سەلام ، مەحوی ، گۆران ، مەولانا خالید ، کوردی»ی دووا بەدووای یەك تێدا کۆ ئەبێتەوە .

وا بەهارەو لێشاوی چاوی ئەم حاکە
هەمووی ئاوی شیوە سووورە[1]
هێشتا گەمی بەی سلێمانی
شوێنی فەنەری
دەریای خوێنی شارەزوورە[2]
هێشتا خۆڵو عەبیرەکەی
دوورە یۆلی
رەهەندەی حومسو شادانە[3]
هێشتا ژیانی ناکامی
لای هوشیارانی بێ‌هۆشمان
هەر مەیخانەو خەراباتە[4]
دڵی ژارمان .
خۆزگەی ئەمساڵمان بە پارمان
بەکرەجۆی لەشكو ئازارە[5]
هاواری تەق‌تەقی‌کەرەشمان[6]
دروشمی سەدساڵەی خەوی
«باوەگێڵدی» گەیە شارە[7]
* * * * * * *
کاروان ئێستا ئامادەیە
چاوەڕێی هاتنی یارە[8]
* * * * *

* پەراوێز :

[illegible]
(١) نالی ، (٢) سالم ، (٣) نالی ، [illegible] ، (٤) مەحوی ، (٥) گۆران ، [illegible]
(٦) شێخ سەلام ، (٧) مەولانا ، (٨) گۆران .

# ئافره‌تێك

# به‌ چرپه‌ ووتی

كه‌ژاڵ ئه‌حمه‌د

له‌ بیلبیله‌ی چاوی برینێكی كۆنه‌دا
ئازارێك به‌ چرپه‌ ووتی :
من ئافره‌تم
ئه‌م شه‌و ژنێك ژان ئه‌یگرێ
بمرێ ئه‌مرم
له‌ئاوێنه‌ی نیگا شه‌كه‌ت بووه‌كه‌یدا
وێنه‌ی ئه‌و پیاوه‌ ئه‌بینم
كه‌ له‌ باوه‌شی خه‌ودایه‌و
تا به‌یانی له‌ جیاتی ئه‌و نێشك ئه‌گرم
ئه‌م شه‌و یادی خۆش ویستنه‌
من سه‌رنجی كۆنه‌كانی
ده‌ستی دڵداره‌كه‌م ئه‌ده‌م
ئه‌ویش سه‌یری
ئه‌و فرمێسكه‌ ویڵه‌ ئه‌كا
كه‌ به‌ نه‌زمی زڕه‌ی زنجیره‌كه‌ی قاچم
دائه‌بارێ
ئه‌و ساتانه‌ی سه‌ما ده‌كاو سه‌ما ده‌كه‌م
ئه‌م شه‌و شه‌وی بووكێنیمه‌و
جلی سپیم له‌به‌ر ئه‌كرێ
ئه‌م شه‌و كچه‌كه‌م نه‌خۆشه‌
له‌ ناو ده‌ستی بچكۆله‌ی دا
به‌ سۆزه‌وه‌ دڵم ئه‌گوشێ
من بشتاشیكی سه‌وزم
چه‌ندان ساڵه‌ ئه‌سه‌ر جوانیما هه‌ڵئه‌درێ
بسوسه‌كانتان بشكێنن
كه‌س وه‌كو خۆم
مێژووی بوونم تۆمار ناكاو
رۆمانی خه‌م نانووسێ
له‌ چوار چێوه‌ی
ئه‌وره‌ نه‌سكه‌كه‌ی جاراندا بۆم مه‌كه‌رێ
ئیستا هه‌وری ئاسمانێكم
عیشق و شیعرم لێ ئه‌بارێ

- - - - - - - - -

به‌ سه‌رنجێك لێم ئه‌پرسێ
كوانێ پرچه‌ ره‌نگ ره‌شه‌كه‌ت ؟
كه‌ی هه‌ڵوه‌رێ ؟
منیش زمانی بێ ده‌نگم زوو پێت ئه‌ڵێ
ئێواره‌یه‌ك فرۆشتم و
په‌رتوكێكم بۆ تۆ كڕی
ته‌مه‌ن ده‌رواو
من به‌بێ تۆ گورگ ده‌مخوا
تۆش به‌بێ من توانات نابێ
خۆر دابگرێ
گێژاوه‌كانی سه‌ر زه‌مین
لوولمان ئه‌دا
ده‌ستم بگره‌ باوون نه‌بم
باوون نه‌بێ

مەلا مسعود بێبەش

# پێنج خشتەکی لەسەر هەڵبەستی احمد مختار جاف

خومارو مەستی دوو چاوی سیاتم
سوتاوی ئاگری عەشقو جەفاتم
لە دوور هاتووی غەریبی دوور ولاتم
دەمت بێنە بە قوربانی وەفاتم
قەبوولمە من لە جێی مووچەو بەراتم

* * * * * * *

نەخۆشم، کەوتووم زۆر دەردەدارم
پزشکی دەردی عەشقم تۆی نیگارم
لە دڵ ڕۆیی نەما سەبرو قەرارم
لە هیجرانا ئەوا ڕەنجوورو زارم
وەرە بالین هەتا ماوە حەیاتم

* * * *

هەزار سووندم بە ئەو دوو چاوە مەستە
لە دونیادا بە تەنیا تۆم مەبەستە
ئەوەی دەیێنم بە قوربان هەندە بەستە
هەموو کەس وەسفی یاری خۆی لە دەستە
بە غەیرەز من کە هەر جوێنە خەلاتم

* * * * * *

لە دووری تۆ گەلێ دڵ داغدارم
لە بۆنێ هەر خەریکی ئاهوزارم
وەکو شێت ڕوو لە دەشتو دووری شارم
لە تەختەی نەردی غەمدا ئەی نیگارم
خەریکی شەش دەری هاتو نەهاتم

* * * * * *

چییە چارێکی بتبینم بە تیری
کە دێمە ڕوو بە ڕووت خۆم لێ نەشێری
لە (بێبەش) تا بەکەی قوربان زوێری
ئەڵێی (احمد) لە کوشتن ڕوو دەگێری
لە بەحثی عەشقدا من زۆر بەزاتم

* * * * *

## «نازە» شیعر

○

نەوزاد عەلی ئەحمەد

**١ - «سائێك»**

لۆخرانی ساتە وەختێکە
بەرەو گیانی چاوەڕوانیم دەربەست نابێ
بیبەرەوە، با دەفەری فریشتەکان،
بەقەد باڵامان ئاوابێ

**٢ - «باران»**

لە گەڵ ئەمەی ئەم بارانە وەدەرکەوتێ
باران ئەمڕۆ لە تۆدەچێ
عەشقێکی گەش. لەبەر دەرگا،
تێکەڵاوی خوێنت دەبێ

**٣ - «مرۆڤ»**

مرۆڤیتو،
عەشقت هەنگاوی ئەمڕۆمە
کەتۆ هاتی،
دەستیان لە مردنم هەڵگرت
لە خەڵوەتی شەوانەدا،
گۆڕ دەستێ لە ژیانم دەشوشت

**٤ - «عەشق»**

ڕۆژگار بە بێ کۆتایی یە،
عەشقیش هەروا
لە گەڵ دەریای ژیان دەڕوا

# لێڤە نابم ...

**ئیسماعیل تاها شاهین**
**١٩٨٥/٨/٣١**

م دگۆتو دیسادبێژم
ژ هەمی دلێ خوە حەژ تە دکم
سەرپشکا کچکێن کچین !
سترانەکی
د شەڤبێرییان دە تیێیە گۆتن
ڤیانەکی
ژبلی من
هەزار ئەڤیندار تە سۆتن
م دگۆتودیسا دبێژم
ڤیانا تە فێری نەڤیانێ کرم ،
خستمە ڤیانا بێ ب ڤیان .
نەچارکرم هۆ ببێژم !!
م دگۆتودیسا دبێژم
زمان هەمی لبەر تە لالن

سەر هەمی هێبەتیو گێژن
دەنگبێژ د خوەرە نابینن
ڤیانا تە دەرەهی کن

لەورا ستران . .
ئاڤا رووێ وان درێژن
م دگۆتودیسا دبێژم
زینا مەم سەوداسەر کری
ئاڤا مەزن باخێڤت
شەما دێوانەیێ رەبەن
خستیە بەندا جافو گۆران

شەرمە ب خەملا وانبسترێم .
سەرا بسکێن تە یێن ب رەوا
دنیا هۆ مژو مۆران . .

# بمکوژه ..
# ئەوسا جێم بێڵه

مۆمێکی تری ئەمەنم
داگیرسانو
هەر دیار نەبووی
تاڵیم پرسی : بۆ وا ماتی ؟
نە «با» هەواڵی تۆی پێبوو
نە لەگەڵ بارانا هاتی . .
وەك کۆچەری دەوار بەکۆڵ
هەرگەرمیانو کوێستان ئەکەم
ئای لەخەمی بێ وولاتی ؟

* * * * * * * * *

دە وەرەوە
خۆ تائێستا
سەفەرێکم نەهاتە بەر
کۆچەکەی بەرەو ژوور نەبێ
بمتوانیایە . .
رێگاکانم ئەپێچاوە
هەر بۆ ئەوەی
ماوەی نێوانمان دوور نەبێ . .

* * * * * * * *

دە وەرەوە
بائەوەندە بێ تۆ نەبم
کەتۆ وونبی
منیش وونم نامۆ ئەبم
دە وەرەوە
گەر ئەمجارە ویستت برۆی
ویستت تەنیا بە جێم بێڵی
بمکوژە ئەوسا جێم بێڵە . .
بازریانیش لاشەم لەگەڵ خۆی راپێچێ
بلێی کوژراو گوێ بداتە
سەرماو بارانو رەهێڵە ؟

○

**فەرەیدوون عەبدول بەرزنجی**
**هەولێر - زستانی ١٩٨٧**

پێنج خشتەکی لەسەر غەزەلی مامۆستا مخلیص

# گەر گوڵی .. من بلبلم

•

محمد حمه امین
- ئاودێر -

•

من وەکو مەنگ مەستی شیلەی ئەو دەم و لێوانەمە
تۆ شەمی و بۆ کڵی باڵات من وەلی دێوانەمە
تۆ شیرینی و هەرمن فەرهادی ئەو کێوانەمە
گەر گوڵی من بلبلم وەر ئاتەشی پەروانەمە
خۆ ئەگەر لەیلای منیش مەجنونی ئەو چاوانەمە

* * * * * * * * *

دێڵ و ڕێبوارم لە دووی تۆ دەشت بە دەشت و شاخ بە شاخ
من لە داوی عەشقی تۆدا ، زۆر هەڵم کێشاوە ئاخ
سۆزو تاسەی خۆشەویستیت ئاگری بەردامە ناخ
لێم گەڕێ بابێم تەماشای باخەکەت کەم سینە باخ
چەند دەمە موشتاقی سێو و خۆخی ئەم بوستانەمە

* * * * * * * * *

پێم بەخشە ساچی لێوت هەر دەڵێی ئەو غونچەیە
کاتی سەیرانەو بەهارە ناو گوڵان پڕ نەغمەیە
خۆشەویستیت چەشنی باران زۆر بەهاژەو ڕێژنەیە
ڕۆژی ئیحسان و خەڵات بەخشینە ئیمڕۆ جەژنەیە
بیکە سندوقی سەری خۆت چاوەڕێی جەژنانەمە

* * * * * * * * *

ئەی پەری ڕوخساری لێو ئاڵ هەدەرێ نیشوی سەفەر
تابڵێم ئۆخەی بەجارێ ڕەنجی من واهاتە بەر
بێ سرەوتن پەی دەکەم بۆت خاکی کوردان خوارو سەر
شار بە شارو دێ بەدێ کوچە بە کوچە دەربەدەر
ڕۆژو شەو دێم و دەچم وەك مورغی بێ هێلانەمە

شیعر هەردی خاکو خۆڵو . . . .
دەنگو سەدای شارەزوورە !
شیعر ئەسیری حەبیبەوە . . .
فرمێسکی شەوی دەیجوورە !

* * *

شیعر سینەی فەرخۆڵەیەو . . .
(خاتونەستێ)ش قەڵغانیەتی !
شیعر دەنگی فەقێ حمدەو . .
هەر هاواری کەیفانیەتی

* * *

شیعر ئاوازی ئاهەنگی
بەزمو کۆڕی باسەفایە
شیعر کەژاوەی ڕازاوەی
بووکی پاییزی یەڵدایە

* * *

شیعر هاواری فریادی
خولیاو پەیامی دولبەرە !
شیعر کلیلی مرادی . . .
وەتاغی داخو کەسەرە ! !

* * *

شیعر ڕەهێڵەی بارانو . . .
بەفری یەکشەوەی قەدپاڵە
شیعر تارای ڕەنگاو ڕەنگی
بووکی جوانی وەرزی ساڵە

* * *

شیعر تەزووی بوومەلەرزەو
دەنگی بروسکەو گرمەیە !
شیعر زەنگی کارمامزی
گەرمەسێرو سەگرمەیە ! !

* * *

شیعر هەناوی بێستوونو . . .
سەنگی فەرهادو شیرینە ! !
شیعر جزیرو بۆتانی
کاکە مەمو خاتو زینە ! !

* * *

شیعر زەریایەکی پانو . . .
فراوانی بێ سنوورە . . !
شیعر سەربارو بن باری
کاروانی کۆچێکی دوورە

* * *

شیعر تەقینی سەرچاوەی
خۆخواردنەوەو گینگڵ دانە . .
شیعر ژانە . . زانە . . نانە ،
دوا ووچانی کۆڵ نەدانە ! !

* * *

شیعر شەیتانی ئارەزووی
بابادەمو داکاوایە ! !
شاعیریش هەتا چاوبڕکا . . . .
مەرزی شیعری دوایی نایە ! !

* * * * *

# سێ ست...

●

زیاد نقیب بروارى

●

— ١ —

لێ لێ جانێ . . .
وەزێ هەرم
ل بنیا دارێ
ل سەرێ مێرگێ
ژ بو بەژنا زراڤ
مینا بەژنا سپینداری
کەزی وبسکێن
مشتی بێهنا
گول خوناڤێ
دێمێ کەڤەر
مینا بەفرا
ل سەر چیاکێ سپیانێ
هوزانەکێ . . .
سترانەکێ . . .

## ـــران

ـميم وڤەلورينم
ـا تەڤ نەحەز وبەكروكێن
ـ ڤێ جيهانێ . .
ـاش بزانن
ـهۆ دەلالێ . .
ـوى وهەر توى . .
ـيرگر وبەيبوينى
ـند وخەتيرى
ـو ڤى دلى
ـيرەبانێ . . .

— ٢ —

ـێ لێ جانێ . . .
ـەڤيندارەكێ مەستم . .
ـەيدائێ

جوتێ خالێن
رەشم . .
داخبارێ
هەر دو چاڤێن
كەلەشم . . .
ئەگەر هات و . .
چەرخا فەلەكا هار
لئەڤينا من وتە
بو ڤە نەيار . .
چ جارا نە بێژە
حەودا دلێ من ما بەيار
ئەڤە هوزانێت من
دەنگ وئاوازێت من
بو تە . .
بيرهاتن ويادگار . .
دگەل كەڤوكا
رەڤێن كەوا . .
ل هنداڤ مێرگا ئەڤينا مە .
ژ نيڤا دلى
ڤەلورينە . .
ئو چ جارا . . .
ژكەلا ئەڤينا خو
نە هێيە خار . .

— ٣ —

لێ لێ جانێ . .
سيارەكێ خورتم . . .

تەڤ پێلێن توند ودوژوار
د شەڤينم . .
ل بيابانا
دەشتێن هشك وبەيار . .
رێڤنگەكێ مەستم
يێ بێ بەڤلم . .
تەڤ كاروانى
درى يا م دا
ژ م دپرسن و . .
دبێژن . .
لاوێ چەلەك . .
چ ما يارێ لەزێى . .
هاژ خو هەبە
دەهبە و درند . .
ل ڤان كنارا
دپرن . .
هەيهۆ جانێ . . !
ئەو نزانن
ژ سەخمەراتى
ئەڤينا تە . . ديتنا تە
سيامەندم . .
ل چ ئاستەنگا
نا ڤەمينم . .
ژ بو بيناهى يا . .
هەردو چاڤێن تە . .
مرنێ دكرم . . !
مرنێ دكرم . . !!

# تاجا جیهانێ

شرین جانێ
تو نەزمینە
ئەگەر ڕوژەکێ ژ ڕوژا
هەمی زانا و شارەزایێت
ڤێ جیهانێ
کارێ خو
دا
ئەو تاجا ڤێ جیهانێ
داڵن سەرێ
خەمل شەنگا باغێ ژیانێ
ئەگەر بێژن
دێ دانینە ل سەر سەرێ
گەلاڤێژا سپێدەهی‌یا
ئەوە ڕەوشا ڕوناهی‌یا
وندا دکەت م تاری‌یا
دێ بێژم وان هەژی نیە
ژبەر ڕوژێ خودڤە شێرێت
ڕوژێت نێڤرو دیارە نیە
ئەگەر گوێ
دێ دانینە

سەرێ گولا لناڤ چیا
پڕ ژرەنگە سپەهی‌یە
لجانێ کەس ناگەتێ
جارەکادی
دێ بێژم وان
هەژی نیە
ژبەر سەرما زڤستانا
ئو بارانا
خەملا حوزیکا دوەریت
کەس نابینیت
ئو دێ بێژم
ئێ هەژی تاجا جیهانێ
شرین جانە
ناڤ گرانە
شوخ و شەنگە
پڕ ژرەنگە
خەمل کراس و فیستانە
شرین جان
کچا کوردانە

هاشم ڕێکانی

# چیرۆکی «زمان بەڵای سەرە»

رۆستەم باجەڵان

ەڵێن : لە دێرینەوە
ە خاکی زێڕینەوە
ە دێیەکی ناو شاخان
کۆمەڵێ خەڵك دەژیان
ەگێڕنەوە : لەم دێیە
ەم هەوارگەو لەو رێیە
ڵی دوو لاوی چەتوون
ئەیدای شۆخە کچێ بوون
اخۆشی سەری هەڵدا
عیشقە سەرێکی پەلدا
ەوەبوو : (کاکە چەتۆ)
ورزا بە دەسی (حەمۆ)
سالآن ! حەمۆی بەد ناو
ەرەو کۆسار نای هەنگاو
ەوێرا لە ترسی (بەگ)
ۆقەرە بگرێ بەهیچ رەنگ
بووە وێڵی شاخو داخ
ەروونی پڕ بوو لە ئاخ
ەم جۆرە ساڵ سوڕاوە
ەر دەگەڕا لەم ناوە
ەڵی : گۆڕانێ بە ناو

سەری هەڵدا لە ناکاو
کەلاکێکی ئینسانی
کەوتە بەر دیدەکانی
لە بەر خۆیەوە (حەمۆ)
کەوتە قسەو گفتوگۆ
بە کەلاکی ووت : تۆ کێی ! ؟
خەڵکی شاری یان لادێی ! ؟
پێم نالێی : شەڕە ، خێرە
کێ دڵتی وەستاند لێرە ؟ !
کەلاکە هاتە کەنین
بە سێ چوار ووشەی بەتین
یەکسەر وەڵامی داوە
ووتی : گوێ بگرە (باوە) !
«ئەوەی بەسەری هێنانم
زمان بوو ئێستا زانیم»
منالینە ! حەمۆی رەند
ئەم وانەی نەکردە پەند
سوودی نەبەدی . وایزانی
لەم دیمەنە دەتوانی
(بەگ) ڕازی کا بێ بەخشی
لابەرێ بەختی ڕەشی ◁

# روژا دویماهیێ

سالمێ جاسم

١٩٨٥ – بەرلینا روژئاڤا

باپیرێ مە ، یێ وەكی بڤرێ مەلای . . هەروەكی تو ژ ڤی دەستی بكەیە ددەستەكێ دیدا . ژ نشكەكێ‌ڤە نەخوش بو : سەر ، پشت ، دەست و پیێ هەمی لەشێ وی ب‌جارەكێ دئێشا . . ب راستی مە چ جارا باوەر نەدكر ، كو باپیر دێ هوسا زوی كەڤیت و دێ ب‌ڤی رەنگی نەخوش بیت . ڤێجا مە دەست‌پی‌كر ژڤی دختوری ببە دختورێ هەو هەمی دبێژن چ لێ نینە و یێ ساخە .

وەختێ هندەك جارا من باپیر دڤی حالی‌دا ددیت ، دلی من گەلەك پیێ دسوت . چەوا دختور دبێژن چ لێ‌نینە و یێ ساخە ؟ ب‌خودێ‌كەسێ ژمە ژدختورا باوەرنەدكر . . ئەڤ باپیرە روژبو روژێ یێ بێ‌هێزو لاواز دبیت . . وەلی هات نەشیا خو ل سەرپێت خو بگریت .

مە هەمیا گەلەك حەز ژباپیرێ خودكر ، چیروك و سەرهاتی‌بێت خوش بو مە دگوتن ، گەلەكێ بێ‌دەنگ بو و هەمی گاڤا ل‌سەر خو دئاخڤت و چ‌جارا دلێ‌كەسێ ژێ نەدما .

وێ نیڤرویێ حەجی میسا هاتە مالامە ، حەجی میسا گوندیێ مە بو . . ئەوی و باپیرێ من گەلەك كاروان پێكڤە كربون و دگەلەك نەخوشی‌یادا پێكڤە بون . . ڤێ جارێ حەجی میسای ب‌بێ‌دەنگی ل باپیرێ من دنێری نەوەكی هەرجار ، هەرجار دەمێ حەجی میسا دهاتە مالامە گەلەك كەیفا مە دهات . . ئەوی و پاپیزی سەرهاتی و ئاخڤتنێت خوش بو مە دگوتن ، كاچەوا پێكڤە دچونە كاروانا ژڤی گوندی بو گوندێ هە ، ژڤی دەڤەرێ بو دەڤەراهە یێ وەكی دبێژن دنیا بو كەسێ نامینیت . . ئەڤ باپیرێ دەشت و دولێ و چیا ددانە سەرپیەكی تنها وەكی ڤورمكەكی یێ كەتیە دقولاچكا خانیدا .

باپیری ب چاڤەكێ گەلەكێ غەریب ل حەجی میسای دنێری . . هێدی هێدی روندك ب چاڤێت وی دا دهاتنە خارێ . . وێ گاڤێ وی گەلەك تشت دئینانە بیراخو – گەلەك خوشی و نەخوشی و روژێت كەڤن .

لێڤێت حەجی میسای هێدی ژسەرئێك رابون :

– ئەرێ . . . . تو یێ چەوانی ؟

– . . . . . . (باپیری سەرێ خو بادا)

– نە نە ئیشاءاللە تو گەلەك ژ دوهی و پێر باشتری . . دوهی تو نەدشیای چاڤێت خو ڤەكەی ، بەلێ هاماشاء اللە خودێ سلامەتیێ بدەت تو ئەڤروكە گەلەك ژ دوهی باشتری . . مالا تە دێ شەهدە بدە چ نینە تەهوسا خو ترساندی . . تشتەك ل تە نینە ، مانێ تو بخویێ دبینی مە دختورەك نەهێلا مە تو نەبربی‌یە دەڤ و هەمی ژی یێ دبێژن چ ل‌تە نینە .

– دایێ نێ ئەڤ ئێشە چ‌جارا نەهاتی‌یە چ كەسا ، دختور هێژ پیێ نزانن ! (پیرا من خو دناڤ سوحبەتێرا كر و بەرسڤا حەجی میسای‌دا) .

هندی نەخوشیا باپیری درێژكر بو و هندی مە هەمیا زەحمەتی دیت بون ب گێراندن وئینان و برنا وی ڤە ژڤێرێ بو وێراهە ، ڤێجا دەنگ ژ كەسەكێ ژ مە نەدهات چ تشت نەمابون كومە نە گوتین و نەكریت ، هەر تشتەكێ خەلكی ژی دگوتە مە ، مە ئەو ژی دكر ، لێ یاژخوبو باپیر بێ‌چارەتر لێ‌دهات .

* * * *

حەتا وێ ئێڤارێ هێژ چ نیشانێت پاییزێ دیارنە ببون مروڤ دشیا ل‌بەر سفكێت مالا روینتەخارێ و ژدەرڤە بنڤیت لی ژنشكەكێ‌ڤە وێ ئێڤارێ هروبایەكی ب‌هێز دەست‌پێكر و

هندەك جارا ژی چیپكێت بارانێ دهاتن . هەر وێ ئێڤارێ ژی باپیر دشیا پیچەكێ ب‌ئاخڤیت ، لێ ئێشاناوی پترلێ هات بو . ئەم هەمی دژورڤە درونیشتی بوین . جهێ باپیری ل‌كوژیا رەخێ چەپێ بو . . بابێ من ، داپیرا من ، مامێت من و مەتێت من ل رەخێت وی بون ، مەلایێ مە ژی ل‌بەر سەرێ وی بو و وێ‌گاڤێ ژ قورئان خاندنێ خلاس‌ببو . ئەم بێت دی ژی پیچەكێ دویرتر رونیشت بوین .

وەختی مەلا ژقورئان خاندنێ خلاس‌بوی ، مە هەمیا دوعا بو باپیری خاستن و ئەم بێ دەنگ ماین .

ژ نشكەكێ‌ڤە حەجی میسای گوت :

– دبێژن دختورەكی باش یێ ل‌بەغدایێ هەی ! ؟

– بابو مانێ ئەم چوینە بەغدایێ ژی چ فایدە نەكر . بابێ من گوت .

– ئەڤە دختورەكێ گەلەكێ باشە ، خەلك گەلەك ب‌باشی بەحسێ وی دكەن ، ناڤێ وی ژی یێ ل سەرێ زمانێ ، لێ ناهێتە بیرا من .

– نەكو تو بەحسێ دختور یوسفی دكەی !

– نە نە ، نە ئەڤەیە ناڤەكێ گەلەكێ خوش یێ لێ ، كا راوەستن دا پیچەكێ هزرا خو بكەم ، بەلكی بهێتە بیرا من . ئەم هەمی بێ‌دەنگ بوین و چاڤێ مە مال حەجی میسای كا دێ چ ناڤ بێژیت .

– صادرالدین . . صادردین . حەجی میسای ب دەنگەكێ بلند گوت ، هندەك ژ مە ڤەجنقین .

– صادر دین كی‌یە بابو ؟ بابێ من گوت .

– نەكو ناڤێ وی صدر الدین بیت ؟ من گوتە حەجی میسای

– ئەرێ هەرێ رەحمەل دەی‌بابێت تە . . ناڤێ وی«صدر الدین»ە .

دبێژن گەلەكێ جامێر و باشە ، خەلك ژ هەمی جها قەستا وی دكەن . عەلی‌یێ حەسەنی ژی ئەو چەند سال بو یێ نەخوش بو ، وی ژی دختورەك نەهێلا ، لێ‌كەسێ نەخوشیا وی نەزانی حەتا دویماهیێ چویە دەڤ صادردینی ، وی صادردینی هندەك دەرمان دانە عەلی‌یێ حەسەن ، ئەو روژەك و ئەڤە دوو هەروەكێ ئەو چ جارا نەخوش نەبوی .

– دێ باشە مادەم وسایە ئەم ژی دێ باپیرێ بەینە دەڤ وی .

– ئەرێ هەرێ هەكە هوین ب من بكەن ، هەما سوبەهی رێكا بەغدایێ بگرن و هەرن ئیشاللە دێ دەرمانێ ئێشاوی ل وێری بیت .

– بابو تو چ دبێژی . . هەكە ئەم سوبەهی تە ببەینە بەغدایێ دەڤ دختوری . بابێ من گوتە باپیری .

– . . . . . . (لێ باپیری سەرێ خو بادا) ، ئانكو نە .

– دبێژن ئەڤە دختورەكێ گەلەكێ باشە !

– . . . . (دیسا باپیری نەرازیبونا خو دیاركر . ڤێجارێ حەجی میسای ب هێڤی گوت :

– بەلێ بەلێ ، بلا سوبەهی تە ببەنە دختوری ل‌بەغدا . ئەڤە دختورەكێ گەلەكێ باشە و خەلك ژهەمی جها دچنە دەڤ وی ...

– . . (لێ دیسا باپیری ب‌چڤە نەگرت و سەرێ خو بادا) هندی مە هەمیا كرونەكر ، ئەم نەشیاین باپیری رازی‌كەین.

ئینا مەدەست ژڤێ هێڤی‌یێ ژی بەردا و جارەكادی ئەم بێ دەنگ بوین . وێ شەڤێ باپیر ژهەمی جارا نەخوش‌تر بو . هندەك جارا نالینێت كویر ژێ‌دهاتن ، ب‌چاڤێت خو یێت خەمگین ل مە هەمیا دنێری هەروەكی دڤیاخاترا خو ژ بخازیت .

ژدەرڤە هروبایەكێ ب‌هێز دهات ، ووشێن ژ داروباری دهات ، بەلگێن دارا دوەریان و ل‌عەردی بەلاڤەدبون ، هندەك جارا ژی دەنگێ چیكێت بارانێ خوش دهاتن . ژ

هرو بای‌و بارانی مروڤی دگوت

هاها دی دنیا خراپ بیت

دەنگی پەنجەرە و دەرگەهـ و تەنەكا خوش دهات دەما باي لێددا ئان ب ئاخێ دكەفتن .

بەری دنیا زەلال ببیت و ببیتە سپێدە با و بارانێ بەتال كر ، بەلگێت دارا ئێدی نەدوەریان و دنیا یا بێ دەنگ بو ، باپیر ژی ئێدی نەدنالی و نە ژی ل مە دنێری .

• پێشیێ ئەڤ چیروكە یا ب زمانێ ئەلمانی ل كوڤارا – Die Brücke هژمار ١٩٨٦/٩ یا هاتی‌بە بەلاڤكرن .



# پڕ بێژی

نزار محمد سعید

ل جهێ ڕاوەستانا پاسێ ، ل ناڤ برەکا ژنکا بلێڤێت پیتانوکی ، چونە سەرو ستۆێت ئێك . ئێکێ گوتە یادی :
– تە ددانێ مە بێ هاڤێتی دابێ . . نابێژی ئەڤە مرن . . مان . . تو دزانی مە چەندهەڤسویاتیەکا خوشا پێکڤە بری . . نە هوسا ئێکجاری ؟
– تو بخودێ کەی هەما تو بێژە . . ئەز چەند جارا یا هاتیم ، هوین نە هاتن چ ل هەوە بکەم ؟ ما ئەز نەهەقم ئێدی پێ بڕێ ژهەوە بکەم .

– تو ڕاست دبێژی . . بسەرێ کوڕێ خوکەم تو ڕاست دبێژی . . من ژبیر نەکریە دەیکێ ما چ بکەم ڤ عەیالی ئەزا گرێدایم . . من چ خوشی ژ بەر بخو نینن .
د پاسێدا ل دەڤ ئێك ڕوینشتن . . چاوا برێ کەفت ، ئێکی ژوان چاڤێت خو یێت تێهنی ل ڕویچکێ یادی گێران . . دەستێ خو بێ ڕویس هەتا ئەنیشکێ بنازکی بلند کرو ئەو تلێت کورت ژرەنگێ بەفرێ دبن ستوڤانکێ وێڕا برن و گوت :
– گەلەکا لاوە . . تە چ زێرێت دی هەنە ؟
بدەنگەکێ پڕ شانازی و ژ خورازی بەرسڤاوێدا :
– من زنجیرا هەی نوزدە لیرەیە . . هەر رەخەکی حەفت و بێ نیڤێ . . شەش جوتێت بازنکا . . مەنتەشە . . ئو هندە هویرو میرێت دی ژی . .
– تە چ دڤێت ! تە ژ من پێترێت هەین .
– من گەلەکێت دی ژی دڤێن . . ڤان ڕۆژا بو تیێ من ئێکا خاستی ، تشتێت خو نابێژنە من . . من یا ژ خەلکی زانی . . گەلەك زێرێت ژێ خاستین . . ژ ڤان پێتر . . من ژی دڤێن . . مانە تو خودێ ؟
– بلا چ قەیدی یە . . هەقێ تەیە . . تو بویکا مەزنی .
– ئاخری بکەیڤا خونە . . یا ل دویڤ دلێ من نەکەن . . ئەز ژی ڕێکا خو دزانم .
– دێ چ کەی دابێ تو ڕێکا خو دزانی ؟
– دێ وێکەم یا ژنك هەمی دکەن . . دێچمە مال بابێ پالدەم !
پاشی بلا بیستەکا بتنێ بشێن سەرەدەریا چار عەیالا بکەن ؟
– ما تو لگەل خو نابەی ؟ گونەهە !

– گونەها هندیّ چی‌یە . . گونەهـ نینە . . ولـلا دیّ هێلمە لسەر دلیّ وان وەکی هەر جار . . دا قەدریّ من بزانن ئەز چەندم بو وان .
– دەیکیّ بخودیّ تو یا زیرەکی . . وەی پا تو باش دپێچولکیّ نە پێچایە !
– ئو پا نەخت . . نەخت چەندە ؟
– کیژکیّ ؟
– ئەوا بو تیّ تە خاستی .
– ها . . بەحسیّ هەشت هزارا دکرن . . ئەڤە بەس بو برایێ ویّ . . مالەك ژی ژیّ دڤێت ، ژدەرزیکیّ بگرە هەتا سەلـلاجیّ تێڤەبیت .
– یا بمعاشە ؟
– نەنە . . معاشی چ حالیّ چ . . دبێژن یا کرێتە ژی چ نینە !
– خەلکیّ زیرەکە دابێ بخو دزانیت . . خولی بسەریّ مە وەر . . نە ئەم بین‌و نە ئەو مێریّ مەکری .

هندی بیستیّ پژمێری ژبەر ئەڤێت بخاردکەڤن‌و ئەڤێت سیار دبن بێدەنگ‌بون ، ژوێریّ وێڤە زڤرینە سوحبەتیّ جارەکا دی شاراند :
– ئەز دزانم هندە سالە چ فلسیّ لێگدای دیّ هەمییّ ل رێکا ڤیّ ژنیّ مەزێخن .
– کی ؟
– هوین .
– مە شولە پی‌یە .
– ئەز د ترسم زێرێت تە بفروشن . . هشیار بی !
چاڤێت ویّ دسەری‌را فرەهبون . . ددانێت خو چرکاندن . . مینا سەرخوشا ، بدەنگەکیّ بلند تشتەکی‌و ساگوت ئەڤێت د پاسی‌دا تلێت خو کرنە دگوهێت خودا ! !
پێڤە چو گوت :
– حەدیّ وان هەیە ، مادشێن !
ژنکەکا لبەر سینگیّ وان بدەنگەکیّ نزم دبێژتە هەڤالاخو :
– ئەڤە چ بیّ دەلنگەی دابیّ !
هەڤالا ویّ لیّ ڤەگێرا :
– نە بناسێت وێنە . . بناسێت هەڤالا وێنە . . وەکی ستێنگیّ – تەهای ژیّ هەیە – یا دئازرینیت . . پیساتییّ دڤێت تێکڤەنەدەن .
– هەوە هەنکا ژ . . «بدەنگەکیّ بلند گوت ، لیّ‌هەڤالا ویّ دەملدەست دەستیّ خو بدەڤیّ ویّ‌ڤەنا» .

– ئوهـ تە شولە پی‌یە . . بلا هەر برەون .
– کچیّ نیّ ئەز پەقیم . . تە های ژ من نینە . . نەشێمەخو .
– تشتەکی بێژتە تە . . ئەم نەشێین شەرەکی دپاسی‌دا بکەین . . خو دناڤ خەلکی‌دا بکەینە تەماشە . . ئەم ژن‌و حورمەت .

ژنکا دی جزدانکا خو ژبەر سینگیّ خو دەرێخست . . دو قاچك ژیّ ئینانە دەر . . دڤێت بەری ژپاسیّ بێنە خاریّ هەمی تشتا بزانیت . . هەریا پێنجکا ددەتە بن . . دئازرینیت . . ئەو یا بەرسڤا ویّ ددەت ، چ د کوشیّ دایە یا درێژیت . رێکی نادەتە بەتالیّ ، دبەر قاچك جوینی‌را گوتیّ :
– دا چ بێژم . . بابیّ وان سەرێت هەیڤا چەندیّ ددەتە تە ؟
تلێت خو جارەکیّ ف هەردوو بریێت خوییێت زراف‌را ئینان گوت :
– ئەز ژیّ وەردگرم . . تشتکەکیّ کێم دهێلمەڤیّ . . ئەز ژی بو خو یا ڤێر بویم . . ناهێلم .
عەبایێت خو هەردووکا نولا کورکا خستینە سەر ملێت خو . . بیّ بدەڤی‌و دەستاو چاڤا دئاخڤن . . حەشامەتەکا هندا ژیّ دچیت دیّ بێژی دیوانەکا درستن .

بابەکیّ تەزی ژنشکەکێڤە دوان رویچکێت مشت سپیاف خەبتی ، ئێکیّ ژوان سەریّ خو ب نك ژنکا لبەر پەنجەریّ ،

ئەڤا لبەر سینگێ وان رونیشتیڤە بر . . بنەرازیبونی گوتێ :
– تو چەندا حال گەرمی ! ماتو بتنێ دپاسیێدای ؟ . . دێ بگرە . . بگرە وێ پەنجەرێ . . خەللك چەندێ بێ ئسۆلە دابێ !

«ژنك لسەر ملێ خو زڤری‌و بکەرب گوتێ» :
– چیە قای تو دترسی خەلکێ ژ دەرڤەی پاسێ گو ل دەنگی تە بیت !

«خو تەحل‌و ترش‌کر . . نینوکێت خو یێت سۆر دانە ملێ وێ ویڤە پالداو گوتێ» :
– دێ بزڤرە . . پەنجەرێ بگرە . . تو چ تشتی دابێ دێ دەڤێ مەگری ، خونە تو مێرێ مەی ؟ !

نە ل منێ نە ل تەبێ ، دێ بێژی هەر ئێکی مسەجلەکا دزکی‌دا ، پشتی بێهن ڤەدانەکا کورت ، مسەجلێت خو جارەکا دی دانەشولی :
– تە چیە خولی عەیشنەك تو یادمری ! ؟ دیارە خەسیا تە ئەو . . . . . .

لێڤێت خو موچ‌کرن‌و ئاخڤتنا وێ بری :
– خەسیا من . . چ خەسیا من . . خداما من‌و بچویکێت منە . . زك رەشەکە . . دکارێ وێدا نینن . . من ژنکێت هوسا نە دیتینە . . وێ رۆژکێ بابێ بچویکا تومبێلا هەڤالەکێ خو ژێ وەرگرتبو دامن ببەتە دختوری ، هێژ ئەز نەرابویم ، وێ خارن چێدکر . . زوی زوی تەباخ گرت . . ئەز دەرکەتم سەح دکەمێ یا دسینگێ تومبێلێدا خوپەحن کری ! کورێ وێ گوتێ :

– دادێ دێ کیڤە هێ‌ی ، دێ چین دەرزیکێ بو دانین . . خو ئەم ناچینە چ سەیرانا ! «مروڤێ پێلاڤەك ژرویێت وێ هەبان ، بێ شەرم یا چ دبێژتە کورێ خو» :
– دای گوری ما چ تێرایە ئەز ژی جارەکێ بو خو دەرکەڤم . . نێ ئەز دخانیڤەمرم ! .

شوفیرێ پاسێ دسەر دەنگێ برِ برِا مەکینێ‌و قەرەبالغا خەلکی‌راو مژویلاهیا وی ب پارە وەرگرتنێ‌و پەرك برینێ‌و هاژوتنێ ، گول هەمی تشتا هەیە . . بێقام بێ غەیدی . . هندێ تژێ بوی ها . . ها دێ د سەردا چیت . . نەشیاخو ، ئینا چاوا ل ئەردەکی راوستیا – بێ دنەینکێ‌راسەحدکەتە وان ژ نکا – بدەنکەکێ بلند کەلا خو رێت .

– وللا هەوە ژنکا دنیا خراب‌کر ! تنێ تشتەك مابو هەوە نەگوتی . . دا وی ژی بێژن دی ! ! ژکەل تلا خو ل کاسێتا مسەجلێ داو دەنگی وێ بلندکر .

ژنکا پەنجەر ڤەکری دەڤی خو ب نك هەڤالا خوڤەبر گوتێ :

ئەڤ قەسە بۆ وان بچەندێ تێنیت ! ؟ هەڤالا وێ گوت :

– هەر وەکی بوڤی ئاسنی دبێژن . . هەر های ژ هندێ نینە . . تو دبینی خو خو سەرڤە نابەن .

ئەو ژنکا دگوتی : کچێ نێ . . ئەز پەقیم « های ژ من نینە» تە ئەوو هەڤالا خو پەیابون ، برێڤە ئێکێ گوتە یا دی :
– تە بچاڤێ سەرێ خو دیت ! ؟
– ئەرێ کەکۆ ، «هندی بمینین دێ عەجێبیا بینین» .
– ئێ تو بخودێ . . د پاسێدا . . ئەو جهێ هندێ‌یە د پاسێدا وان قەسا بکەن . . جە بخودێ ئەڤەیێت هندێ نە مروڤ وان تژی . . ! نو کە دێ بو وان چ بێژم دێهلێت دێهل .

هاوڕێ حەمە صالح

# فریشتەکان زوو دەمرن

به ئۆغر کردنی من بومه قەقنەس

که ئەو چو بۆ سەفەر ، من بۆسەفەر چووم

مەحوي

هەرچەندە ئاسمان ڕەش دەچێتەوەو وهێمنی سەرتاپای ناوچەکەی داپۆشیوه ، بەلاّم ژانو خەمی تۆ ئێستاکە زیاتر دەورووژێت . . شەوو ئەستێرەو مانگەشەو مرۆڤ دەخەنە دەریای تێڕوانینو بیرکردنەوەی فراوان . . ئاسمانیش دەیەها پرسیاری مەردوم قووت دەدات . . تەنها ڕەنگێکی ڕەشی جوانیش هەبێت ئەوا هەر تابلۆی شەوە بەتایبەتی لەو ساتانەی ئەستێرەکان وەك چاوی بێگەردی زارۆلاّن تیایدا دەبربسکێتەوە . . «ئەم» ئەستێرەیە نەبێت هێشتا دارستانێکی چڕی ترسناکی تەنراو بە دووکەڵی باروتو هاوارو ناڵەی برسییەکانە . . ئەشێ «ئەو» ئەستێرە دوورانەش زەمینەی کەسانێك بن سنووری مرۆڤایەتییان جێهێشتبێت وەك پەپولە بێتاوانو وەك فریشتە خاوێنبن . . ئای ژیان چ‌بەلاّیەکی ترسناکە بۆئەوانەی دەیانەوێت فریشتە ئاسا لەم ئەستێرەیەدا ژین بەرێکەن ! وەك ئەو ماسییەی لەنیشتمانی دەریا ڕاوکرابێت بەرلەمەرگی چۆن هەڵبەزە بۆژین دەکات ، فریشتەکانی ئەم زەمنیەش هەتا دەمرن هەروا دەژین ! . .

تۆو فریشتە دوو ماسی نێو دەریایەکی بێسنوور بوون ، دەریای میهرو خۆشەویستی یەکی نەمر . . بیرکەوتنەوەی فریشتە گرکانێکە لەناخی‌تۆدا سەر هەڵئەداتو هەر لەناخیشتا دادەمرکێتەوە . . لەجیهانی مەلەکردنی نێوئاسمان وەك باڵندەیەکی ماندوو هێزی دری زەوی ڕای‌کیشایتەوەو بە پلیکانەکاندا چوویتەوەخوار بۆ ژوورەکەی خۆت . . ئەمشەو خەمەکانت لەهەموو شەوانی‌تر خەست‌تر دەبێت، ئەم تەنیایی‌یە گرێکەو ـ هەناوت دەسووتێنێت . . ئەمشەو تۆ هەزار جار لەدایك ئەبیتو ئەمرێتەوە . .

مۆمەکە دادەگیرسێنیت ، هۆشو هەستت لەنیگای چاوانتەوە دەبڕیتە ئەوتیشکە کزەهێمنە ، هێدی . . هێدی گرێك کە پڕی ژانو سوێیە لەکاسەی سەرتەوە تاسینەت دەهەژێنێت . . لێرەدا مڕمی دەروونت پێدەبێتو ئیتر

دەسووتێیت . . چاوێکت بەلای پێنووس و پەڕاوەکەتدا خشاند . . چی بنووسیت ؟ ! هەموو نووسینەکانت هێشتا زمانی گرفتی و سوێکانتی پەی پێنەبردووە . . چما خەمی مەزن و هەموو ژانێکی مرۆڤ لە دوو توێی ئەلیف و بێدا جێگەی دەبێتەوە ؟ ! ! هەیە تا ئەو ساتەی مەرگ چاوانی پێ لێك دەنێت هاوڕێی خەم و سەرچاوەی سووتانێکی لەبن نەهاتووە . . کەسیش نی یە بۆنی هەڵکروزانی بکات ! . . ئەوەتا تۆ ئەمشەو دەسووتێیت ، پارچەیەك خەڵووزیت و بەخەمێکی سەوز دەگەشێیتەوە . . کوا بۆکەس مەرگ و سووتانت نابینێت ؟

تۆ کە هەگبەی خەمی ئەم دارستانە پڕ جەنجاڵەیت ، لەگەڵ مەرگی پەپوولەو هەڵوەرینی گەڵایەکدا دڵت وەك کانییەکی خوێنی زووخاو دەپژێنێت ، گەر لەمشەوەدا بەدەم ئازاری بریتی هۆش و هەستەوە گیانت سپارد ، ئەشێ تا دوو ڕۆژیش نەتدۆزنەوە ! ئەوساش هەروەك چۆن ووتیان فریشتە ڕۆژی تەواو بوو بوو ئاواش دەڵێن ئاشتی هەر هێندەی لە چارە نووسرابوو ! !

لەکەوتنی پەرداخی سەرمێزەکە بەئاگا هاتیتەوەو . . ویستت نەخۆیتەوە . . بەڵام چۆن ؟ ! تۆ کە بەدیار شووشەو پێکەکانتەوە دائەنیشیت هەر بەو سۆفی یە دەچیت کەبەدەم زیکرەوە شەونخونی ی دەکێشێت . . ئەمشەو زیکری ئەو دەتخاتە سەما ، سەمای کۆترێکی سەربڕاو !

پێکێکی خەستت نا بەدەمتەوە ، ئەو ڕۆژگارو ساتە پڕ لە عەشقانە مەگەر بەزیکرو بەخەو بیان بینیتەوە ! گڕی سینەت زیاتر دەبوو . مۆمەکەش زیاتری دەسووتا . . ئەمشەو یادی تێپەڕبوونی ساڵێکی مردنێتی . . لات ستەمە کۆچی ئەو بە مردن ناوبەریت ، هەمووجار دەیووت :

( . . ئاشتی گیان ، ئێمە هەموو وەك یەك لەدایك ئەبین ، بەڵام وەك یەك نامرین ) . . مەرگی ئەو لە هەڵوەرینی خونچەیەك دەچوو . . تەمەنی ئەو عەشقەتان هێشتا لە گڕوگاڵدا بوو کە دەستی چەپەڵی مەرگ تاساندی . . . تۆ کە خۆت ناسی سەرچاوەی خەم و ژانێکی مەزن بوویت ، چما لەو شارە دوورەشەوە کە بۆ تەواوکردنی خوێندنەکەت گەیشتبویتێ ، هێندەیتر هەستی نامۆیی و وون بوون باڵی بەسەرتا کێشابوو . . فریشتە ئەو تەنها قوتابی یە بوو لە جیهانی خەونەکانی تۆدا خۆی دەنواند . . کە ناسیت زۆرت خۆش ویست ، هەمیشە بەگژ ڕووالەتە درۆزن و ساختەکاندا دەچۆوە . . ئەتەکێت و باوی ئەم سەردەمە سەمەرەیە هەرگیز فریوی نەئەدا . . فریشتە ئەوان نەبوو لەسەر شانۆ گەورەکەی ژین ڕۆژی دەیەها دەمامك بگۆڕێت . .

ئێستا ئەو لە کۆچێکی زۆر دووردایە تۆشی وەك منداڵێکی پەرەوازەی بێدایك لەنێو کەندەلانی ئەمدارستانە ترسناکەدا جێهێشت . . دوێنێ لە کۆلێژ دانیشتبویت ، بەچاوە کزبووەکانتەوە ، ئەوچاوانەی لەدوای مەرگی فریشتە هەر بەچاوی کەروێشکێکی ترساو دەچوون دەتڕوانی یە دەوروبەر . . تۆ وەك پەیکەرێکی تۆواوەت لێ هاتبوو لەخەم و عەشقی فریشتەدا ئەوان هەر ئاوڕیشیان لێنەدایتەوە ، تەنها ئەحلام نەبێت بەنیازی دڵدانەوەت قسەی ساردوسڕی بۆدەکردیت و بە ڕەش بینی دەزانیت ! . . تۆش وەك کەسێك نەبێت لەزمانت بگات بێدەنگ دەبوویت و لەبێ دەنگی خۆتا هێندەیتر خەمت گرانتر دەبوو . .

ئێستاش هەر تەنهایت و لەو یادگاری یانە ، نەبێت چی تر شك نابەیت . پێکەکەت دانا . . لەنێوانی پەڕاوێکدا نامەو کارت نامەکەی فریشتەت دەرهێنا . . کارت نامەکە وێنەی خۆر ئاوابوون بوو ، ئای لەم وێنەیە چ ڕۆژگارێك وەبیرتا دێنێتەوە !

«– فریشتە با کەمێك لای ڕۆخی دیجلە دانیشین ، من لە دەمەو ئیواراندا ترسێکی سەیر دام دەگرێت !

چاوە ئەستێرەیی یەکانی لەچاوانت نەتروکاند . ووردە ووردە بەرەو کەناری ئاوەکە نزیك بوونەوە . . لەسەر کوزسی یەك دانیشتن ، دەستەکانی یەکترتان توند گرت ، هەر وەك دوو منداڵ لە ترسێکی نادیار خۆتان لە ئامێزی یەکتر نا . .

- ئاشتی ، سەیری سوورایی خۆربکە ، ئەوە دەریاش خۆی لە خوێناویدا هەڵکێشاوە ! . .
- کە تاوێکی تر بچێتەوە قورگی نەبوون ئەی چۆن سوور نابێت ئازیزم ! ئەوە فرمێسکی دەریایە لە شیوەنی ماڵئاوایی خۆردا ! !
- جاران ئەمدیمەنە زۆر دەیترساندم . . هەستم دەکرد ژنیم لە بێ عەشقی تۆدا بە فیرۆ دەروات ! ئاشتی وارۆژێکی تری تەمەنمان لە گەڵ پێڵوی خۆردا ئاوا دەبێت !
- فریشتەکەم . . عەشق سەرتاپای شتەکان دەگۆڕێت . . پێوانەی سات و سەردەمەکان دەشێوێنێت ! ساتێك لە عەشق و سووتانا خۆی لە خۆیدا زەمەنێکە ! . .
- کەواتە بڵێ عەشق ئەو تەنها گرەوەیە مەرگ بەزین دەدۆرێنێت ! بە گۆشە نیگای چاوە پڕ لە هیواکانی تێی گەیاندی ئەو لە تەك تۆدابێت هەرگیز لە مردن سڵ ناکات . . تۆش بەرامەی عەشقێکی هەتایی مەستی دەکردیت و لە چاوانیدا دنیایەکی ئاڵ و واڵات دەبینی» .

. . مۆمەکە وەك لە سووتان ماندوو بووبێت کەوتە چزەچز . . ووشەکانی نامەکەی هەمیشە لە گوێتا دەنگ دەداتەوە . . ئای لەو ساتەی بۆ یەکەمجار خوێندتەوە ! شادمان بوویت لە سایەی ئەو عەشقەدا بارگەی ژنێکی ئاسوودە ، دەخەیت . . کۆتایی نامەکە چاوەڕێی زوو هاتنەوەتی کردبوو . . تۆی ماندووی دوور هەوارگەش ، کە ماوەیەکی زۆربوو نەگەڕابویتەوە . . جانتاکەت پێچایەوەو بەرەو شاری پڕ عەشق هەنگاوت نا . .

لە هەواڵ پرسینیدا زۆر شتیان دا بە گوێتا . . کاتێك چوویتە بنج و بناوانی تێگەیشتی کەفریشتە نەخۆشی یەکەی بووە درمێکی پیس و زۆر لاوازی کردبوو . . بەر لە مردنیشی نامەیەکی بۆ تۆ نووسیبوو . . ئیتر تا دایکە کڵۆڵەکەی بە باوەش دەیگەیەنێتە سەر سووچی کۆڵان و دەگاتە ئۆتۆمبێل . . فریشتە بێ ئەوەی فریای ئۆکسجین بکەوێت گیانە فریشتەیی یەکەی دەسپێرێت !

فریشتە مرد . دەیەهای وەك فریشتەش بەم دەردە چوون . . باوکی فریشتە گەر خاوەنی ئوتومبیلێك بوایە یان هیچ نەبێت پارەیەکی هەبوایە هەڵبەتە فریشتەش بەو چارەنووسە نەدەگەیشت ! ! باوکی هەر ئەوەی پێ کرا چی پارەی هەبوو لەرێگەی «حەج»دا دانا ، ئای چەندێك عاشق بوو بە حاجی و مامە حاجی بانگی کەن ! ؟

ئەی ئاخۆ دایکە جگەر سوتاوەکەی لە پرسەکەیدا چی بەسەرهاتبێت ؟ خۆگەر مەلایان بۆ نەگرتبێت ، ئەو مەلایەی بۆ جاری هەزارەها ووتەکانی دووبارە دەکاتەوە ، ئەوا بوونەتە پەندی زەمانەو باس و خوازی حاجی ژنانی گەڕەك !

فریشتە گیان کێ دەیزانی تۆ شەیدای «فۆرالیس»یت ؟ ئەو ئاوازەی شایەتمانی عەشقمان بوو ! گەر لە پرسەکەتدا لەوێ بوومایە و بموتایە : وەسی یەتی فریشتە ئەوە بوو لە دوای مەرگی بەو ئاوازە بەرێی کەن ! ئەوا هەرچی هێلکە بوو لە سەری مندا سواغ دەدرا و شار بەدەریان دەکردم ، تۆش لای باوکت بەتاوانی ئەوەی عاشقی من بوویت لە گۆڕەکەتدا نەفرەتت لێ دەکرا . .

( . . ئاشتی گیان عەشق باوەڕە . . پیرۆزترین باوەڕیشە ! . . ئەی ئەوە نی یە مرۆڤ دەگەیەنێتە ترۆپکی پاکی و چاکی و پاکیزەیی دەروون و لە بازنەی خۆپەرستی باڵای پێ دەکات ؟ فێری دەکات چۆن شەیدای خۆشەویستی یەکی نەمرتر بێت ؟ ! . . عەشق تێپەڕبوونە لە واقیعێکی ناهەموار بەرەو جیهانی حەقیقەتێك . . تۆ بۆ دەترسێی ! چما پێغەمبەرێکت دیوە بە قورو هێلکە سواغ نەدرێ و شار بەدەر نەکرێ ؟ ! »

ئاخ فریشتە گەر بۆ ساتێك سەرت لە گۆڕ دەردەهێنا دەمزانی هۆی مەرگی خۆتت چۆن باس دەکرد ! . . فریشتە بۆ لە ژوور سەرتەوە نەبووم کە گیانت سپارد ، کێ دەڵێت گیانی منیشت لە گەڵ خۆتا نەدەکێشا ؟ ! . . بەڵام من . . من دەمتوانی نزیکت بکەومەوە ؟ ! خۆ ئەگەر بموێرایە لە دەرگاکەتان بدەم ، باوکت چۆن دەرگاکەی لێ ئەکردمەوە . من چی ئێوەبووم ؟ ! ئەو کەی لەو پەیوەندی یە گیانی و پیرۆزەی

ئێمە تێدەگەیشت ؟ ! . . ئەو دایکێ لە پێش شووکردنا بە «پەچە» شەوە نەدیبوو ! ! بۆیە هەمیشە لاوازی دەستی پەژارەی ئەوان بوویت . . فریشتەکەم کێ دەیزانی مەرگی دوور لەیەکتری ئێمە وەك تاوانی دابڕانی دایكو کۆرپە وایە ؟ ! . .

ئەوان ئێستا بەرگی رەشی چاوو راویشیان فرێداوە ! ئەشێ بەدەم خەمی رۆژگارەوە گۆڕەکەشتیان لەیاد کردبێت . .

من نەفریای بەرگی رەش کەوتم . . نە فریای پرسەکەشت . . کەسیش نەیوێرابوو ئەو هەواڵەم بۆ بنێرێت . . بەلاّم لەو ساتەوە باخی دڵی من ووشکی کرد . . زۆر جار خۆم دەبینم وەك مردوویەکی بەخەموئەشکەنجە داپۆشراو بەشەقامە پڕ جەنجاڵەکانی شاری پڕ ئاشووبدا دێمو دەچم . . عاشقەکانیش لە سیای ڕووخاوم وورد دەبنەوە وەك بڵێن گوڵەباخی ئەم ئێوارەیەت لە کوێ جێ هێشتووە ؟ !

فریشتە تۆ خۆت فێرت کردم لەخەم گەورەترم . . لە گرفت بالاّترم . . بەلاّم بریا دەتزانی ئەم خەمە چەند تاڵە ! . . گڕی مۆمەکە زیاتر بوو . . چاوەکانی فریشتە لە پێش چاوت گەورەتر بوون . . سەرت نزیکی مۆمەکە خستەوە ، دڵۆپێك . . تەنها دڵۆپێك مۆمەکەی لەسووتان رزگارکرد ! دەنگ دانەوەی هاوارەکەت ف . . ر . . . ی . . . ش . . . ت . . . ە . . لە نێو تاریکایی یەکەدا وونبوو . . هێندەی تر ناخت هەژا . بێئاگا دەبوویتو بە ئاگا دەهاتییەوە . لە ناڵە ناڵی خۆت تا بەیانی هەر سووتایت . .

بۆ دواجار هەموو شتەکانت پێچایەوە . . بەجێهێشتنی ئەم ژووری هەستێکی خەماویتر دروست دەکات . . وەکو دیوارەکانیش بووبن بە بەشێك لەتۆ ، تەنها ئەوان بوون جێ پەناگەو لاوانەوەی کەساسییەکەت . هەرئەوان گوێگری خەمەکانت بوون . . هەندێجار هاورێیەتیو راهاتن ڕێکەوتێك بە ئەنجامی دەگەیەنێت لە گەلّ ئەوەشدا دابڕبوون لێی دەبێتە کارێکی قورسو گرانو خەمێکی هەمیشە سەوز . .

دەرگای ژوورەکەت داخست ، بە پلیکانەکاندا بەرەو خواربوویتەوە . گەیشتیتە سەری شەقامەکەو دوا ئاورت دایەوە . ئیتر ماڵئاواییت لە بەشێکی یادگارەکان کردو بەرەو گەراج هەنگاوت نا . .

. . لە دوورەوە ئەحلامت ناسیەوە . . بە چاوەکانی سۆزی دەرئەبڕی بەلاّم تۆ خۆت گێل کرد . . بە مافی خۆتت نەدەزانی جارێکی تر لە ژووانێکدا خۆت ببینیتەوە . . گەر هێزێکت مابێت ئەوا هەر شیوەنە بۆ فریشتە و یادگارەکانی . .

کێ دەڵێت فریشتە بەم پەشێوییەی تۆ رازییە ؟ ! . . تۆ خۆت هەست بە تاوانباری دەکەیت . . چونکە عاشقێکی مەزنیت . . لای تۆ ، عەشق شێرپەنجەیەکی مەزنە تامردن هاودەمی عاشقە ؟

چەپڵەو گۆرانی ووتنی ئەوان جار جارە لە خەیاڵی دەکردیت . جگەرەیەکت داگیرساند . . و هەندێك سەبووریتهات . . مونیف راست ئەکات «گەر جگەرە نەبوایە دنیا هەمووی گڕی دەگرت ، پێویستە مرۆڤ شتێك بسوتێنێت ، گڕ لە شتێك بەردات» !

ئاخ فریشتە ! تۆ بۆ هێندە تەمەنت کورتبوو ؟ تۆیەك مژدەی لە دایكبوونێکی نوێی جیهانێکی پڕ خۆشەویستی بوویت ، ئەم مەرگە ناکاتییە لە بەرچیبوو ؟ ! تاوانی مەرگی پەپولەو هەڵوەرینی گەلاّکان لە ئەستۆی کێدایە . . ئەم پرسیارانەت بەچاو لەم دیوی پەنجەرەکەوە رەوانەی ئاسمانێکی دوورکرد . . ئەو ئاسمانەی هەمیشە بێدەنگییەکی ترسناكو بێوەلاّمە . .

دوو کەس لە سوواربوانی پاسەکە شێوەی تۆیان بەلاوە سەیر بوو . یەکێکیان ووتی : ئەمەشێتە ، ئەویتر : نەء ! پاپۆرەکەی نقوم بووە ! قالەو جەمالو حوسنی و عەدۆو هەموو شێتەکانی

▷ تریش هەگبەی خەمێکی تاڵ و کارەساتێکی جەرگبڕن . . تۆ پێشتریش گاڵتەت بە شێت نەکردووە ، شێتەکانی ئەم جیهانەشت خۆش دەوێ . شێتبوون دوا پلەی تەقینەوەی سنووری خۆگرتنە بە دەم ئازاری ژانی ناوەوەی مرۆڤەوە . . هەڵبەتە تۆش شێت دەبیت یان بە خوڕپەی دڵ لە سەر گۆڕەکەی فریشتە بەلادا دێیت . . ئەوەی لە پشتەوە دانیشتبوو کامێرێکی دایە دەست ، تۆش گەیاندە شۆفێرەکە ، بەڵام پاش بۆڵەبۆڵ فڕێی دایەوە ، ئاوڕێکت لێ دایەوە ، ئەو سوور بۆوە تۆش بەزەردەخەنەیەك بۆت ڕوانی وەك بڵێیت گوێ مەدەیە ، خۆ پەككەوتن هەر لە قاچ و چاو و دەستدا نی یە ، کەسانێك هەن پەك كەوتەی هەست و ئەستی ناسك و دەروون کوێرن . .

واپاسەکە نزیکی شار کەوتەوە ، شار بەدەرکەوت ، هەورێکی ڕەشی چڕ وەك پرسەی مەرگی فریشتەکانی گرتبێت ، ئاسمانی شاری تەنیبوو . . تۆو فریشتە جاران بەم دیمەنانە خەم دای دەگرتن ، ئێستا خەمەکانت گەلێك تاڵە . . نەتویست ئەم دیمەنە ناهەموارە بەتەنها ببینیت سەرت خستە سەر ئەژنۆت . . دووانەکە پێی کەنین . . ئەوان چی دەبینن هەر ئەوەش تێ دەگەن . . زۆر جار چاوی ئاژەڵ گەلێك پاکترو جوانترە چونکە لەتوانایدا نی یە مەسەلەکان بە ئاوەژوویی تۆمار بکات !

وەستانی پاسەکە بەئاگای هێنایەوە ، دابەزیت و سەرکەوتیت بۆ لای «سەیوان» . ئەمە شاری مردووانە ! تۆ بڵێیی ئەمانە هەموو وەك یەك مردبن ؟ !

«ئاشتی گیان ئێمە هەموو وەك یەك لەدایك ئەبین بەڵام وەك یەك نامرین» . لە دوورەوە گۆڕەکەی فریشتەت ناسی یەوە ، جانتاکەت فڕێ دا . . هەستێکی مەرگاوی گیانی سڕ کردیت . . بە پڕتاوێك بەرەو گۆڕەکەی بوویتەوە و توند لە ئامێزت گرت . خۆریش وەکو تازە لە تاوانی ئەو ئێوارەیەدا خوێناوی ڕشتبێت فرمێسکی لەچاوی تۆدا سوور دەنواند .

●

* فۆزالیس : پارچە ئاوازێکە .

چیرۆکی منداڵان :

# کەلەشێرو ڕێوی یە پیرەکە

طلال حسن نووسیویەتی

---

عەزیز ڕەشید حەریری وەریگێڕاوە

---

کەلەشێرەکە دوای ئەوەی بانگی بەرەبەیانی داو لێ بووەوە ، بۆ تاوێ چاوەکانی لێك نا ، بەڵام بەر لەوەی خەو بیباتەوە ، گوێی لەخشپەی پێ یەك بوو ، کە چاوی کردەوە بینی وا ڕێوی یە پیرەکە لێی نزیك دەبێتەوە . . لە شوێنی خۆیەوە باڵەفڕەیەکی کردو چووە سەر دارەکەی نزیکی یەوە ، لەسەر چڵێکیدا وەستاو ، لەترسانا دڵی بەتاو لێی دەدا . . .

* **ڕێوی یە پیرە شڵەژاو گوتی :**

– کاکی کەلەشێر ، بۆ وا بەسەرسامی یەوە سەیرم دەکەی ، چی ڕووی داوە ؟ دەڵێی بەنیاز خراپم دەزانی ، دۆستە ئازیزەکەم ، هەقی خۆتە چونکە تائێستاش هەر لەسەر بیروباوەڕی باوك و باپیرانت دەڕۆی و ، ئێمە بەنیاز خراپ تێ دەگەی ! دەوەرە خوارەوە با ئەم نامەیەت بدەمێ . .

* **کەلەشێر بە سەرسامی یەکەوە :**

– نامە ، کێ بۆی ناردووم ؟

– دۆستی ئازیزم ، لەلایەن «بەرەبەیان»ەوە بۆت هاتووە ،

بەلاَم دەزانی زۆر لێت تورە بووە !
– جابۆ تورە دەبێت ، خۆ من هیچم نەکردووە پێچەوانەی ئارەزووی ئەو بێت !
– هاوڕێی خۆشەویست ، پیربووی‌و هەق خۆتە گەر بەرەبەیان‌و بەیانی لەیەکتری جیا نەکەیتەوە .
• کەلەشێرەکە بە هەڵچوونێکەوە هاواری کردو گوتی :
– بەلاَم ئەمەیان فری بەسەر ڕاستی‌یەوە نی‌یە ؟
– جابۆ لەمن زویر دەبی ، دەفەرموو لەگەڵ مندا وەرەو، خۆت ڕوو بەڕوو ئەم قسەیەی پیێ بلێ ، چونکە ئەو ئێستا وا لەنێو دارستانەکەدا چاوەڕوانت دەکاو دەیەوێ بەپەلە چاوی پێت بکەوێ . .
• کەلەشێرەکە خەریك‌بوو دابەزی‌و ، لەگەڵ ڕێوی‌یە پیرە بەرەو دارستان بچێت ، لەپڕ دەنگێك بەرزبووەوەو هاواری کرد :
«کوکو . . . کوکو . . .» .
• ڕێوی‌یە پیرەکە هەردوو گوێچکەی بەرزکردەوەو ، بە شڵەژاوی‌یەوە هاواری کردو گوتی :

– ئەو گەمژەیە کێ‌یە لەم کاتەدا وا هاوار دەکات ؟
– لەپەنا دارەکەوە ، سەگێکی گەورە هەڵسایەوەو گوتی :
– ئەوە منم !
– ڕێوی‌یە پیرە لەشوێنەکەی خۆیدا سارد بووەو ، تاسا ، ویستی ڕابکاو رزگاری بێ ، بەلاَم سەگە گەورەکە ڕێگەی پی‌گرت‌و ، پی‌ی گوت :
– ڕێوی‌یە پیرە ، وادیارە پیری‌یەتی بەچاکی کاری تێکردووی ، تەنانەت وات لێهاتووە دەنگی کەلەشێرو دەنگی سەگ لەیەکتری جیا ناکەیتەوە . . دەفەرموو لەگەڵ مندا وەرەو پێشم کەوە !
• ڕێوی‌یە پیرە بەسەرسامی‌یەکەوە :
– بۆ کوێ بێم ؟
– بۆ لای ئەو شوانەی کە هەفتەی پێشوو کەلەشێرەکەیت خواردووە ، دەیەوێ چاوی بە جەنابتان بکەوێ !
• ڕێوی‌یە پیرە بە هاوارەوە :
– بەلاَم من کەلەشێرەکەیم نەخواردووە ، بەڵکو لای خۆم داناوەو بۆی بەخێو دەکەم . . گەر باوەڕیش ناکەن ، لێرە بوەستن هەر ئێستا دەچم لەماڵەوە بۆتانی دەهێنمەوە . .

• سەگە گەورەکە سەرێکی لەقاندو گوتی :
– نەخێر ، من کارەکەم بەپەلەیەو ناتوانم لەوە زیاتر بووەستم . دەبێ هەر ئێستا لەگەڵ من‌دا بێی ، چونکە شوانەکە پێویستی بە کەپەنکێك هەیەو ، دەیەوێ لە پێستەکەی بەڕێزتان کەپەنکێکی جوان بۆ خۆی دروست بکات . .
• ڕێوی‌یە پیرە کە ئەم قسەیەی گوێ لی‌بوو ، تەزوویەك بەهەموو گیانی‌دا هات‌و سەیرێکی ئەم‌لاو ئەولای خۆی کرد . بەڵکو یەکێ فریای کەوێ ، پاشان هاواری کردو گوتی :
– سەیرکەن ، بزانن ئەوە کێ‌یە بەرەو ڕوومانەوە دێ ؟
• کەلەشێرو سەگە گەورەکە ئاوڕێکیان دایەوەو سەیری ئەو شوێنەیان کرد ڕێوی ئاماژەی بۆ کرد ، بەلاَم هیچ کەسێکیان نەدی ، کە ڕووی خۆیانیان وەرگێڕا ، ڕێوی‌یە پیرە تۆزیشی نەمابوو ، بەو فێڵە ڕێوی‌یە پیرە کەلەشێرو سەگە گەورەکەی خەڵەتاندو خۆیشی ڕزگاری بوو .
• لەولاشەوە سەگە گەورە بەدەم ڕاکردنەوە بەدوای ڕێوی‌یە پیرەدا دەیگوت :
– هەی گەمژەی گێل ، وادەزانی کەرات‌کرد ئیتر لەدەست من ڕزگارت دەبێ ، بەلاَم شەرت‌بێ بۆ هەر کوێ‌یەك بچیت هەر بەدواتەوە بم ، تا هەموو توڵەیەکت لێ دەکەمەوە . گیان‌دارانیش لەتەڵەکەبازیت ڕزگاریان دەبێ . .

• ئەم چیرۆکە لە پاشکۆی هەفتانەی ڕۆژنامەی «الثورة»دا ، لە ژمارەی «٣٧٧٨»ی ڕۆژی ١٩٨١/١/١٧دا بلاَوبۆتەوە .

١٩٨٦/٥/٢٣

**هونەر**

### لە ئاسۆی هونەری جیهانی‌دا

# ژان گوژۆن

## پەیکەرتاشی فەرەنسی مەزن

نووسینی مێژوونووسی سۆڤیەتی : ت . کوزمین
وەرگێڕان‌و ئامادەکردنی لە ڕووسی‌یەوە : محمد عارف

هونەری پەیکەرتاشی فەرەنسی مەزن (ژان گوژۆن) لە گۆڕەپانی پەیکەرتاشین‌دا ، لایەنی گەش‌و ئاسۆ ڕۆناکی سەدەی وریابوونەوەی هونەری فەرەنسی سەدەی شازدەمین بەرجەستە دەکات . نوێنەری ڕاستەقینەی هونەری ڕینسانسی فەرەنسی دەستێکی بالآی لە زۆر جۆری هونەری‌دا هەبوە . گوژۆن ئەندازیارێکی کەم هاوتاو هونەرمەندی دیکۆرو مامۆستای هێلکاریی و گرافیك و ڕازاندنەوەی پەرتووك بووە . گوژۆن لە سەرەتادا بە ووردی هونەری ئەنتیکی‌و ڕینسانسی خوێندوەو سوودێکی باشی لی‌وەرگرتووە ، بەلآم ئەوەی ڕاستی‌بێ هونەرمەند لە گۆڕەپانی پەیکەرتاشین‌دا دەستی بالآتر بووەو زیاتر بەرەو لووتکەی زێرینی داهێنان بەرزبوەتەوە ،

لەسەر بەرهەمی گوژۆن ، شیعرو ئەدەبیات داندراوەو بەرهەمەکەی بوەتە کانی سروش بۆ شاعیرێکی ناسراو وەك (پۆنسار)و هونەر دۆستەکان . پەیکەرەکانی (گوژۆن) یان بە بەرهەمی پەیکەرتاشینی (فیدیی) یۆنانی نەمر بەراورد کردوەو بەم



△
بەشێك لە (فانتانی بی‌گوناحان) ١٥٤٧-١٥٤٩ پاریس .

جۆرە باسی پەیکەرەکانی کراوە : «ئەو پەیکەرتاشەی لە ژێر دەست‌و پەنجەکانیدا مەرمەڕ ، گیانی هاتوەتە بەر» .

گوژۆن لە شاری پاریس لە دایك‌بووەو بۆ ماوەیەکیش لە شاری (ڕوان) ژیاوەو سەرلەنوێ گەڕاوەتەوە پاریس . هونەرمەند ، بە داخەوە لە تەمەنی پەنجاساڵیدا ، لە ئەنجامی ستەمکاریی‌و نەگونجانی لە گەڵ میری‌دا بە ناچاری نیشتمانی بۆ ماوەیەك بەجی‌هێشتوە . جی‌ی داخە کە بەشێکی کەم لە بەرهەمە نایابەکانی پارێزگاری کراون ، بەلآم ئەوانەی ماونەتەوە بەشێکیان لە کلیسەی (ڕوان) داندراون ، لە دروست‌کردنی گۆڕی سوارچاکی ناو (لوی دی بریز) ، دیمەنی دوو جیهانی



پەیکەری (دیانا) ١٥٥٨-١٥٥٩ پاریس . مووزەخانەی لووڤر .

جیاوازی کۆکردوەتەوە . . دیمەنی سەرەوە : بریتی‌یە لە پەیکەری سواری ناوبراو بە جلك و بەرگی جەنگەوە ، دیمەنی دووەم ، واتە بەشی خوارەوە ، دەربڕینی کۆتایی هەر مرۆڤێکە . . مردنی سوار شیوەنو شینی سەر تەرمەکەیەتی . . دەربڕینی شینوگریان لە هونەری فەرەنسی‌دا ، ئەوەندە لە دڵو دەرونەوە دروست‌کراوە ، بە تایبەتی لە چەند قۆناغێکی ڕەشبینو دژواردا‌و لە ئەنجامی وەستایی دەربڕینو بەرجەستەکردنی لێقەوماوەکانو بەرچاوخستنی جۆری هەڵچوونو جولانەوەیان ، ناویان ناوە : (هەڵپەرکێی مەرگ) ، بەڵام لە گەڵ ئەوەیش ئۆبرەزی سوارچاك ، واتە دەربڕینی گیانی پاڵەوانی‌ی و مەزنی‌ی مرۆڤو سەرکەوتنی ، زاڵ بوەتە سەر جیهانی ڕەشبینی‌و دەست بە ئەژنۆیی‌دا . . لێرەدا ڕوانگەی فەلسەفی پەیکەرتاشی گەشبینیان بۆ دیار دەکەوێ . هونەرمەندی بلیمەتی فەرەنسی سەدەی نۆزدەم ، دامەزرێنەری قوتابخانەی نیگارکێشانی ڕۆمانتیکی - دیلاکرۆا - بەم ووشانە باسی بەرهەمی (گوژۆن)ی کردوە : «لە جەستەی پەیکەرەکەی‌دا ، مەزنی‌ی هونەری ئەنتیکی لە گەڵ گیانی هاوچەرخو جوانی‌ی رینیسانس یەکیان گرتوەتەوە» . هونەرمەندی مەزن لە ڕازاندنەوەو دیکۆراتی بیناسازیش‌دا دەستێکی باڵای هەبوو ، باشترین نموونەی ئەم قۆناغەی پەیکەرە زەقەکانی واتە : (ریلیف)ەکانی (سان ژێرمان)ن کە ئێستا لە مووزەخانەی لووڤر لە پاریس پارێزگاری کراون . هەر لەم ماوەیەش دابوو ، پەیکەرتاش (داستانی چوار وەرزەکان)ی دروست کردوە ، جوانترینیان : وەرزی بەهارو وەرزی هاوینە . هونەرمەند بە هۆی وەستایی دەربڕینی لەشو ئەندامی چەند ئافرەتێکی بەژنو باڵا بەرزو شۆخو شەنگەوە ئەم ناوەرۆکەی بەرجەستە کردوە . ڕازاندنەوەی نافورەی واتە (فانتانی بێ‌گوناحان) بە لووتکەیەکی هەرە بەرزی - هونەری دیکۆری گۆرەپانەکان - دەژمێردرێ ، ئەم پڕۆژە هونەری‌یە جوانە بەشێك بووە لە پڕۆژەیەکی فراوانی ڕازاندنەوەی پاریس .

پەیکەری خواوەندی ڕاو : (دیانا) ، لە بەرهەمە نایابەکانی گوژۆنی داهێنەرە . . دامەزراندنی هونەری ئەم پەیکەرە لە جەستەی نەرمو نیانی دیانا و نێچیرەکەی پێك هاتوە . . نێچیرەوان بە دەستی چەپ کەوانەکەی گرتوەو دەستی ڕاستی لە مل مامزەکەی کردوە . ئەندازەکانی لەشو ئەندامی دیانا ، بە مەبەستێکی - پەیکەری مەنوومێنتی - کەمێك درێژ کراونەتەوە . . جۆری پرچ داهێنانی دیاناو بەرزکردنەوەی بەم شێوەیە بۆ سەرەوە - کە ئەوسا مۆدە بووە - . . جۆری هێمنی ڕووخسارو سیمای بیر کردنەوەو ووردبینی ، سەرنجی بینەران ڕادەکێشێ . بەشێك لە مێژوو نووسەکان دەڵێن کە دەم و چاوی دیانا دەربڕینی سیمای خۆشەویستی شاه هێنری دووەم ، (دیانا پواتێ) یە . لێرەدا پێویستە پەنجە بۆ کارتێ کردنی قوتابخانەی هونەری (فۆنتینبلۆ) درێژ بکەینو ئەوەش بەرچاو بخەین کە پەیکەرتاش لەم بەرهەمەیدا کەوتوەتە ژێر دەسەڵاتی قوتابخانەی ناوبراو .

ژان گوژۆن نزیکەی ٢٤ ساڵی دوا قۆناغی تەمەنی ، بۆ دیکۆرو ریلیفە هونەری‌یەکانی مووزەخانەی هەرە بە ناوبانگی (لووڤر) تەرخان‌کردوە . ئەم پڕۆژە گەورەیە لە ساڵی ١٥٤٨ تا ١٥٦٢ بەردەوام بوە . ئەم نەخشو نیگارانەی هونەرمەندی مەزن ، تاکو ئەمرۆش جێی شانازی‌و سەرسورمانی هونەر دۆستو گەریدەکانی مووزەخانەی لووڤرو شاری پاریسن .



(هەڵپەرکێی مەرگ) . ژان ژێرمان ١٥٤٤-١٥٤٥ پاریس . مووزەخانەی لووڤر



○
وريا احمد
١٩٨٧/٥/٢٢
○

# گفتوگـــــــــۆیەك

# لەگەڵ مەقام زانی کورد « حـــەمە درێـــژ »

ناوی تەواوی (محەمەد سەعید عەبدوڵڵا)یە ، ساڵی (١٩٢٦) لە کەرکوك گەڕەکی (بولاق)ی نزیك (بەرتەکیە) هاتۆتە دنیاوە .

لە گوتنو شیکردنەوەی (مەقام) بە گشتیو مەقامە ڕەسەنە کوردییەکان بە تایبەتی ، شارەزاییەکی تەواوی هەیە [١] .

(حەمە درێژ) لە بارەی (بەرتەکیە)وە بۆم دواو گوتی : (بەرتەکیە) : مەبەست لە تەکیەی تاڵەبانی شاری (کەرکوك)ە ، ئەم تەکیەیە دەکەوێتە ئەوبەری (خاسە) و ناوچەکە (ئاخر حوسێن)ی پێ دەڵێنو دەکەوێتە دەستە چەپی ئەو شەقامەی بۆ (سلێمانی) دەڕوات . ناوبراو وەك لە باوكو باپیرانی گوێی لێبووە ، گوتی : (جاران مەقام خوێنانو مەقام دۆستانی ئەم شارە گشتیان ، لەم شوێنەدا کۆدەبوونەوە چونکە لەوێ کۆڕی مەقام خوێندن دەبەستراو جار بووە ، ئەم کۆڕانەی بەرتەکیە ، زیاد لە شەوو ڕۆژێکیان خایاندووە ؟ !) حەمە لە باوکی واتە (سەعید عەبدوڵڵا) و لە مامی واتە (حاجی عومەر عەبدوڵڵا)وە فێری هونەری مەقام ناسینو مەقام خوێندن بووە ، خوالێخۆشبووی باوکی بەیانیان بۆ ماوەی نیو سەعاتێك لە بن منارەی بەرتەکیەدا ، مەقامێکی (مەنسووری) دەخوێندو دوایی دەیکردە مەقامی (قەزاز)و مەقام خوێنانو مەقام دۆستانی ئەو شارە ، بەیانیان چاوەنواری ئەو گوتنەی باوکی (حەمەدرێژ) یان دەکرد ، ئەمە بە شایەدی مەقام خوێن (سدیق بەندە غەفوور) [٢] کە لەم دانیشتنەمانا ئامادەبوو . (حاجی – عومەر عەبدوڵڵا)ی مامیشی ، پێش چەند ساڵێك لە تەمەنی (١٠٥) ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە ، ناوبراو نزیکەی (٥٠) ساڵ لەم بەرتەکیەیە مەقام خوێن بووە ، کاتێکیش ، لێرە مەقامی خوێندووە لە گەڕەکی (تسعین)ەوە گوێیان لە گوتنەکەی بووە ؟ ! [٣] .

**هەندێك لە مەقام خوێنە بلیمەتەکانی چەند نەوەیەك پێش ئێستای ئەم شارە :**

(شلتاغ) لە بەغدا چاکترین ئوستادی (مەقام) بووە ، ئەمە قسەی باوكو باپیرانە ، دەڵێن – لە ڕەچەڵەکدا خەڵکی ناوچەی (کفری) بووە ، هەرچەندە برا تورکومانەکانی ئێرە بە یەکێك لە ئەندامانی هۆزی (بەیات)ی دەزانن[٤] . شلتاغ ، ناونیشانی (کوڕی سوڵتان) بووە ، جارێکیان بۆ بەرتەکیەی کەرکووك دێت ، ئەو کاتە (شێخ عەبدورەحمان)[٥] ، لێپرسراوی تەکیەی تاڵەبانی دەبێت ، کە چاوی بە (شلتاغ) دەکەوێ ، بە دوای (وەلی مەقام خوێن)[٦] دا دەنێرێ ، پێی دەڵێن : (یا شێخ ئێستا – وەلی – سەرخۆشە . . .)

شێخ لە وەرامدا دەڵێ : (قەی ناکا بڕۆن بیهێنن . . .)
دوای ئەوەی (وەلی) دێت لە تەکیەدا لە گەڵ (شلتاغ) دادەنیشن ، چی مەقام زانو دەنگخۆشو مەقام دۆستی شاریش هەیە ، کە بەمە دەزانن ، لەو شوێنەدا ئامادە دەبن ، (شلتاغ)و (وەلی) شەوێكو ڕۆژێك بەردەوام مەقام دەخوێننو مەقام دەگۆڕن (لە گوتنی مەقامەکاندا دەستووری مەقام ڕەچاو دەکەن) چونکە هەریەکەیان ، دەیەوێ بۆ ئامادەبوانی بسەلمێنێ کە لە دەنگو مەقام گۆڕین و چینە جۆر بە جۆرەکانی دەنگو . . تاد ، لەوی دیکە شارەزاو بلیمەتو ئوستاد ترە . . لە ئەنجاما «(شلتاغ) پەکی دەکەوێ ! ؟ هەڵدەستێ ئەملاو ئەولای (وەلی) ماچ دەکاتو ڕوو دەکاتە شێخو دەڵێ : (یا شێخ ئەم پیاوە (واتە وەلی) ئوستادی منە ؟ !) .

دەنگو باسی دیکە لە بارەی لێهاتوویی و بلیمەتی (وەلی) زۆرن ، بۆ نموونە : (جارێکیان لە بەغداوە داوەت دەکرێ ، گەلێ کۆڕی مەقام خوێندن ، بە بۆنەی هاتنی ئەوەوە دەبەستن ، مەقام خوێنانی بەغدا ، ئەوانەی بەشداری ئەو کۆڕانە دەکەن ، پەکیان دەکەوێ کەچی (وەلی) هێشتا هەر نێ دەمێنێو دانامێنێ ؟ !

(حەمە پیرە) شاگردی ئەم (مەلا وەلی) یەو خەڵکی گەڕەکی بەرتەکیەبووە ، دوای ئەو ، (حەمە پیرە) لە مەقام خوێندنو مەقام ناسین دەور وەردەگرێو ناوبانگ دەردەکات .

(محەمەد خەلیل ئاغا) ئامێری (دەف)ی بۆ (حەمە پیرە) لێداوە ، تاوەکو گوتنی مەقامەکانی لێ فێربێت ، هەرچەندە تا ئەو لە ژیانا بووە ، (محەمەد خەلیل ئاغا) بەرامبەری ئەو نەیتوانیوە مەقام بخوێنێ ! ؟ بەلام کاتێك (حەمە پیرە) کۆچ دەکات ، ئەمەیان لەم هونەرەدا دەور وەردەگرێو ناو دەردەکات .

دوای (محەمەد خەلیل ئاغا)ش ، مەقام خوێنانی وەك (حاجی نەعمان ، مەلا سابیر ، مەلا تەها ، سەی جەمیل . باوكو مامی حەمە درێژ ، مەلا محەمەدە (تۆپاڵ – شەل) و گەلێکی دیکەش ناویان تیایدا دەرکردووە .

حەمە درێژ گوتی : وەك لە باوكو باپیرانەوە گوێمان لێبووە ، مەقام لەم ناوچەیە ، بەم شێوەی باسمانکرد . هاتۆتە خوارو بە نەوەی ئەمرۆ گەییوە ، ئەمە بۆ (مەقام) بە شێوەیەکی گشتی ، بەلام بۆ مەقامە ڕەسەنو تایبەتی یەکانی وەك (قەتار . ئەڵلاوەیسی ، خورشیدی . . تاد) لە ناو هۆزەکانی دەشتی (گەرمیان)ی وەك (داوودە ، تاڵەبانی ، جەباری ، زەنگەنە . شێخان) بلاوبووەو هەر لە کۆنەوە هەبووە . واتە هەر لە بەرتەکیەی ئەو شارەوە تا دەگاتە چەمچەماڵ . بە پێی ناوچەی (گەرمیان)و پەرتوبلاوی هۆزە ناوبراوەکان[٧] .

**ئەم مەقامانە یەکەمجار لە لایەن چ کەسێکەوە گوتراونو ناوەکانیان لە چییەوە هاتووە ؟**

بۆ وەرامی ئەم پرسیارە ، (خاڵە حەمە) دەڵێ ، من لە باوكو باپیرانەوە وام گوێ لێبووە : دەڵێن :

١ – مەقامی قەتار : لە سەردەمێکی زۆر کون ، لە گوندی (عەلیاوە)ی ناوچەی هۆزی (جەباری) لە لایەن (عەبدوڵلا) ناوێکەوە گوتراوە .

٢ – مەقامی ئەڵلاوەیسی : دەگێڕنەوە ، کابرایەکی زۆر دەنگخۆشو بلیمەت لە مەقام گوتنا ، ئەم شێوە گوتنەی داهێناوە ، ئەوانەی گوێیان لە گوتنەکەی بووە ، لە تاوانا گوتوویانە (ئەڵلا وەیسی ، ئەڵلا ، ئەڵلا وەیسی . . . واتە دەم



(عەلی مەردان)

خۆش وەیسی ، بیلّی وەیسی گیان ، بەردەوامبە وەیسی . . تاد) ، تا لە ئەنجاما مەقامەکە ئەم ناوی (ئەڵلاوەیسی)یەی بە سەردا براوە .

٣ – مەقامی خورشیدی : دەڵێن ، یەکەمجار لە لایەن پیاوێکی (خورشید) ناوەوە ، گوتراوە ، بۆیە مەقامەکە بە ناوی ئەوەوە ناونراوە .

جا بەم پێیە لەوەیە ، مەقامی (مەنسووری) یش ، وەك مەقامی خورشیدی ناوی لێنرابێ‌و . . تاد .

*** ئایا پێش (عەلی مەردان) کەسی دی ئەم مەقامە ڕەسەنانەی تۆمارکردووە ؟**

بۆ وەرامی ئەم پرسیارەش خاڵە حەمە گوتی : ساڵەکانی (٣٠) واتە پێش خواڵێخۆشبوو (عەلی مەردان) چەن مەقام خوێنێکی ئەم شارە وەك : (حەمەی کۆترەمل ، عەبدوڵلا سەعید یاخود عەبەی سەعە عەربەتی ، ئەمین باغەوان) بڕیاریاندا ، بچن لە بەغدا مەقامی (قەتار) لەسەر (قەوان) تۆمار بکەن .

(ئەمین باغەوان)[٩] خاوەنی دەنگێکی تابڵێی بەرزبوو ، دەنگە بەرزەکەی دەبێتە هۆی تێك‌دان‌و خراپ‌کردنی ئامێری تۆمارکردنەکە ، بۆیە لەو کۆمپانیای قەوان تۆمارکردنە ، دارکاری دەکەن ! ؟ دوای ئەویش هەر ئەو ماوەیە ، (حەمەی کۆترەمل‌و عەبەی سەعە عەربەتی) مەقامەکە بە ناتەواوی تۆمار دەکەن . . چونکە مەقامی (قەتار) لە سێ پارچە یاخود چینی دەنگ وەك خوارەوە پێك دێت :

١ – پارچەی یەکەم – مەقامی قەتارە ، ئەم پارچەیە بنچینەی مەقامەکەیە .

٢ – پارچەی دووەم – هەر مەقامی قەتارە ، بەلام دابەزینێکی تێدایە ، پێی دەڵێن ، شکاندنەوە ، بەئاسانی هەستی پێ‌دەکرێ .

٣ – پارچەی سێیەم – پارچەی سێیەمی مەقامی قەتار ، بریتی‌یە لە مەقامی (خاوکەر) . بەلام ئەوان ، تەنیا پارچەی یەکەمی مەقامەکە (واتە بنچینەی مەقامەکە) یان خوێندووەو پارچەی دووەم و سێیەمی ئەو مەقامەیان نەخوێندووە ؟ !

قەوانەکەی (عەبدوڵلا سەعید) تەنیا ڕووی یەکەمی پارچەی یەکەمی (قەتار)ی لەسەر تۆمار کراوە . بە ناتەواویش بەجێی هێشتووە . ڕووی دووەمی ئەو قەوانە . گۆرانی‌یەکی عەرەبی لەسەر تۆمار کراوە ! ؟

دوای ئەوەی لە بەغدا گەڕانەوە . (شێخ حەسیب) بەدوایدا ناردن‌و پێی گوتن : بۆچی مەقامەکەتان بە تەواوی نەخوێندو سەقەتتان کرد ؟ لەوەراما گوتیان : یا شێخ کە لە (ئەمین)یان‌دا ، ئێمەش شێواین‌و خۆشمان نەمانزانی چیمان گوت ؟ !

(مەلا تەها)[١٠]ی مەقام خوێنیش هەر پێش (عەلی مەردان) لە بەغدا ، لە ماوەی شەوو ڕۆژێکدا (٤٠) قەوانی تۆمار کردووە ! ؟ یەکێك لەو بەرهەمانەی بە تۆماری گەیاندبوون ، مەقامی (قەتار) بوو ، هەرچەندە ئەو مەقامە (قەتار)ەی ئەو تۆماری کردبوو ، وەك (خاڵەحەمە) گوتی : (لەگەڵ مەقامی (قەتار) ی ئێمە نەختێ جیاوازی هەبوو ، بەلام ناشتوانین بڵێین ، (قەتار) نیە ؟ !

*** یەکەمجار (عەلی مەردان) چۆن بەرهەمی تۆمارکرد ؟**

لە بەغدا (نەعیم)ە جوو دەبێ ، پاش ئەوەی ناوبانگی دەنگخۆشی‌و بلیمەتی خواڵێخۆشبوو (عەلی مەردان)ی بەرگوێ دەکەوێ ، یەکسەر بۆ کەرکوك بەرێ دەکەوێت ، دەیدۆزێتەوەو لە گەڵ خۆی بۆ بەغدای دەبات ، ئەوەی لێرەدا گرنگە بگوترێ : (عەلی مەردان) یەکەم مەقام خوێنی کوردبووە ، مەقامی (قەتار)ی بەبێ کەم‌و کورتی تۆمارکردووە .

*** جاران هەریەکە لەو مەقامە ڕەسەنانە بەستەی تایبەتی خۆی هەبووە :**

بۆ نموونە :

١ – مەقامی (ئەڵلاوەیسی) ، چونکە لە سێ پارچە پێك‌دێت‌و



(شەهابە)

پارچەی سێیەمی دەبێتە (مەقامی ڕاست) ، دەبێ بەستەکەیشی لەسەر مەقامی ڕاست بێ ، جاران گۆرانی (ئەرێ ڕاستەی خیابان)ی لە دوا دەگوترا .

٢ – مەقامی خورشیدی : گۆرانی (لەبەر نازی چاو بازان)ی بەدوادا گوتراوە .

٣ – مەقامی قەتار : گۆرانی (ئەرێ هۆ لەیلێ)ی لە گەڵا گوتراوە .

٤ – مەقامی ئای ئای : (لێم یاخی لێم یاخی) لە گەڵا گوتراوە .

**مەقام خوێنانی دوای عەلی مەردان**

دوای خوالێخۆشبوو (عەلی مەردان) مەقام خوێن هەن ، بەڵام ئەوانەی بەرهەمی (واتە مەقامی) تۆمار کراویان ، (چ لە ئێسگە بێ یا تەلەفزیۆن) هەیە ئەوانەن (حوسین عەلی ، حەسەن گەرمیانی ، سەلاح داوودە) ئەمەی دوایی نەوەی (خدر بارام چاوەش)[١١]ی مامۆستای (عەلی مەردان)ە کە لەو مەقامە ڕەسەنانە تابڵێی بلیمەت و لێهاتووبووە .

وەك خوێندتانەوە ، کاتێ خۆی لە ناو ئێمەی کورد ، (بە تایبەتی لەم ناوچەی گەرمیانەدا) ، بە دەیان (مەقام زان) و (مەقام خوێن) هەبووە ، کەچی ئەمڕۆ بە داخەوە ، هەموو ئەم دەشتی (گەرمیان)ە ، بگەڕێی ، مەگەر بەدەگمەن ، ئەگینا تووشی (مەقام ناس) یاخود (مەقام زان) نەك (مەقام خوێن) نابیت[١٢]؟ ! ڕاستە ئێمە (مەقام خوێن) مان هەن ، بەڵام زۆربەیان ناتوانن جیاوازی دوو لەو مەقامە ڕەسەنانە دەست نیشان بکەن ، ناتوانن وەك نموونە (مەقامی قەتار) شیبکەنەوە . .

بۆیە ئەم قسەیە بە هەل دەزانم و دەڵێم : خۆزگە هەندێ لە گەنجە دەنگخۆشەکانمان (بە تایبەتی ئ ناوچەی گەرمیان) چونکە هەر لە منداڵی یەوە گوێیان بەم مەقامە ڕەسەنانە ، ئاشنابووەو ئاودراوە ، ڕوویان لەم مەقامە ڕەسەنە کوردی یانە دەکرد و بەدوایاندا دەگەڕان و ماندوو دەبوون ، واتە فێری شیکردنەوەی پارچەو چینەکانی دەنگیان بن و بتوانن لە یەکیان جیا بکەنەوە . . تاد . بەڵکو دواتر بۆ ئێسگەو تەلەفزیۆنیان تۆماربکەن ، تاوەکو گوێی منداڵی کوردی ئەمڕۆیان پێ ئاو بدرێ و ئاشنابێ . . لێرەدا ڕەنگە خوێنەر بڵێ : (ئەو مەقامانە بۆ ئێستگە تۆمارکراون ؟ !) ڕاستە ئەو مەقامانە لە (ڕادیۆی کوردی) یالەسەر قەوان تۆمارکراون ، بەڵام ئایا گوێتان لەو پارچە (مۆسیقا – SOLO تقاسیم) انە ، گرتووە ، کە لە بەینی پارچەکانی مەقامەکان لێدراون ، ئایا ئەو مۆسیقا ژەنانەی مۆسیقای میانی پارچەکانی ئەو مەقامانەیان ژەنیوە ، مەقامەکانیان ڕازاندۆتەوەو هەندەی دیکە بەرەو بەرزی و جوانی یان بردوون یاخود (ئیفلیج)یان کردوون ؟ ! کەس ناتوانێ نکوولی لە لێهاتوویی و دەنگخۆشی و هونەرکاری خوێندنی مەقامی بۆ نموونە خوالێخۆشبوو (عەلی مەردان) بکات . . بەڵام گەر بە ووردی هەست لە مۆسیقای میانی پارچەکانی زۆربەی ئەو مەقامانە بگرین ، ئەو مۆسیقا ژەنانە ، لەبەر هەر هۆیەك بووبێت ، دوور کەوتوونەتەوە ، لە تام و بۆومۆرکی ڕەسەنی کوردی و بەرەو لای دیکە ڕۆیشتوونەو لە ئاوو بای کوردی دەرچوونەو شتی نابەجێ و دوور لەو مەقامانەیان ژەنیوە . ئەم قسانەی سەرەوە دەتوانین بسەپێنینە سەر زۆربەی بەرهەمە کۆنەکانی خۆمان چونکە زۆربەی ئەو مۆسیقا ژەنانەی لەو بەرهەمانەدا بەشداربوونە ، کورد نەبوونە ، بۆیە مەگەر بە دەگمەن ئەگینا نەیان توانیوە بچنە ناو ناخی ڕەسەنایەتی و مۆرکی کوردی یەوە ، چونکە بە گوێیان ئاشنا نەبووە ؟ ؟

بەڵام گەر ئەمڕۆ هەمان ئەو مەقامانە بە قورگی لێهاتوو و گوێی ئاودراوو ئاشنا بەو مەقامە کوردی یانەو دەست و پەنجەی مۆسیقا ژەنی شارەزای ئەو بابەتانە ، ئەوە بێ شك کارێکی یاخود بەرهەمێکی گەر لەسەدا سەدیش نەبێت ، ئەوە نزیکی ئەو ڕێژەیە دەبێت .

**پەیوەندی نێوان مەقام خوێنەکانی بەرتەکیەو شارەکانی دیکەی کوردستان :**

گەلێ جار (شێخ شەریف)[13] لە هەولێرەوە هاتووە بۆ لای مام ، بەو مەبەستەی لە بەرتەکیە کۆڕی مەقام خوێندن ساز بدرێتو ئەویش بەشداری تێدا بکات . دیسانەوە (شەهابە)[14]ش گەلێ جار بۆ هەمان مەبەست هاتووە . مام دەیگێڕایەوە دەیگوت ، (شەهابە)دەهاتە لامو دەیگوت . مامە مەقامێکی (مەنسوورێ)م بو نالێی؟ منیش کە بۆم دەخوێند ، دەیگوت : مامە بەڵکو بە تەواوی بیخوێنی . . واتە چەند لقی لێ دەبێتەوەو چۆن دەگەڕێتەوەو . . تاد . زۆریش زیرەك بوو ، زوو وەری دەگرت ، (شەهابە) بە کوردی و تورکی و عەرەبی مەقامی خوێندووە ، هەرچەندە پێ (مەی) هەڵی نەکردووە ، لە گەڵ ئەوەشدا (قورئان) خوێنێکی ئوستادیش بووە ! گەلێ مەقامو قۆریاتی زۆر بە لێهاتوویی خوێندووە (شەهابە) بلیمەتبووە ، دەنگخۆشو لێهاتوو بووە . .

(ئەم گفتوگۆیە ڕۆژی (١/٣/١٩٨٥) لە (کەرکوك – بەرتەکیە) ماڵی «حەمە درێژ» ئەنجام دراوە) .

**پەراوێزو سەرچاوەکان**

١ – مەبەست لە مەقامە ڕەسەنە کوردی‌یەکان : مەقامەکانی ناوچەی (گەرمیان)ە وەك (قەتار ، ئەڵلاوەیسی ، خورشیدی ، خاوکەر ، ئای ئای . . تاد) .

٢ – (سدیق بەندە غەفوور) کە لەم دانیشتنەدا ئامادەبوو ، مەقام خوێنێکی تورکمانی ئەو شارەیەو ، وەستاو شارەزای ئەم کارەیە ، بە تایبەتی لە مەقامەکانی (قۆریات) ، بەیاتی تورکو . . تاد) لە تەمەنیشدا هاوتای (حەمە درێژ)ەو هەم هاوسێ‌یشیەتی .

٣ – لێرەدا ، بە دەنگێ بەرزی (حاجی عومەر عەبدوڵلا)ی مامی (خاڵە حەمە درێژ) دەنگی بە تواناو بەرزی (سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی)م بە بیرکەوتەوە ، (بڕوانە گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ) ژمارە (٩٣)ی ساڵی (١٩٨٢) ل (٧٧) .

٤ – (حاجی هاشم رجەب) کتێبی (المقام العراقي) چاپی دووەم ، ساڵی (١٩٨٣) بەغدا ، لە چاپخانەی (المثنى) بە چاپ گەیشتووە ، لە لاپەڕە (٦٤)دا دەڵێ :

(لە کەرکوك (مەلا وەلی)و (شلتاغ) بە دامەزرێنەری مەقامی عێراق دادەنرێن) . هەروەها لە لاپەڕە (١٠٣)ی هەمان کتێبدا دەڵێ :

(مەلا وەلی – کە عەبدورەحمان وەلی) یشیان پێ دەگوت ، لە (کفری) ساڵی (١٧٤٣)ی زایین هاتۆتە دنیاوەو ساڵی (١٨٣٠) ز کۆچی دوایی کردووە ، مامۆستای (شلتاغ بووە) دیسانەوە لە لاپەڕە (١٠٤) یشدا ، دەخوێنینەوە :

(ڕەحمە تۆڵلا شلتاغ) بە (شلتاغ) ناوی دەرکردبوو ، زۆربەی پەیوەندی دارانی مەقام بە یەکێك لە کوردەکانی عێراقی دەزانن ، هەرچەندە چەن کەسێك لە خزمەکانی دەڵێن : ناوبراو لە تورکەکانی (شام)ەو بە منداڵی لە گەڵ باوكو مامی بۆ بەغدا هاتووەو هەر لەوێش لە تەمەنی (٧٥) ساڵی‌دا کۆچی دوایی کردووە (١٢١٣ – ١٢٨٨)ك .

٥ – (حەمە درێژ) دەربارەی ئەو (شێخ ئاورەحمان)ە گوتی : (٢٢) ساڵ زیاترە کۆچی دوایی کردووە . ئەم ڕووداوەش واتە هاتنی (شلتاغ) بۆ (کەرکوك) پێش ئەو کاتە بە ماوەیەکی زۆر بووە ؟ !

٦ – (وەلی) کە دواتر واز لە خواردنەوەی (مەی) دێنێ و دەست بە نوێژو خوا پەرستی دەکات . ناونیشانی (مەلا وەلی) وەردەگرێ . ناوبراو دانیشتووی شاری (کەرکوك) گەڕەکی (پیریادی) بووە .

٧ – لەودانیشتنە تایبەتی‌یەدا کە لە ڕێکەوتی (٢٦/٧/١٩٨٤) لە ماڵی خۆمانا لە گەڵ گۆرانی بێژ (ناسری ڕەزازی) کردمو لەسەر (کاسێت) تۆمارم کردووە . گوتی : (ئەم مەقامە واتە (ئەڵلا وەیسی) لای ئێمەش (واتە لە ناوچەی سنە) هەیە . بەڵام لای ئێمە دوو چینی دەنگە . یاخود دوو پارچەیە . واتە پارچەی سێ‌یەمی لە گەڵا نیە . بۆ ناوی مەقامەکەش گوتی : لای ئێمە (حەمە کەچەڵی) پێ دەڵێن ؟ !

٨ – بۆ شی‌کردنەوەی ئەم مەقامەو شارەزابوونی نهێنیەکانی . بڕوانە گۆڤاری (نەوروز – العراق) ژمارە (١)ی ساڵی (١٩٨٦) ل (٩٠–٩٨) .

٩ – (حەمە درێژ) گوتی . (ئەمین باغەوان) خاوەنی دەنگێكبوو . لێرە (واتە لەبەرتەکیە) مەقامی بخوێندایە . لە گەڕەکی (قۆریە) گیزەی دەهات ؟ ! تێبینی ئەوەش بکەن ئەو کاتە (بلندگۆ – مایکرۆفۆن) و (سپیکەر – سماعە) نەبووە .

١٠ (کەمال لەتیف سالم) لە کتێبی (اعلام المقام العراقي ورواده)دا . کە ساڵی (١٩٨٥) لە بەغدا بە چاپ گەیوە . لە لاپەڕە (٨٣)دا دەربارەی (مەلا تەها) وە دەڵێ : (هەوڵمدا زانیاری تەواو لە بارەی ئەم بلیمەتەوە . کۆ بکەمەوە ، ئەوەبوو (کاسێت) ێکم چنگ کەوت ژمارەیەك لەو مەقامانەی تێدابوو کە ناوبراو ساڵی هاتنی بۆ بەغدا (١٩٢٥)ی زایین تۆماری کردوون . ناوبراو ساڵی (١٨٧٦)ی . ز لە گەڕەکی (موسەڵلا)ی (کەرکوك) هاتۆتە دنیاوە ، لە ناو خێزانێك پەروەردە بووە . زۆربەی ئەندامانی مەقام خوێنو مەقامزان بوونە . بۆ نموونە (مەلا سابیر)ی برای یەکێك لە مەقام خوێنە ناودارەکانی ئەو شارەبووە . تیپی تایبەتی بۆ (مەولوود) خوێندن هەبووە . ناوبراو کاری زۆری لە (مەلا تەها)ی برای کردووە ، بە تایبەتی چونکە ناوبراو لە زۆربەی ئەو (مەولوود)و کۆڕی مەقام خوێندنانەدا ، لە گەڵیابووە ، (مەلا تەها) بە کاری بازرگانی‌یەوە خەریك بووە ، بۆ زۆر شارە گرنگەکانی عێراق وەك (بەغداو مووسڵ) چووە . لەو شوێنانەدا چاوی بە زۆر لە مەقام خوێنانیان کەوتووەو برادەرایەتی لە گەڵیانا بەستووە . وای لێ هاتووە گوێی لە مەقام خوێندنیانو گوێیان لەمەقام خوێندنی گرتووە ، لێی فێربوونەو لێیان فێربوونەو ، مەقامی (عومەر گولە) شی لە مامۆستای خۆی (محەمەد خەلیل ئاغا) وە فێربووە) .

ناوبراو هەر لەو کتێبو هەمان لاپەڕەدا دەنووسێو دەڵێ : (هەروەك زانراوە کەرکوك ژمارەیەکی زۆر لە مەقام خوێنانی گەورەو بلیمەتی تێدا هەڵکەوتووە ؟ ! بۆ نموونە – ڕەحمەتوڵلای کوڕی سوڵتان ، کە بە (شلتاغ) ناوی دەرکردبوو – شێخ جەلال حەنەفی – لە کتێبی – المغنون البغداديون – دا ، لەم بارەیەوە دەڵێ : ناوبراو بە (شلتاغ) دەناسراو زۆربەی خەڵکی دەڵێن کوردەو ساڵی (١٢٨٨)ی کۆچی لە شاری (کفری) هاتۆتە دنیاوە) . لەبارەی (مەلا وەلی) یشەوە دەڵێ : (ناوی ئاورەحمان بووە ، لە شاری (کفری) لە دایك بووەو کۆچ کردنیشی ساڵی (١٢٤٦)ی کۆچی ، هەر لە وشارە بووە ، ناوبراو هاتۆتە بەغداو گەلی لە مەقام خوێنانی ئەودەمە لێی فێربوونەو لێیان وەرگرتووە ، بۆ نموونە (شلتاغ) هەروەها (عەلی کوڕی سەفو) کە ناونیشانی شێخی مەقام خۆینانی مووسڵی هەبووە ؟ !

١١ – بڕوانە – عەلی مەردان – گۆرانیەکانم – بەرگی یەکەم – ساڵی (١٩٨١) چاپخانەی (دار الحرية)ی بەغدا . لاپەڕە (٧) .

١٢ – ئێمە دەتوانین بە یەکێکی وەکو ئەم (خاڵە حەمە درێژە) بڵێین (مەقامزان) .

١٣ – کاتی خۆی تەکیەی (شێخ شەریف) لە ناو قەڵای هەولێر بووە ، بەڵام ئەمڕۆ تەکیەکە هەر بەو ناوەوەیەو دەکەوێتە گەڕەکی زانیاریو لەلایەن نەوەی ناوبراوەوە (شێخ فوئاد) بەڕێوە دەبرێ .

١٤ – بڕوانە گۆڤاری کاروان ژمارە (٣١)ی ساڵی (١٩٨٥) ل . (٥٨–٦٠) .

زانیاری

# مەترسی یەکانی کارەباگرتن و جۆرەکانی

سامال حسن صاحبقران
ئەندازیاری کارەبایی

**لە دوایی یەکانی** سەدەی نۆزدەهەمدا ووزەی کارەبایی بە **گشتی کەوتە بەکارهێنان وە** شۆڕشێکی گەورەی بەرپاکرد لە **هەموو بوارەکانی** ژیاندا ، ئەم ووزەیە بەکارهێنرا لە **رووناککردنەوەو ئیش پی کردنی** کارگە گەورەکانو هاتو چۆو **رادیۆو تەلەفزیۆنو ئامێرە پزیشکی یەکاندا** وە وای لیهات کە **بووە پێویستی یەکی سەرەکی ژیان** ، بە جۆرێك کە لە هەموو **ماڵێکدا بە گەلێك جۆر سوودی لێ** وەر بگیرێ . بەڵام لە گەڵ **ئەو هەموو سوودەشدا ئەم ووزەیە** مەترسی یەکی زۆر گەورەشی **هەیە بۆ سەر ژیان ئەگەر هاتو** لە بەکار هێنانیدا کەم **تەرخەمی کرا ، وە تائێستاش هیچ جۆرە چارەسەرێك بۆ ئەو مەترسی یە نەدۆزراوەتەوە جگە لەوەی** کە لە بەکار هێنانیدا ئەو **پەڕی وووریایی** بەکار بهێنرێتو خۆی لێ بپارێزرێت .

**لە کۆندا** تەنها جەنەرەیتەرەکان (Generators) **دادەمەزرێندرانو وایەرو گلۆپەکانیان** لێ دەبەستراو بەکار **دەهێنران کە ئەوەش** مەترسی یەکی زۆری هەبوو بۆ سەر **ژیانیان ، وە ئازاری زوربەی ئەوانەی دەدا کە لەو بوارەدا ئیشیان دەکرد ، وە هەندێك جار دەبووە هۆی مردنو لە ناوچوونیان** .

**تەزووی کارەبایی چۆن کار دەکاتە سەر ئەندامەکانی لەش :**

کارەبا کاتێك کار دەکاتە سەر لەشی مرۆڤ ، کە سووری کارەباکە لە لەشی مرۆڤەکەوە تەواو ببێت ، واتە لەش بەلای کەمەوە بەر دوو جەمسەری سەرچاوەیەکی کارەبایی بکەوێت و تەزوویەکی کارەبایی پیا تێپەر بکات .

خۆ ئەگەر لەش بەر یەك جەمسەری سەرچاوەیەکی کارەبا کەوت ئەوا تەزوو دروست نابێتو هیچ مەترسی یەکی نی یە ، بە مەرجێك هیچ شوێنێك لە لەش نە ڕاستەوخۆ نە بە بۆنەی گەیەنەرێکەوە بەر زەوی نەکەوتبێت .

هەر لەبەر ئەو هۆیەیە کە چۆلەکەیەك دەبینین بە سەر تەلێکی کارەباوە کارەباکە نایگرێت ، چونکە قاچی تەنها بەر یەك جەمسەری کارەباکە کەوتووەو تەزوو بە لەشیدا تێ ناپەرێت . ئەو تەزووەی کە بە لەشدا تێپەردەکات بە پێی ئەم هاوکێشەیە دەگۆرێت

$$\text{تەزوو (ئەمپێر)} = \frac{\text{پەستان (ڤۆلت)}}{\text{بەرگری (ئۆم)}}$$

لەبەر ئەوەی لەشی مرۆڤ رێژەیەکی بەرز ئاوی تێدایە کەواتە بە گەیەنەرێکی کارەبایی باش دادەنرێتو بەرگری یەکەی زۆر کەمە ، بە تاقی کردنەوە دەرکەوتووە کە بەرگری لە دەستێکەوە بۆ دەستێکی تری مرۆڤ نزیکەی ١٠٠٠ ئۆمە کاتێك دەست شیدار یان تەربێت ، خۆ ئەگەر دەست ووشك بێت ئەوا بەرگری یەکە زیاد دەکاتو دەبێتە نزیکەی ١٠٠٠٠٠٠ ئۆم ، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە پێستی مرۆڤ بەرگری یەکی گەورەی هەیە بۆ کارەبا ، واتە پێست پاریزەرێکی گەورەیە بۆ مرۆڤ دژی کارەبا چونکە تا بەرگری زیادبێت تەزوو کەم دەبێتەوە .

**جۆرەكانی كارتێكردنی تەزووی كارەباش ئەمانەن :**

١ – هەست بە گەرمایی كردن .

٢ – هەست بە ئازار كردن

٣ – سووتانەوەو سوور هەڵگەڕان

١ – هەست بە گەرمایی كردن :

كاتێك تەزوویەكی كارەبایی بە لەش‌دا تێپەڕ دەكات ، ئەوە دەگەیەنێت كە ووزەیەك لە سەر چاوە كارەبایی‌یەكەوە گوێزراوەتەوە بۆ لەش ، ئەم ووزەیەش لە لەش‌دا دەگۆڕێت بۆ ووزەیەكی گەرمی ، ئەو گەرمی‌یەش دەبێتە هۆی گەرم‌كردنی ئەو بەشەی لەش كە تەزووەكەی پیا تێپەڕیوە ، جا ئەگەر ووزەكە زۆربوو ئەوا ئەو بەشەی لەش دەسووتێنێت . ووزەی كارەباش بە پێی بەرگری‌و كات‌و دووجای تەزوو دەگۆڕێت بە پێی ئەم هاوكێشەیە : ووزە (جول) = تەزوو (ئەمپێر) × بەرگری (ئۆم)×كات (چركە) . تا تەزوو زیاتربێت قەبارەی شوێنە سووتاوەكە یا گەرم‌بووەكە زیاتر دەبێت .

٢ – هەست بە ئازار كردن :

تێپەڕبوونی تەزوویەكی كارەبایی كەم بە ناو هەستە دەمارەكاندا دەبێتە هۆی هەست‌كردن بە ئازارێكی وەك دەرزی بە پەنجەدا كردن ، ئەو ئازارەش بە پێی زیادو كەمی تەزووەكە دەگۆڕێت .

ئەگەر تەزوویەكی زیاتر بە ناو هەستە دەمارەكاندا تێپەڕببێت ئەوا ماسولكەكانی ئەو شوێنەی تەزووە كارەبایی‌یەكەی پێدا دەڕوات بە شێوەیكی خۆنەویستی گرژ دەبنەوە ، ئەوەش ئاشكرایە كە دەستت رادەكێشێتە دوواوەو پەنجەكانت دادەخەیت بە شێوەیەكی خۆنەویستی كاتێك دەستت بەر سەرچاوەیەكی كارەبایی دەكەوێت . ئەو تەزووەی دەبێتە هۆی ئەو دیاردەیەی پێشوو مەترسی‌یەكی ئەوتۆی نی‌یە بۆ سەر ژیان ، بە مەرجێك رووكاری ناوەوەی پەنجەكان یان لەپی دەست بەر تەلی كارەباكە نەكەوێت چونكە لەم كاتەدا داخستنی پەنجەكان دەبنە هۆی گرتنی تەلە كارەباكە بە دەست‌و مەترسی‌یەكە زیاتر دەبێت .

هەر وەها ئەم جۆرە تەزووە دوور نی‌یە ببێتە هۆی كەوتنە خوارەوەی ئەو كەسەی لە شوێنێكی بەرزدا كارەبا دەیگرێت بە بۆنەی گرژبوونەوەی لە پڕی ماسولكەكان .

ئەگەر تەزووەكە لەوەش زیاتر بێت ئەوا توانای ئەوە نامێنێت كە ماسولكەكان بە ویستی خۆمان گرژیان خاو بكەینەوە و لە شێوەی خۆیان‌دا دەمێننەوە ، واتە ناتوانرێت خۆ لە سەرچاوەی كارەبا كە دوور بخرێتەوە ئەمەش دەبێتە هۆی مردن ئەگەر سەرچاوەكە نەبڕرێت یان یەكێك فریامان نەكەوێت .

ترسناك‌ترین تەزوو ئەو تەزووەیە كە بە دڵ‌دا تێ پەڕ دەكات ، تێپەڕبوونی تەزوویەكی كەم نزیكەی (٦٠ مایكرۆ ئەمپێر)[١] بە ناو دڵ‌دا دەبێتە هۆی دڵە لەرزە[٢] ، واتە زمانەكانی دڵ بە نارێك‌وپێكی دادەخرێن‌و دەكرێنەوە وە دڵ بە هیچ جۆرێك ناتوانێت پاڵ بە خوێنەوە بنێت بۆ بەشەكانی لەش‌و سوڕانی خوێن تێك دەچێت ، لەم رووداوەدا پاش ماوەیەكی كەم مێشك دەوەستێت چونكە خوێنی بۆ نەچووەو ئۆكسجینی نەگەیشتووەتێ تا ژیانی بەردەوام‌بێت ، وە وەستانی مێشكیش مانای مردن دەبەخشێت .

لەوەش ترسناك‌تر ئەوەیە كە بە نەمانی تەزووەكەش دڵە لەرزەكە هەر بەردەوام دەبێت ، چارە سەركردنی دڵە لەزرەش بە تێپەڕكردنی تەزوویەكی كارەبایی بەرز بە ناو دڵ‌دا دەكرێت بۆ ماوەیەكی كورت ، ئەو تەزووە پاشان سەر لە نوێ لێدانێكی ئاسایی دەست پێ دەكاتەوە .

ئەم چارەسەر كردنەش بە ئامێرێكی پزیشكی تایبەتی دەكرێت كە پێی دەوترێت راتەكێنەری دڵ (جهاز الرجة القلبیة)[٣] وە لە نەخۆشخانەكاندا هەیە .

ئەگەر هات‌و تەزووی كارەبایی بە ناو كۆئەندامی هەناسەدان یان بەو بەشەی مێشك‌دا كە هەناسە بەرێوە دەبات بڕوات ، ئەوا دەبێتە هۆی ئازاردان یان وەستانی ئەندامەكانی هەناسەدان بە پێی كەمی‌و زۆری تەزووەكە .

٣ – سووتانەوەو سوور هەڵگەڕان :

تەزوویەكی كارەبایی DC زۆر كەم بۆ ماوەیەكی زۆر تێپەڕببێت بە نێوان دوو خاڵ لە پێست‌دا ، دەبێتە هۆی سووتانەوەو سوور بونەوەی ئەو دوو خاڵە .

ئەم سووتانەوەو سووربوونەوەیە کیمیکی یە ، ئەویش لە ئەنجامی شیبوونەوەی ئارەق بۆ مادەیەك کە ئەتوانێ پێست بسووتێنێت‌و زامداری بکات .

ئەگەر ئەو تەزووە لە (١٠ مایکرو ئەمپێر) زیاتر بێت ئەوا مەترسی زۆرە بۆ ژیان .

بۆ روونکردنەوەی باسەکانی پێشوو ئەم نەخشەیە دەخەینە روو کە جۆرەکانی کارتێ‌کردنی تەزوو نیشان دەدات وە نەخشەکە دەگونجێت بۆ تەزوویەکی a.c. کە لەرینەوەکەی (٥٠–٦٠ هێرتز 50 – 60 HZ) بێت وە بۆ یەك چرکە کار بکاتە سەر مرۆڤێکی ئاسایی پێست ساغ .

| تەزوو | یەکەی تەزوو | کارتێ‌کردنەکەی |
|---|---|---|
| ٥ر٠–١ | میلی ئەمپێر[4] | تەنها هەستی پێ‌دەکرێت |
| ٥ | میلی ئەمپێر | بەرزترین تەزووە کە نایێتە هۆی ئازار |
| ١٠–٢٠ | میلی ئەمپێر | هەست بە ئازار دەکرێت بەڵام نابێتە هۆی گرژ بوونەوەی ماسولکەکان |
| ٥٠ | میلی ئەمپێر | ئەبێتە هۆی ئازار ، بوورانەوە ، بێ‌هێزی دڵ‌و هەناسە ئاسایی بەردەوام دەبن |
| ١٠٠–٣٠٠ | میلی ئەمپێر[5] | دڵە لەرزە روو ئەدات بەڵام هەناسە بەر دەوام دەبێت |
| ٦–١٠ | ئەمپێر | دەبێتە هۆی گرژبوونەوەی ماسولکەکان . بە لاچوونی تەزووەکە دڵ بە ئاسایی لێ‌دەدات . بە شێوەیەکی کاتی هەناسەدان دەوەستێت . ئەو شوێنانە دەسوتێن کە بەزۆری تەزوویان پیا تێ‌پەڕیوە |
| ١٠ بەرەو زۆرور | ئەمپێر | هەمان کارەکانی پێشوو لە گەڵ زیادبوونی ئازارو سووتان |

**فریا کەوتنە سەرەتایی یەکان :**

لە هەموو شتێك گرنگ‌تر لە فریاکەوتنی کارەبا گرتووەکاندا خێرا جوڵانەوەو زیرەکی ئەو کەسەیە کە بەو کارە هەڵدەستێ .

پێش هەموو شتێك دەبێت سەرچاوەی کارەباکە ببڕرێت وە ئەگەر نەتوانرا خێرا ببڕرێت ئەوا پێویستە کارەبا گرتووەکە لە سەرچاوەی کارەباکە دوور بخرێتەوە ، ئەمەش لە پەستانە نزمەکاندا (Low Voltages) واتە ٥٠٠ ڤۆلت کەمتر ، بە راکێشانی کارەبا گرتووەکە لە جل‌و بەرگەکانی یەوە دەبێت (بە مەرجێك ووشك بێت) ، وە بە هیچ جۆرێك نابێت دەست لە لەشی بدرێت چونکە ئەم کارە دەبێتە هۆی کارەبا گرتنی رزگار کەرەکەش .

ئەگەر وارێك‌کەوت کە نەتوانرا لە جل‌و بەرگەوە رابکێشرێ یان جل‌و بەرگەکەی تەڕ بوون ، ئەوا پێویستە دەستکێشی نەگەیەنەر (لاستیك) لە دەست بکرێت یا هیچ نەبێت بە پەڕۆی ووشك بگیرێت‌و رابکێشرێت ، وە ئەشتوانرێت نەگەیەنەرێك (تەختە یان لاستیك) بخرێتە ژێر پێ‌یەوە . وە لەم کاتانەدا چاکتر وایە تەنها یەك دەست بەکار بهێنرێت .

بەڵام لە پەستانە بەرزەکاندا (High Voltages) دەبێت پێڵاوی لاستیك لەپێ بکرێت‌و دەست کێشی لاستیك لە دەست بکرێت وە بە نەگەیەنەرێکی درێژ (دار یان تەختە) لەشی کارەباگرتووەکەو سەرچاوەی کارەباکە لەیەك دوور بخرێنەوە

دوای ئەوەی کارەبا گرتووەکە لە سەرچاوەی کارەباکە دوور دەخرێتەوە ، ئەگەر لە هۆش خۆی نەچووبوو ، ئەوا خێرا فریای نەخۆشخانە دەخرێت .

خۆ ئەگەر لە هۆش خۆی چووبوو وە هەناسەی بەردەوام بوو ئەوا جلەکانی لەبەر دادەکەنرێت‌و ئاوی لێ دەپرژێنرێت وە لە هەوایەکی پاکدا دادەنرێت‌و دەشێلرێت وە بە خێرایی پزیشك بانگ دەکرێتە سەری .

ئەگەر هات‌و کارەبا گرتووەکە هەناسەی وەستابوو ئەوا هەناسەی پێ دەدرێت ئەویش بەفوو تێ‌کردن لە دەمەوە بۆ دەم بە رێك‌و پێکی ، وە پێویستە دەست بنرێت بەسەر دڵیدا (٦٠–٧٠ جار لە یەك خولەکدا) ، تا بە خێرایی پزیشك بانگ دەکرێت .

**پەراویزەکان**

1 – ١ مایکرو ئەمپیر = ١/٠٠٠ر١٠٠٠ ئەمپیر

2 Fibrilation

3 Defibrillator

4 ١ میلی ئەمپێر = ١/١٠٠٠ ئەمپێر

5 ئەبێتە هۆی تێپەڕبوونی (٦٠ مایکرو ئەمپێر) یان زیاتر بە ناو دڵدا

سەرچاوەکان

١ – گۆڤاری H.T.I. Review
The higher technical Institute
No. 15 June 1986 – Nicosia – Cyprus P.11

٢ – تجمیع المعدات الکهربائیة الصناعیة واستخدامها ج – بولاکوف ، أ – کوفارسکی
دار (میر) للطباعة والنشر
الاتحاد السوفیتي – موسکو

# خۆپاراستن لە زیانی تیشکە ناووکی یەکان

ئامادەکردنی : صدیق شێخ محمود بەرزنجی

فرنە ناووکی یەکان بە سەرچاوەیەکی چڕی تیشکدانەوە ناووکی یەکان دادەنرێن و ، بەرکەوتنی لەشی مرۆڤیش بۆ ئەو تیشکانە مەترسی یەکی گەورەو سامناك دەخاتە سەر سەلامەتی ی مرۆڤ ، لەبەر ئەوە لە نەخشە بۆکێشان و دانان و دامە — زراندنی ئەو کارگەو دەزگایانەدا جۆرە قەڵغانێکی پارێزگەری ئەوتۆی تێدا دروست دەکرێت کە هەموو کارکەرو کاربەدەستانی ئەو کارگەیە لە مەترسی ی ئەو تیشکدانەوەیە بپارێزێت . جا دانانی عەیارەو دروستکردنی ئەو قەڵغانە پارێزگەرانە لە تیشکدانەوە ناووکی یەکاندا دەکەوێتە سەر جۆری کارتێکردنی تیشکەکە لە لەشی مرۆڤدا . بەڵام لێپرسینەوەی بەجێ هێنانی بەرنامەی پاراستن و ئاسانکردنی ڕێ ی بەردەوام بوون لە چاو دێری کردنی وەدی هێنانی و دڵنیا بوونیش لە مەترسی یەکانی بەرنەکەوتنی هیچ کەسێك بۆ ئەو تیشکدانەوا نە ، بە هەر هۆیەکی ناراست و هەڵە دەکەوێتە ئەستۆی فیزیایی یە تەندروست پارێزەکان .

**کورتە باسێکی مێژوویی :**

مرۆڤ هەر لە سەرەتای بوونی یەوە لەسەر ئەم زەوی یە بەرەنگاری جۆرەها کارتێکردنی تیشکدانەوەی سروشتی بووە . وە شوێنکاری ئەو تیشکانەش لەبەر کەمی ی ووزەکانیان بە ئاشکراو چاك دەرنەکەوتوون ، بەڵام دوای زۆر بوونی سەرچاوەی تیشکدانەوە ناووکی یە چرە جۆراو جۆرەکان ، شوێنکارە زیانبەخشەکانیان دەرکەوت ، ئەویش لە ئەنجامی دۆزینەوەی تیشکی (سینی) یەوە لە لایەن زانا (ڕۆنتگن)ەوە . هەروەها چالاکی تیشکاوەریش لە لایەن (بیکاریل) ەوە کە بوون بە هۆی ڕوودانی جۆرەها باری نەخۆشی ی کوتوپڕی و هی تری دواکەوتوو لە شێوەی لووە (وەرەم) پیسەکاندا ، کە پاش تێپەڕ بوونی چەند ساڵێك بەسەر بەرکەوتنی ئەو تیشکانەدا دەرکەوتن .

لەو ڕووەشەوە دەتوانین زیانەکانی کارتێکردنی ئەو تیشکدانەوانە بکەین بە دوو جۆرەوە :

١ — ئەو زیانە تەندروستی یانەی کە بەرکەوتنی تیشکە دەرەکی یە باریوەکان لە لەشی مرۆڤ ئەدەن و ، پێ ی دەڵێن بەرکەوتنی تیشکی دەرەکی .

٢ — زیانەکانی ئەو تیشکانەی کە لە ماددە تیشکدەرەکانەوە هەڵدەقوڵێن و لە ڕێگەی دەم و لووتەوە دەچنە لەشەوە ، بەوەش دەڵێن بەرکەوتنی تیشکی ناوەکی .

توێژەرەوکان لە ساڵی ١٨٩٦دا ئەوەیان ڕەچاوکرد ، کە ئەگەر لەشی مرۆڤ بەر تیشکە سینی یەکی دەرەکی بکەوێت ، دەبێتە هۆی ڕووتانەوەی تووك و سوور هەڵگەڕانێکی نائاسایی پێست و هەڵئاوسانی چەند جێگەیەکی لەش ، ئەمەشیان لە ئەنجامی کۆبوونەوەیەکی نا ئاسایی شلەی لە شەوەیە ، بەم جۆرە نەخۆشی یەش دەڵێن ئاوبەند «الاستسقاء» .

لە ساڵی ۱۸۹۷دا یەکی لە توێژەرەکان ٦۹ باری تووشبونی نەخۆشی تۆمارکرد ، بە هۆی بەرکەوتنی تیشکی سینی‌یەوە ، هەروەها زانایان (بیاریل)وە (مەدام کوری)ش تووشی ئەو بابەتە نەخۆشی‌یانە بوون ، بە هۆی هەندێ دەفری بچووکەوە کە ماددەی تیشکاوەریان (تیشکدەر) تێدا بووە . لە ساڵی ۱۹۱۱دا هەر بە هۆی بەرکەوتنی تیشکی سینی‌یەوە ۹٤ باری تووشبوونی وەرەمی شێرپەنجەش تۆمار کرا ، ٥٠ لەو تووشبووانە پسپۆڕ بوون لە تیشکدانەوەدا (رادیۆلوجین)واتە پسپۆڕی فیزیاوی‌بوون لە بەکار هێنانی تیشکە ناووکی‌یە هەمە جۆرەکاندا ، وەلە ساڵی ۱۹۲۲ یشدا (۱۰۰) کرێکاری تری کرگوزارانی تیشك بە هۆی بەرکەوتنی تیشکە ناووکی‌یەکانەوە بە نەخۆشی شێرپەنجە مردن ، لەم کۆمەڵەشیاندا ڕێژەی تووشبوونی شێر پەنجەی خوێن (لیۆکیمیا) لە هەموو جۆرەکانی تری زۆرتر بوون .

ئەو تووشبوون‌و مردنانە بوون بە هۆی نزم بوونەوەی تێکرای تەمەنی ئەو بەشە فیزیاوی‌یانە . بەڵام بە هۆی ئەو هەوڵ‌و تەقەلا گەورەیەی کە ڕادیۆلۆجی‌یەکان دایان بۆ خۆپاراستن لە بەرکەوتنی تیشکە ناووکی‌یەکان‌و شانسی ئەوانەی لەو بەشەدا ئیش دەکەن ، لەم ساڵانەی دوایی‌یەدا تێکرای تەمەنیان گەڕابەوە دۆخە سروشتی‌یە – کەی خۆیان‌و تووشبوونی شێر پەنجەی خوێنیشیان بە تەواوی تێدا کەم بووەوەو نەما .

لە ساڵانی زۆر کۆنەوە شێرپەنجەی سی‌یەکان لە نێوان کرێکارانی کانەکانی (مناجم) کۆباڵێ سەکسۆنیای باشووری – ڕۆژهەڵاتی ئەڵمانیاو کانە یورانیۆمەکانی چێکۆسلۆڤاکیادا دەرکەوتووە ، هیچ کەسێکیش ئەو کاتە هۆی ئەو تووشبوونانەی نەدەزانی ، تا لە دوایی‌دا دەرکەوت کە ئەو کرێکارە بێچارانە بوون بە قوربانی‌ی تیشکە ناوەکی‌یەکان بە هۆی هەڵمژینی گازی ڕادۆنی تیشکاوەرو بەرهەمەکانی تری‌یەوە لە ڕێبازی هەناسەوە بۆ سی‌یەکان . ئەو ماددە تیشکاوەرانەش لە ئەنجامی بوونی برێکی زۆرگەورەی ئەو یۆرانیۆمانەوە دێنە بەرهەم کە لە کون‌و کەلەبەری دیوارەکانی کانەکانەوە هەڵدەکەنرێن ، هەر لەو سەردەمەشدا هەمان نەخۆشی‌ی شێرپەنجەی سی‌یەکان لە نێوان کرێکارانی کانەکانی یۆرانیۆمی وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا بڵاو بووبووەوە .

وە بۆ کەم کردنەوەی تووشبوونی ئەو نەخۆشی‌یە ترسناك‌و پیسە لەو ساڵانەی دوایی‌یەدا ، تازەترین‌و پێشکەوتوترین ئامێرو هۆی پاك کردنەوەو هەوا گۆڕکێ‌یان لەو کانانەدا دانا ، لە گەڵ ئەوەشدا بە هۆی بەرکەوتنی تیشکە ناوەکی‌یەکانەوە تووشبوونی زۆر بە درێژایی ئەو ساڵانە تۆمارکراوە .

لە جەنگی جیهانی یەکەمەوە تاساڵی ۱۹۳۰ زانایان هەر لەو بڕوایەدا بوون کە (ثۆریوم‌و ڕادیۆم) بایەخێکی گرنگیان لە چاك کردنەوەی ئەو نەخۆشی‌یانەدا هەیە ، تەنانەت بڕواکەیان گەیشتبووە ئەو ڕادەیەی لە نەشرە دەوری‌یەکانی پزیشکایەتیدا بڵاوی بکەنەوە . لە ئەنجامی بەکار – هێنانی ئەو دوو ماددە کوژەرەدا بە شێوەی دەرزی یان بە خواردنەوەی ، ژمارەیەکی زۆری ئەو نەخۆشانە لە جیاتی چاکبوونەوە پێی مردن .

پزیشکەکان دوای کارەساتی ئەو دوو ماددە کوژەرە لە ساڵی ۱۹۲۸وە تا ساڵی ۱۹٤٥ ، بۆ دەست نیشان کردنی نەخۆشی‌یەکان بە تیشکی سینی ، دەرزی‌ی دووەم ئۆکسیدی یۆرانیۆمیان بەکار دەهێنا ، ئەمەش دیسانەوە بوو بە هۆی دەرکەوتنی تووشبوونی نەخۆشی‌ی شێرپەنجە ، بە تایبەتی شێرپەنجەی جگەر ، هەر لەو کاتانەدا لە ئەمریکا بارێکی تری زور سەیرو دەگمەنی تووشبوونی جۆرەها شێرپەنجە لە نێوان کرێکارە ئافرەتەکانی کارگەکانی دروست‌کردنی سەعاتدا دەرکەوت ، ئیشی ئەو کرێکارانە تەنها بۆیەکردنی میل‌و ژمارەکانی کات ژمێرەکان‌بوو ، بۆیەکەش ڕادیۆمی تێکەڵ دەکرا ، بەڵام لە کاتی ئەو کارەدا ئافرەتەکان فڵچەکانیان بە لێویان تەڕو بارێك‌و تیژ دەکرد تا نووسینەکان بچووك‌و بارێك لە میل‌و ژمارەکاندا دەرکەوون .

ئەنجامی ئەوەش چوونە ژوورەوەی ماددەی ڕادیۆم بوو ، بۆ جۆگەی هەرسیان‌و تووشبوونی زیاتر لە ٥٠ ئافرەتیان بە جۆرە جیاوازەکانی نەخۆشی شێرپەنجە .

پاش دۆزینەوەو دەرکەوتنی ئەو بارە دڵ تەزینانە ، بە هۆی بەکار هێنانەکانی تیشکە سینی‌و ماددە تیشکاوەرەکانەوە ،

ئادەمیزاد زوربەی **زۆری** زیانەکانیانی زانی ، لە گەلْ گرنگی ی خۆلیْ پاراستنیاندا ، لەبەر ئەوە عەیاری پێوانەیان بۆ دیاری کردنی بڕێکی زۆر یان کەمتر لەو ژەمە تیشکە دروست کرد ، تا ئەگەر هەر بڕەژەمێکی بەر لەش بکەوێت پی ی بزانن و زیان بە تەندروستی نەگەیەنێت . لە ڕاستیشدا ئەمەیان شانسی تێکڕای مرۆڤایەتی بوو ، چونکە ئەم جۆرە پێش بینی و پی زانینە بۆ دروست کردنی ئامرازی هەستەوەری تۆمارکەری ئەو تیشکانە .

ژمارەی تووشبوونی ئەو نەخۆشی یە پیسانەی تیشکدانەوە ناووکی یەکان دەبنە هۆی ، بە شێوەیەك کەم کردەوە لەوانەیە پشت گوێ خرێ بەلاّم مەترسی زیانێکی کەی ماوە کە هەڕەشەیەکی ترسناك لە ژیانی مرۆڤایەتی دەدات ، ئەویش بەرکەوتنی تیشکی سینی یە کە ناو بە ناو بۆ مەبەستی دەست نیشان کردنی هەندیْ باری نەخۆشی بەر لەشمان دەکەویت ، لەم بارەشیاندا کارو فرمانێکی توندی ئەو تۆ بۆ پاراستنی نەخۆشەکەو دکتورو یاریدە دەرە پسپۆرە تیشك گرەکان دەکرێت تا لە کارتێکردنە زیاناوی یەکەی بە دووربن . لێرەدا بە داخەوە ئەوەش دەلّێم کە پزیشکەکانی ددان لە کاتی تیشك گرتنی ددانی نەخۆشە – کانیاندا بە تیشکە سینی بەرگی خۆپاریزی (کۆست) لەبەر ناکەن ، ئەوەش جێگەی داخە بۆیان .

جا بۆ زانینی چۆنیەتی کارتی کردنی تیشکەکان لە لەشی مرۆڤ پێویستە لە بچووکترین یەکەی پێکهێنەری لەشەوە دەست پیْ بکەین کە خانەو پێکهێنەرەکانێتی .

**١ – شوێنکاری تیشك لە زیندەخانەکاندا** :

زوربەی ماددەکان ئەگەر بەر لێدانی تیشکە ناووکی یەکان کەوتن گۆڕانێکی فیزیاوی یا کیمیاوی یان هەردوو جۆرە گۆڕانەکە لە بنچینەکەیاندا دروست دەکەن .

وە زوربەی ئەو ماددانەی کە ئەم تیشکانە کاریان تیْ دەکەن ماددە ئەندامی یەکانن ، وەك ئەتەمە زیندووەکان ، چونکە ئەگەر بەر تیشکە چڕەکان کەوتن گۆڕانێکی کیمیاوی و هەمیشەیی لە بنچینەکانیاندا دروست دەبێت ، ئەمەش دەبێتە هۆی لە ناو چوونی خانەکانی ئەتەمەکە بە گشتی یان بەشێکی کەمی ، جا ئەگەر بەشە کەمەکەش بێت هەر ڕیْ لە بەجیْ هێنانی کاری چون یەکی ی خانەکان دەگرێت .

وە بۆ لێکۆڵینەوەی شوێنکاری تیشکە **ناووکی یەکان لە** لەشی مرۆڤدا . پێشەکی پێویستمان بە ڕوون کردنەوەیەکی تەواوی پێکهاتنی ناوەڕۆکی زیندەوەرە خانەکان هەیە .

لەشی مرۆڤێکی پێگەیشتووی تەواو نزیکەی ٤×١٠^١٣ خانەی تێدایە . ئەم خانانەش هەموویان لە شێوەو قەبارەو فرماندا چون یەك نین ، بۆ نموونە کاری خانەکانی مێشك بە تەواوی لە کاری خانەکانی جگەر جیاوازن ، هەروەها لە قەبارەشدا خانەکانی لەشی مرۆڤ ئەوەندە بچووکن تیرەکەیان بە نزیکەی ١٠^٣ سەنتیمەتر دانراوە . وە خانەشمان هەیە نەشازەو لەم پێوانەیەش بەدەرە ، وەك خانە دەماری یەکان کە درێژی یان نزیکەی مەترێکە ، وە بە شێوەیەکی گشتی خانەکانی لەشی مرۆڤ دەکرێن بە دوو بەشی سەرەکی یەوە : (١) خانە جەستەیی یەکان (الخلايا الجسدية) . (٢) خانە میکرۆبی یەکان (الخلايا الجرثومية) ، وە زوربەی خانەکانی لەشی مرۆڤیش لە بەشی یەکەمن ، چونکە هەموو ئەندام و شانەو پێکهاتووەکانی تری لەشیش هەر لەم جۆرە خانانە پێکهاتوون – بەلاّم خانە میکرۆبی یەکان لە ئەندامەکانی زاوو زێدا هەن و فرمانیشیان تەنها پەیوەندی بە زۆر کردنەوە هەیە . .

وە کرداری یەك گرتنی دوو خانەی میکرۆبی (گەمیت) gamet لە هەردوو ڕەگەزەکەی ژن و پیاودا بۆ پیکهێنانی هێلکەیەکی پیتراو Zygote سەرەتای پێکهاتنی مرۆڤێکە . وەهەر ئەم خانانەشن کە بۆ ماوە سیفەتەکان (الصفات الوراثية) لە دایك و باوکەوە بۆ وەچەکانیان دەگوێزنەوەو ، بەوەش دەستەبەری گواستنەوەی سیفەتە ڕەگەزی یەکانی مرۆڤایەتیش دەکەن لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر ، بەلاّم بە گۆڕانێکی کەمەوە .

لێکۆڵینەوە تازەکان لە بواری زانستی دا ئەوەیان سەلماندووە کە خانەی زیندوو لەوپەڕی ئالۆزیدایە ، چونکە پێکهاتووە لە زیندە ماددەو نازیندە ماددە ، کە هەر یەکەشیان فەرمانێکی تایبەتی و دیاری کراو بۆ خانەکە بەجیْ دەهێنن ، ئەم ئەندامۆچکانەش (زیندە ماددەو نازیندە ماددە) لە ناو گیراوەیەکی ڕوونی ئاوو ئەلەکترۆلیت و گەردیلەی هەمە جۆرەی




تردانو پیێ دەڵێن سایتۆپلازمو ، زوربەی قەبارەی خانەکەشی گرتۆتەوە وەك لەم نەخشە هێڵکاری‌یەدا دیارەو ، بە درێژی لە بەشە سەرەکی‌یەکانی ناویشی دەدوێین :

**١ – ناووك : Nucleus**

ناووك بە زۆری لە تەنۆچکەیەکی گۆیی ئالۆز دەچێت ، وە دەشێ لە شێوەی لاکێشە یان گورچیلەییدا بێت ، بەلاّم لە چاو قەبارەی خانەکەدا گەورەیەو ، بە ناووکە پەردەش دەورە دراوەو لە سایتۆپلازمی خانەکە جیا بۆتەوە ، وە ناووك بە سەرچاوەی دەسەلاّتی خانەکە دەژمێررێتو ئەم زیندە ماددانەشی تێدایە :

**أ – کرۆماتینە تۆڕ :**

ناووك پێش دابەش‌بوونی خانە ، تۆڕێکی تێك ئالاّوی ئالۆزی دەنکداری تێدا بەدی دەکرێت لە شێوەی دەزووی باریکدا ، پیێ دەڵێن کرۆماتینە تۆڕ ، لە پێکهاتنی ئەم تۆڕەدا ترشەلۆکێکی تێدایە پیێ دەڵێن ناووکە ترشی ڕایبۆزی بێ ئۆکسجین ، توانای وەرگرتنی ڕەنگی تایبەتی هەیەو هێمای (دی . ئێن . ئەی) DNA بۆ دانراوە ، ئا لەم بارەدا کرۆماتین زاڵەو سیفەتە جیاکەرەوەکان بە خانەکە دەبەخشێت . بەلاّم ئەم دەزوە تێك ئالاّوانە لە سەرەتای خانە دابەشبووندا کورتو ئەستوور دەبنەوەو ژمارەیەکی دیاری کراو پێکهاتووی میلی پێکدێنن پیێیان دەڵێن کرۆمۆسۆمەکان Chromosomes ، وە ژمارەی ئەم کرۆمۆسۆمانە لە خانەکاندا بە پیێ جیاوازیی زیندەوەر دەگۆررێت . بۆ نموونە : لە لەشە خانەکانی مرۆڤدا ٤٦ و لە مریشکدا ١٨ و لە ئەسپدا ٦٦ وله مشکی ناو ماڵ ٤٠ و لە پەپوولەی ئیسپانی‌دا ٣٨٠ وله مێشی میوەش‌دا ٨ کرۆمۆسۆمی تێدایە . وە ئەم کرۆمۆسۆمانەش لە خانەدا بە شێوەی جووتی چونیەکن ، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە لە خانەی مرۆڤدا ٢٣ جووت کرۆمۆسۆم هەیە ، بەلاّم بێ تۆو (گەمیت) ، واتە گەمیتەکان نیوەی ئەو ژمارەیە کرۆمۆسۆمیان تێدایە .

لە دابەش‌بوونی ناڕاستەوخۆ (دەزووە دابەشبوون)ی خانەدا ، خانەی تازە دروست دەبنو هەریەکەشیان ژمارەی تەواو کرۆمۆسۆمی لە جۆری خانە دایکەکە تێدایە واتە ٤٦ کرۆمۆسۆم .

بەلاّم دوو هێند بوونی کرۆمۆسۆمەکان بۆ مەبەستی بەردەوام بوونی ئەو ژمارەیە بە چەسپاوی لە ناو خانەکەدا لە نێوان دوو قۆناغە بەشبووندا دەبێت ، وەك قۆناغی ئامادەیی Prophase و بەرامبەرکێ Metaphase ، خۆ ئەگەر ژمارەی زۆرتر یان کەمتری لە هی خۆی وەرگرت لە ئەنجامی تێکچوونێکی کرداری دابەش‌بوونەکەدا ، لەوانەیە ئەوە ببێتە هۆی مردنی ئەو خانەیە .

پێکهاتنی تۆو (گەمیت) بە تەواوی لە جەستە خانەکان جیاوازە ، وە ناشمانەوی لێرەدا بە درێژی باسی ئەوە بکەین ، بەڵکو تەنها هەر باسی گرنگترین سیفەتە دەرکەوتووەکانی ئەو خانەیە دەکەین .

تۆوەکان دوو جۆرن ، تۆوی نێرینە (سپێرم)ی پیێ دەڵێن ، مێیەش (هێلکە)ی پیێ دەڵێن ، لەبەر ئەوەی کە تۆوەکان لە گونی نێرینەدا پیێ دەگەنو هێلکەش لە هێلکەدانی مێیەدا ، گونو هێلکەدان ناو نراون گلاندەکانی زاووزێ .

هەر یەکە لە تۆو (سپێر) وە هێلکە (٢٣) کرۆمۆسۆمیان تێدایە ، کاتی یەکگرتنیان لە کرداری زاووزێدا هێلکەی پیتراو دروست دەبێت ، کە ئەبێ کۆی کرۆمۆسۆمەکانی هەردووکیان بکاتە (٤٦) کرۆمۆسۆم ، وە ئەو هێلکە پیتراوەش بە یەکەم خانەی دروست کردنی مرۆڤ دادەنرێت .

زاناکان بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ لەو بڕوایەدا بوون جینەکان کە بوونەوەری وردن لە سەر کرۆمۆسۆمەکان بۆ ماوە سیفەتەکان دەگوێزنەوە . بەلاّم لەم دواییەدا دەرکەوت کە

جینەکان بەشێکن لە گەردیلەکانی (دی . ئین . ئەی)و ، فرمانیشیان پێ بەخشینی جۆرە شفرەیەکە (هێما) بۆ دابینکردن لە پێکهاتنی پرۆتۆنەکاندا .

**ب – ناوکۆکە : Nucleolus**

تەنۆچکەیەکی خرە دەکەوێتە ناو ناووکەوە ، لە کاتی ناووکە دابەش بووندا نامێنی ، ناووك بەلای کەمەوە ناووکۆکەیەکی تێدایە لەوانەشە بگاتە چوار ناووکۆکە ، فرمانی ناووکۆکە دروستکردنی ناووکە ترشی رایبی RNA و هەر لە خۆیشی‌دا کۆی‌دەکاتەوە .

٢ – ئەندۆ پلازمە تۆر :

بریتی‌یە لە تۆرێکی ئاڵۆزی شێوە بۆری‌و چیکڵدانۆچکەیی ، فرمانی گواستنەوەی ماددەیە لە خانەدا ، ئەم تۆرە بە سەرچاوەیەکی گرنگی هەوێنی دروستکردن‌و لە ناوبردنی هەموو ئەو کردارە کیمیاوی‌یانە دەژمێررێت کە لە خانەی زیندوودا رەو ئەدەن .

٣ – دەزگاکەی گۆلجی :

وەك لە ئەلەکترۆنە ووردبیندا دەبینرێن ، کۆمەڵە پێکهاتوویەکی رێکوپێکی پەردەیی لووس‌و دوو توێن ، لە نزیك ناووکەوە ریز بوون ، هەرچەندە تائێستاش بە تەواوی فەرمانە سەرەکی‌یەکەی نەزانراوە ، بەلام لە خانەکانی گیانەوەردا وەك دەرکەوتووە شەکرە ئاڵۆزەکان دروست دەکات‌و لە توورەکەکانی ئەم دەزگایەدا کۆ دەبنەوە ، هەروەها بەشداری رەشتنی پرۆتین‌و گەلێ ماددەی تری وەك هۆرمۆن‌و ئەنزایمیش دەکات بۆیە لە نزیك رژێنە خانەکانەوە بە شێوەیەکی گەورە دەر دەکەوون .

٤ – لایسۆسۆم‌و بیرۆکسیسۆم :

تەنۆچکەی ووردی ناو خانەن ، جۆرە ئەنزایمێکیان تێدایە ماددە خۆراکی‌یەکان‌و هەندێك پێکهاتووی تریش بۆ سادەترین شێوە شیتەڵ دەکەنەوە .

٥ – مایتۆکۆندریا Mitochondria

تەنۆچکەی ووردی ناو سایتۆپلازمی خانەن ، لە شێوەی دەنکە گەنم یا چیلکەدان ، هەندێك جار لە دەوری ناووك کۆ دەبنەوە ، جاری واش هەیە بۆ ئەو جێگایانە دەچن کە کارلێکردنە کیمیاوی‌یەکانی خانەی تیا چالاك دەبیت ، لە هەمان کاتیشدا ئەنزایمی هەناسەیان تێدایە کە خۆراکە ماددەکان دەئۆکسێنن لە ناوە هەناسەدا بۆ ووزە دەرپەراندن ، بۆیە پێیان دەڵێن ووزە ماڵەکان . چونکە فەرمانی سەرەکی‌ی مایتۆکۆندریا خانە هەناسەیە .

**شوێنکارە بایۆلۆجی‌یەکانی تیشك :**

١ – لەوانەیە شوێنکارەکانی تیشك ببێتە هۆی شکاندن یان لەناوبردنی پەیوەندی‌یەکانی نێوان گەردیلەکان ،بەمەش دەڵێن شوێنکارە راستەوخۆکانی تیشك .

٢ – لەوانەیە توانای تیشکەکان لە بەئایۆن کردنی بەرزدا ، ببێتە هۆی دروستکردنی جۆرەها ماددەی کیمیاویی تازە ، وەك ئۆکسجین (O) و هیدرۆکسیل (OH) کە زۆر تیژن لە کارلێك‌کردنداو لەگەڵ خانەدا کارلێك‌کردنێکی کیمیاوی‌یانە دەکەن‌و بەمجۆرەیان دەڵێن کارلێك‌کردنی ناراستەوخۆی تیشك .

لێرەدا گرنگ زانینی ناوەرۆکە بنچینەیی‌یەکەی هەردوو کردارەکەیە کە کیمیاوی‌یە ، چونکە گەردە تێکشکاوەکە (لەناوچووەکە) دوو گەردیلەی جیاوازی تری لێوە دەر دەپەرێت . ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە شوێنکارە بایۆلۆجی‌یەکانی تیشك لە بنەرەتدا هیچ جیاوازی‌یەکی لە گەڵ شوێنکارە بایۆلۆجی‌ی ماددە کیمیاوی‌یە جۆراو جۆرەکاندا نی‌یە ، تەنها نەشازێکی دیارنەبێت لە پێکهاتنی ماددە کیمیاوی‌یەکاندا لە ناوچەی کارتێکردنەکەدا .

وە بەرئەنجامە کۆتایی‌یەکانی ئەم گۆرانە کیمیاوی‌یانەش مێانە دەکاتە سەر گەردیلە کارتێکراوەکان . . بۆ نموونە : ئەگەر ئەندامۆچکەیەکی وەك میتاکۆندریایەك لە ناوچوو ، ئەوە تەنها کار لە فرمانی ئەو تەنها ئەندامۆچکەیە دەکات‌و بەس ، چونکە بە هۆی ژمارە یەکجار زۆری‌ی ئەو ئەندامۆچکەیەوە لە خانەیەکدا لە ناوچوونی میتاکۆندریایەك کار ناکاتە سەر فرمانی گشتی‌ی خانەکە . لەبەر ئەوە بەرکەوتنی ژمەتیشکی کەم دەبێتە

هۆی دەرکەوتنی شوێنکارە کیمیاوی‌یە تەریکە (معزولة) نایەکسانی‌یەکان لە خانەکەداو ، مەترسیشی لیٚ ناکرێت . بەڵام ئەگەر گەردیلەیەکی (دی . ئێن . ئەی) لە کرۆمۆسۆمدا نەما ، ئەویش لەبەئایۆن بوونیا بەرێگەی شوێنکاری ڕاستەو خۆی تیشکەوە ، یان بە کار تێککردنە ناسەرەکی‌یەکی کیمیاوی‌یەوە ، ئەوا بە ڕێگەیەکی ناڕاستەو خۆ زیندە گۆڕانێکی لیٚدینێتە بەرهەم . لێرەدا گریمان ئەم گۆڕانە لە جەستە خانەیەکی مرۆڤێکی پیٚگەیشتوودا ڕوویدا ، ئەوا لەوانەیە ئەم گۆڕانە نەکەوێتە بەرچاوو دەر نەکەوێت ، ئەگەر ژمارەیەکی زۆری ئەو خانانە بە هەمان ڕێگە بەرنەکەوتیٚ . چونکە (دی . ئێن . ئەی) سنوور بۆ بنیات‌نانی ئەو پرۆتینانە دادەنێت کە خانە دروستی دەکات‌و ئەو زیندەگۆڕانەش کار دەکاتە سەر بەرهەم هێنانی پرۆتینە پێویستەکان بۆ کارە یەکسانەکانی خانەکە . ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە زیندە گۆڕانەکە زیانی زۆر بە خانەکان‌و وەچەکانیان دەگەیەنێت ئەگەر بە تەواویش دایکە خانەکە لە ناو نەبات .

جا ئەگەر هات‌و میکرۆبە خانەیەك بەر شوێنکاری تیشکە ناووکی‌یەکان کەوت‌و گۆڕانێکی کاریگەری تێدا کرد ئەوا توانای پیتاندنی (تلقیح) نامێنێت . بەڵام ئەگەر گۆڕانەکە لە میکرۆبە خانەیەکی پێگەیشتوودا ڕووی داو بە سەرکەوتوویش پیتراو هێلکە پیتراوەکەش بوو بە وەچەیەکی زیندوو ، ئەوا گۆڕانەکە بە تەواو بۆ منداڵەکان دەگوێزرێتەوە ، لەبەر ئەوە ئەبینین تیشك بەرکەوتنی گلاندەکانی زاوو زیٚ بە تایبەتی لە کاتی پیتاندندا زیانی کاریگەرو کوشندەی زۆر دروست دەکات .

زۆر جاریش لە تیشك بەرکەوتندا دابەشبوونێکی زۆر خێرا لە خانەکەدا دروست دەبێت‌و دابین ناکریت ، ئەمەش سەرەتای نەخۆشی شێرپەنجەیە . هەرچەندە هۆی تووشبوونی ئەم نەخۆشی‌یە تائێستا بە تەواوی نەزانراوە ، بەڵام بەڵگە زۆرەکان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ئەوە نیشان ئەدەن کە هۆکەی بوونە ڤایرۆسێکی ستە ، ئاسایی لە خانەکەدا هەیە ، بە هەر ڕێگەو هۆیەکەوەبێت کوتوپڕ چالاك دەبێت‌و دەست بە تێکدانی کردارە یەکسانەکانی دابەشبوونی خانەکە دەکات . هەزارەها ماددەی کیمیاوی واهەیە کە دەبێتە هۆی نەخۆشی شێرپەنجە ، لەبەر ئەوە هیچ دوور نی‌یە تیشکیش هۆیەك بێت بۆ تۆوشبوونی نەخۆشی شێرپەنجە .

لە نیشانە دیاردەکانی ئەم جۆرە لە ناو چوونە بایۆلۆجی‌یە ، ئەوەیە کە نەخۆشی شێرپەنجە لەم بارەدا ڕاستەو خۆ پاش بەرکەوتنی تیشکەکە دەست پیٚ ناکات ، بەڵکو پاش ماوەیەك‌و لەوانەشە بگاتە چەند ساڵێك ، زۆر جاریش نەخۆشی‌یەکە لەوەچەی ئەوکەسانەدا دەر دەکەوێت کە بەر تیشك کەوتوون .

تووشبوونی ئەو کەسەی بەر تیشك دەکەوێت ، متمانە دەکاتە سەر ژمارەو جۆری جەستە خانەکارتێکراوەکان‌و ، بڕی ژەمە وەرگیراوەکەو ، ماوەی ئەوکاتەی وەرگرتنی ژەمە تیشکەکە دەیخایەنێت .

بۆ نموونە : لەو شتانەی کە لە زانستە بایۆلوجیدا زانراوە ، ئەوەیە کە ئەو خانانەی دەکەونە ژێر ناوەپەردەی ڕیخۆڵە باریکەوە ، بەردەوام لە تازە بوونەوەدان ، ئەگەر ئەو ڕیخۆڵەیە چەند جارێك ژەمە تیشکە سینی‌یەکی مام ناوەندی بەرکەوت ، ئەوا دروست بوونی خانە تازەکان بۆ جێگری خانە لەناو چووەکان بەو تیشکە ، بەسە بۆ پاراستنی پەردەی ڕیخۆڵە . بەڵام ئەگەر ژەمە تیشکەکە بەرزتر بوو لەوە ، ئەوا ئەبێتە هۆی پووکانەوەو لەناوچوونی خانەکانی پەردەی ڕیخۆڵە ، لە ئەنجامی ئەوەشدا شلەکانی لەش هەموویان دەرژێنە ڕیخۆڵەوە ، وە بە پێچەوانەشەوە بەکتریاو ماددە ژەهرینەکانیش لە ڕیخۆڵەوە دەچنە سووری خوێنەوە ، ئەو کاتە مرۆڤ تووشی جۆرەها نەخۆشی ترسناك‌و کوشندە دەبێت ، وەك سکچوونی بەردەوام‌و ووشك هەڵقرچان‌و ژەهراوی بوونی خوێن‌و گەلی نەخۆشی‌ی تر .

**شوێنکاری تیشك لە لەشی مرۆڤدا :**

لە ساڵانی بەریندا جۆرەها هەوڵی بیٚهاوتای زۆر دراوە بۆ زانینی شوێنکارەکانی تیشك لە لەشی ئادەمیزاددا ، بەڵام گرانی ، یان بیٚ توانایی لە کردنی هیچ جۆرە تاقی کردنەوەیەکی لەو بابەتە لە سەر لەشی مرۆڤ بووبە کۆسپ لە ڕیٚی

پێشکەوتنی هەموو لێکۆڵینەوەو توێژینەوەیەکا بۆ گەیشتن بەو ئاستەی کە مەبەستی سەرەکی‌یە . لەبەر ئەوە دەبینین زوربەی زانینەکانمان دەربارەی شوێنکارەکانی تیشك متمانە دەکاتە سەر لێکۆڵینەوەی باری ئەو نەخۆشیو ڕووداوانەی کە تیشك بەرکەوتن بەر پای دەکاتو ، لەوانەشە ئەوە ببێتە هۆی جۆرەها نەخۆشی‌ی وەك شێرپەنجەی خوێنو سی‌و جگەرو گەدەو ریخۆڵەکان ، یا شێرپەنجەی هەر ئەندامێکی تری لەش ، سەرەرای لێکۆڵینەوەی بەر ئەنجامی ئەو کارەساتانەی تێکرای مرۆڤایەتی بەرەنگاری دەبن ، وەك بۆمباران کردنە ئەتۆمی‌یەکەی یابان کە ئەمریکا لە جەنگی جیهانی‌ی دووەمدا کردی . چونکە دوای ئەو کارەساتە ، لەسەر ئەو مرۆڤانەی کە لە ژیانا مانەوە لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی زۆر کراوەو ، تا ئێستاش ئەو جۆرە لێکۆڵینەوانە هەر بەردەوامە ، بۆ زانینی شوێنکارە هەمە چەشنەکانی تیشك نەك هەر لە مرۆڤدا ، بەڵکو لە ئاژەڵیشدا ، ئەوەش بۆ مەبەستی سوود لێ وەرگرتن لە زانینی ئەو شوێنکارەو چۆنیەتی هەمان کارتێکردن لە مرۆڤیشدا .

لەوانەیە شوێنکاری لێدانی ژەمە تیشکێکی تیژ لە هەر مرۆڤێکی بەرکەوتوودا پاش ماوەیەکی کورتی (٦٠) رۆژی دەرکەوێت . لەوانەشە دەرکەوتنی شوێنکارەکەی ماوەیەکی درێژتر بخایەنێت ، ئەمەش دەکەوێتە سەر جیاوازی‌یە سروشتی‌یەکانی نێوان مرۆڤ لە ڕووی جۆرو پێکهاتنی خانەکانەوە ، جاری واش‌هەیە هەندێك یان هەر هەموو شوێنکارەکە بە پلەی جیاواز لە مرۆڤدا دەردەکەوون .

ئەگەر مرۆڤێك بەر ژەمە تیشکێکی نزم کەوت ، نیشانی هیچ جۆرە نەخۆشی‌یەکی لێ‌دەرناکەوێت ، بەڵام ئەگەر ئەو ژەمە تیشکە کەمێك لە سنووری توانای مرۆڤ زیاترکرا ، ئەوا تەنها دەبێتە هۆی گۆڕانێکی کەم لە خوێنەکەیدا .

وە بە زیاد کردنی ئەو ژەمە بۆ برێکی مام ناوەندی ئەوا لە ٥٪ تا لە ٥٠٪ی خەڵکەکە لە سێ سەعاتی یەکەمی بەرکەوتنەکەیاندا دەرشێنەوەو ، هەست بە ماندوبوون دەکەنو ، ئارەزووی خواردنیان نامێنێت ، سەرەتای گۆڕانیش لە خوێنەکانیاندا دەردەکەوێت ، بەڵام ئەگەر خرانە ژێر چاودێری‌و چارەسەرکردنی پزیشکی‌یەوە ، ئاسایی ئەو نەخۆشانە لە چەند هەفتەیەکدا چاك دەبنەوە .

وە گەر ژەمە تیشکەکە بەرزبوو ، ئەوا هەموو ئەو کەسانەی بەری دەکەوون ، لە دوو سەعاتی یەکەمدا یان کەمتر لەوە دەرشێنەوەو گۆڕانێکی گەورەش لە خوێنەکانیاندا ڕوو ئەدات لەگەڵ خوێن بەربوونو تووك هەڵوەریندا ، وە ڕێژەی مردنیش لە ماوەی دوو مانگدا تیایاندا دەگاتە لە ٨٠٪ بۆ لە ١٠٠٪ ، هەر کەسێکیش ڕزگاری بێت‌و لەو ماوەیەدا نەمرێت ، ئەوا لە ماوەیەکی درێژخایەنی زۆردا بەرەو چاك بوونەوە دەچێت .

بەڵام ئەو کەسانەی لە چارەکردنی پزیشکانەدا پشت گوێ دەخرێن ، زوربەی زۆریان دەمرن ، وە بە پێچەوانەشەوە ئەوانەی بەر چارە کردنو تیمارکردن دەکەوون لە چاك بوونەوەدا شانسێکی گەورەیان بۆ دەرەخسێت .

خوێنی ئادمیزاد لە سێ توخمی سەرەکی پێکهاتووە : ١ – خرۆکە سوورەکان ٢ – خرۆکە سپی‌یەکان ٣ – خوێنە خەپلەکان ، وە هەمووشیان لە زەرداوی پلازمادا مەلە دەکەن . فرمانی خرۆکە سوورەکان گواستنەوەی ئۆکسجینە بۆ هەموو خانەکانی لەش‌و توخمێکی پێویستە بۆ ژیان ، وە فرمانی خرۆکە سپی‌یەکانیش بەرگری کردنی لەشە دژی میکرۆبی نەخۆشی‌یەکان ، بەڵام خوێنە خەپلەکانیش تەنها فرمانی خوێن مەیاندنە لە کاتی خوێن بەربووندا . جا ئەگەر هەموو ئەندامو بەشەکانی لەشی مرۆڤ بەر ژەمە تیشکێکی زۆر بەرز کەوت ، ئەوا ڕێژەی خەستی‌ی هەموو پێکهاتووەکانی ناو خوێن دەگۆڕێت‌و ، هێزی بەر هەڵستی‌ی ئەو کەسە بەرکەوتنەیە دژی نەخۆشی‌یەکان کەم دەکاتەوە بە هۆی کەم بوونەوەی ژمارەی خرۆکە سپی‌یەکانەوە ، لە هەمان کاتیشدا کەم بوونەوەی ژمارەی خوێنە خەپلەکان دەبێتە هۆی نەمەیینو نەگیرسانەوەی خوێنو بەردەوامی‌ی خوێن بەر بوونەکە . لێرەدا پێویستە ئەوا بزانین کە تیشك لە زوربەی کاتدا بەر خودی خانەکان ناکەوێت ، بەڵکو بەرسەرچاوەی دروست بوونەکانیان

دەکەوێت لە ئەندامەکانی لەشداو بە تایبەتیش مۆخی ئێسقان .
خۆ ئەگەر لە جیاتی هەموو لەش تەنها بەشێکی دیاری کراوی لەشی مرۆڤ بەر تیشك کەوت ئەوا ئازارەکەی کەمتر دەبێتو بەرئەنجامە زوو دەرکەوتووەکەی متانە دەکاتە سەر بەشە بەرکەوتەکە .

**شوێنکارە دواکەوتووەکانی ژەمە تیشکە بەرزەکان :**

زوربەی راپورتەکان ئەوەمان نیشان ئەدەن کە ئەگەر مرۆڤ بۆ یەکجاریش لە ژیاندا بەر ژەمە تیشکێکی بەرز کەوت ، لەوانەیە یەکێك لەم دوو جۆرە نەخۆشییانەی خوارەوەی پاش بەرکەوتنی تیشکەکە بە ماوەیەکی دوورو درێژ لێ دەربکەوێت :

**أ – مەترسییە جەستەییەکان : Somatic Risks**

ئەو مەترسییانەن کە تووشی هەموو جۆرە خانەکانی لەش دەبن جگە لە رەگەزە گلاندەکان . ئەو تیشکانەش هۆێکی سەرەکیی تووشبوونی جۆرەها نەخۆشیی شێر پەنجەو لووە پیسەکانن ، لەوانەش :

١ – شێر پەنجەی خوێن :
ئەگەر لەشی ئادەمیزادێ بەر تیشك کەوت ، بەرەو تووشبوونی نەخۆشی شێرپەنجەی دەبات ، بەڵام بۆ جۆرە نەخۆشییەکی دیاری کراو نا ، بەڵکو بۆ گەلێك لە جۆرە جیاوازەکانی ئەو نەخۆشییەی دەبات ، سەرچاوەی دروستکردنی خرۆکەکانی خوێنیش لە هەموو بەشێکی تری لەش زیاتر مەترسی تووشبوونی شێرپەنجەی لێ دەکرێتو تووشی شێرپەنجەی خوێن (لیۆکیمیا)ی دەکات ، لەوانەشە سەرچاوە دەمارییەکان یا گلاندی دەرەقی و لیمفە خانەکانو خانەکانی ناوە پەردەی رەگەزە گلاندەکان ، یا خانەکانی پەردە لینجەکەی ریخۆلە باریکەو هی تری جگە لەوانەش تووش بکات .

٢ – تاریك بوونی گەردبینەکەی چاو : لەوانەیە گەردبینی چاوی مرۆڤێکی تیشك بەرکەوتوو پاش تێپەربوونی ماوەیەکی دوورو درێژ تاریك ببێت ، ئەم تاریكبوونەش وردە وردە زیاد دەکات تاکوێر دەبێت .

٣ – نەزۆکی : لەوانەیە ژنو پیاو وەك یەك بە تیشك بەرکەوتن تووشی نەخۆشیی نەزۆکی ببن ، بە تایبەتی ئەگەر تیشکە گامایان بەربکەوێت ، ئەم نەزۆکییەش یاکاتی دەبێتو ساڵێ یا دوو ساڵ دەخایەنێت ، ئەگەر ژەمەکە مام ناوەندی بوو . وەیان هەمیشەیی دەبێت ئەگەر ژەمە بەرزەکانبوو .

٤ – بۆگەن کردن : ئەم جۆرە شوێنکارە یان پاش بەرکەوتنی تیشکەکەبەماوەیێکی دوورودرێژ دەردەکەوێت باری بۆگەنکردن لە هەموو ئەندامە جیاوازەکانی لەشدا دەست پێ دەکات ، بە هۆی بێتوانایی ئەتەمە تیشك بەرکەوتەکانەوە ، لە کرداری تازەکردنەوە یا دروست کردنەوەدا ، ئەمەش دەبێتە هۆی لاوازی یانەمانی کاری ئەندامەکە ، مەرجیش نییە کە هەمیشەیی بێت .

٥ – کورت کردنەوەی تەمەنی مرۆڤ : شتێکی سروشتییە کە ئەو کارتێکردنانە تەمەنی مرۆڤ کورت دەکەنەوەو کاریش دەکەنە سەر درێژایی ژیانی ئەوکەسانەی بەر تیشك دەکەوون . لە خوێندنەوەی هەواڵی مردنی فیزیاوییە تیشك بەرکەوتەکاندا راستییەکمان دەربارەی نزم بوونەوەی تێکرای تەمەنیان بۆ دەرکەوت . بۆ نموونە : تێکرای تەمەنی ئەو رادیۆلۆجییانەی لە نێوان ساڵی ١٩٣٥تا ١٩٤٤دا مردن ٨ر٤ ساڵ کەمتر بوو لە تێکرای تەمەنی پسپۆرەکانی ئەو لقە زانیارییانەی کە ئیشکەران تیایدا بەر تیشك نەکەوتبوونو لە هەمان ماوەی ئەو کاتەشدا مردبوون . لە بەدبەختی ئەوانەدا ئەو کاتە هیچ رێگە – یەك بۆ پێوانەی ئەو ژەمە تیشکانە نەبوو کە رادیۆلۆجییەکان وەریان دەگرت ، لەبەر ئەوە زاناکان دووچاری بارێکی گران بوون بۆ دانانی پەیوەندیی برێکی راست لە نێوان درێژی تەمەنو بری ژەمە تیشکەکەدا .

٦ – شێر پەنجەی گلاندی دەرەقی : وەك دەرکەوتووە چارەکردنی شێرپەنجەی گلاندی، دەرەقی بە تیشکە سینی لە منالدا لەوانەیە تووشی شێرپەنجەی ئەو گلاندەی بکات ، بەڵام

به ڕێژەیەکی کەم ، لەساڵێکدا لەوانەیە بگاتە ٥ر٢ باری تووشبوون لە یەك ملیۆن کەسدا بە ڕێژەی یەك ڕاد بۆ هەر یەکێك ، بەڵام لە گەورەدا زۆر زۆر کەمترە لەو ڕێژەیە ، لەوانەیە بگاتە دە یا بیست تووشبو لە یەك ملیۆن کەسدا ئەگەر ساڵی یەك ڕادی بەرکەوێت .

٧ – شێرپەنجەی ئێسقان : ئەم نەخۆشی‌یە لەو کەسانەدا دەرکەوتووە کە بە تیشکە سینی یابەتوخمی یۆرانیۆمی تیشکدەر لە شێوەی دەرزیدا چارەی نەخۆشی‌یە کەیان پی‌کردووە ، جگە لەوەش شێرپەنجەی ئێسقان لە نێوان ئەو کەسانەشدا دەرکەوتووە کە لە کارگە پیشە سازی‌یەکاندا کاردەکەن ، وەیا ئیش بە مادده فۆسفۆری‌یەکان دەکەن لە کارگەکانی سەعاتدا .

٨ – شێر پەنجەی هەناو : ئەو ئەندامانە دەگرێتەوە کە لە ناو سك‌و بەشەکانی تری لەشدان ، وەك گەدەو ریخۆڵەکان‌و پەنکریاس‌و جگەرو لیمفە گری‌کان ، لە کاتێکدا کە مرۆڤ بەتیشکە سینی چارەی نەخۆشی‌ی ڕەق بوونی بڕبڕەی پشت دەکات ، ئەو ئەندامانە لەوانەیە دوو چاری ئەو نەخۆشی‌یە ببن ، وە وەك لە لێکوڵینەوە زۆرەکانی بەر ئەنجامی تەقینەوە ئەتۆمی‌یەکانی هیرۆشیما و ناگازاکی‌دا دەرکەوتووە ، ژمارەیەکی زۆری هەناوە ئەندامەکان تووشی شێرپەنجەبوون بە هۆی بەرکەوتنی ژەمی زۆر بەرزی تیشکەوە .

٩ – باری ناسروشتی : Abnor Mal Cases

هەندێك لە دایکە دانیشتووەکانی هێرۆشیماو ناگازاکی کە لە هێرشە ئەتۆمی‌یەکە ڕزگاریان بووە منالی دزێوو نارێك‌و تێکچوویان‌بووە ، بە هۆی وەرگرتنی ئەو ژەمە تیشکانەوە کە بڕەکەی لە ١٢٠ ڕاد کەمتر نەبووە بۆ هەر ژەمێك .

**ب – مەترسی‌یە ڕەچەڵەکی‌یەکان : Genetic Risks**

ئاشکرایە کە تیشکە بە ئایۆن کەرەکان هۆیەکی سەرەکی‌و باریدە دەری گۆڕانە ڕەچەڵەکی‌یەکانن ، کە پی‌ی دەڵێن (بازدان) Mutations ، وە تائێستاش دەربارەی ئەو منالانەی لە ئەنجامی تیشك بەرکەوتنی دایکیانەوە بە دزێوی لە دایك‌بوون هیچ زانیاری‌یەکی دڵنیاکەر نەزانراوە ، هەرچەندە زۆرترین کەسێك کە بەر ژەمە تیشکی زۆر بەرز کەوتبێ دانیشتوانی دوو شارەکەی یابانن کە لە ژیاندا ماونەتەوە ، دوای بۆردومانە ئەتۆمی‌یەکە ئەوەی بە تەواوی بتوانین دان بە ڕاستی‌یەکەیدا بنێین نزم بوونەوەیەکی کەمی لە دایك بوونی کوڕە ، وەتا وەرگرتنی بڕی ژەمە تیشکەکە زۆر بێت ، کوڕ لە دایك‌بوونیش کەم دەبێتەوەو ، لەوانەشە بگاتە لە ١٠٪ ، ئەگەر ژەمەکە بگاتە سنووری (٢٠٠) ڕاد ، بەڵام بۆ پیاو ئەو ژەمە تا سنووری (٢٠) ڕادە بۆ ئەو ڕێژەیە ، خۆ ئەگەر لە (٦٠) ڕاد زیاتر بوو لە دایك‌بوونی کوڕیش زۆر کەمتر دەبێتەوە ، هەندێ بەڵگەش هەن بۆ ئەوەی ئەگەر ژەمەکە هەرچەندە کەمیش بێت بازدانێکی زۆر زیان بەخشی لێ دەوەشێتەوە . وە مەترسی‌ی تیشك لەسەر ڕەگەزە خانەکان زۆر گەورەترە وەك لە جەستە خانەکان ، خۆ ئەگەر شوێنکاری تیشکەکە لە سەر توخمە زاڵەکان کاریگەربوو ، بەدەگمەن لە دایك‌بوونی منالێك سروشتی دەبێت ، وە بە پێچەوانەشەوە بۆ توخمە شاراوە نازاڵەکان . وە ڕوودانی مردنی کورپەلەیەکی ساوای ناو منالدان لەبەرەیەکی تیشك بەرکەوتەدا کە یەکێك لە دایك‌و باوکەکە ڕادێکیان تیشك بەرکەوتبێ ڕێژەی یەك بۆ دەهەزارە .

وە هەستەوەرترین ڕێگە بۆ زانینی تیشك بەرکەوتنی مرۆڤ گەرانە بە دوای لادانی (انحراف) کرۆمۆسۆمەکانی ناووکی خانەی لیمفوسایتەکاندا کە یەکێکە لە جۆرەکانی خرۆکە سپی‌یەکانی خوێن . وە دوای لێکوڵینەوەی زۆر ، زاناکان ئەوەشیان بۆ دەرکەوتووە کە دوای چەند ساڵێك تیشك بەرکەوتن کرۆمۆسۆمەکان تووشی لەناوچوون دەبن ، زۆر – بشیان لە ڕێبازی سروشتی خۆیان لائەدەن‌و هۆکەشی نەزانراوە .

**یەکە تیشکاوەری :**

بۆ پێوانەی ژەمە تیشکێکی گاماو تیشکی سینی‌و ڕۆنتکن یەکەی ڕۆنتکن بەکار دەهێنرێت ، ئەوەش بە هۆی یەکەیەکی

ئەلەکترۆستاتیکی ی ئایۆنە گەرمو ساردەکانەوە لە ١٢٩٣ .و ، گرام هەوا لە ژێر بارێکی پێوانەیی‌دا ، یان ٦ر١×$١٠^{١٢}$ جووت ئایۆن لە یەك گرام هەوا .

وە بۆ دروست‌کردنی یەك جووت ئایۆن لە هەوایەکی پێوانەیی‌دا ٣٤ ئەلەکترۆن ڤۆلتی دەوێت . کەواتە ڕۆنتکن ژەمە تیشکێکە ٧ر٨٧ ئێرگ ووزە لە یەك گرام هەوا دەر دەپەڕێنێت .

بۆ پێوانەی شوێنکاری تیشکەکان لە زیندەوەرەکاندا یەکەیەکی کەش هەیە پێ‌ی دەڵێن (ئار . ئی . ئێم) (rem) کە پێتە یەکەمەکانی ئەم ڕستەیەن :

roentgen equivalent man

واتە هاوهێزە ڕۆنتکەنی پیاو ، ئەمەش بریتی‌یە لە نوێنەری بری هەر جۆرە تیشکێك کە ئەبێتە هۆی دروست‌کردنی هەمان ئەو کارتێکردنەی کە یەك ڕۆنتکەن لە تیشکە گاما یان تیشکە سینی ئە لەشی زیندوەردا دەیکەن .

**ژەمە نزمە هەمیشەیی‌یەکان :**

ئەو ژەمە تیشکە نزمانەی کە لە ڕۆژێکدا کۆدەبنەوەو بە یەك میللی (ئار . ئی . ئێم) دادەنرێن ، بە تێپەڕبوونی زەمان دەچنە پێ ئەو چەند (ئار . ئی . ئێم) ـەی کە لە ساڵێکدا لە لەشی مرۆڤدا کۆ دەبنەوە . جا بۆیە پێویستە لە بەر نامەی گۆڕانی ووزە ناووکی‌یەکاندا ئەم زیانە بخرێتە پێش چاو .

وە جێ‌ی سەر سوورمانیش نی‌یە ئەگەر هەوڵێکی بێ ووچانو پارەیەکی یەکجار زۆریش بۆ دڵنیابوون لە بوونی ، یان پێوانەی بری شوێنکاری ئەو زیانە تەرخان بکرێت لە هەموو تەقیگەکانی جیهاندا ، بە تایبەتی لەم ساڵانەی دوایی‌یەدا .

وە بۆ شانس ، تا ئێستا لە ئەنجامی بەرکەوتنی ئەو ژەمە نزمانەدا هیچ شوێنکارێکی زیان بەخش لە تەندروستی‌ی ئەو کار گوزارانەی لەو تاقیگە ناووکی‌یانەدا ئیش دەکەن دەر نەکەوتووە .

تێکرای بەر ئەنجامی هەموو ئەو زانینە زۆرانەی بۆ تووش نەبوونی کارگوزارانی ئەو کارگەی ووزە ناووکی‌یانە هاتۆتە دەست ، متمانەی کردە سەر بەرکەوتنی هەزاران کار گوزارانی ئەو کارگە ناووکی‌یانەی کە ژەمە تیشکی ساڵانەی نزمیان بەر دەکەوت . وە نەبوونی هیچ بەڵگەیەکیش بۆ زانینو دەرخستنی شوێنکاری ژەمە نزمەکان ، پاڵی بە توێژەرەکانەوە نا کە وای بخەملێنن هەر وەك بەرکەوتنی شوێنکاری ژەمە بەرزەکان بێ ، کە نزیکەی ١٠٠ (ئار . ئی . ئێم) یان زیاتر بۆ ئاستی ژەمە نزمە هەمیشەیی‌یەکانە . ئەوەش ئەگەر گریمان کە شوێنکاری تیشکەکە پێچەوانە لە گەڵ بری ژەمەکەدا بگونجێت‌و متمانە نەکاتە سەر تێکرای کاتی وەرگرتنی ژەمەکە .

وە لە ڕاستیشدا هیچ بەڵگەیەکی سەلمێنەرمان لای‌یە بۆ بوونی پەیوەندی‌یەك لە نێوان شوێنکاری ژەمە زۆرەکانو ژەمە کەمەکاندا . لە لایەکی تریشەوە لەیەك هۆ زیاتر هەیە بۆ بڕوا پێ‌هێنان بەوەی کە هەندێ شوێنکاری ژەمە تیشکە زۆر تیژەکان زۆر کەمترە لەوەی کە لەگەڵ زۆری‌ی ژەمەکەدا بگونجێت . بۆ نموونە : نەخۆشی تاریك‌بوونی گەردبینەکانی چاو پاش وەرگرتنی ٢٠٠ (ئار . ئی . ئێم) دەست پێ‌دەکات .

بۆ شارەزایی زیاتر لە کاری تیشکەکان ، تاقی کردنەوەی زۆر خەست‌و خۆڵ کرا لە سەر هەزاران مشك‌و درانە بەر لێدانی ژەمە تیشکە گامای هەمیشەیی ، لە ئەنجامدا ئەوەی بەدی‌کرا لە مشکە می‌یەکاندا تێکرا زۆر بوونی کرداری پیتاندن‌و زاوزێ بوو شان بە شانی ئەو ژەمانەی وورده ووردە کۆ دەبنەوە بۆ ٣٠٠ (ئار . ئی . ئێم)و ناشگۆڕێت بۆ کەمتر لەو برە . لەم نموونەیەشدا نزمترین شوێنکاری تیشك دەر دەکەوێت ، وە شوێنکاری شان بەشان ڕۆیشتنی ژەمە بەرزەکان لەوانەیە هیچ پەیوەندی‌یەکی بە ژەمە نزمەکانەوە نەبێت .

ئەمەیان شتێکی چاوەڕوان‌کراوە ئەگەر بڕوانینە ئەم بارەیان‌و متمانە بکەینە سەر بنچینە فیزیاوی‌یەکەی تەنە زیندووەکان ، کە توانای چاك بوونەوەیان لە زیان‌و ئازارە تیشکاوەری‌یەکان هەیە ، تەنانەت لە ئەندامۆچکەکانیشدا ، بۆ نموونە : لە کاتی بچڕانی تاوە دەزوولەیەکی گەردیلەی (دی . ئێن . ئەی) دا بە هۆی بەرکەوتنی تیشکەوە ، دەرکەوت کە گەردیلەکە سەلامەتەو ، تاوە دەزوولە بچڕاوەکەش خۆی توانای خۆ چاك کردنەوەی هەیەو شێوە ئەسڵی‌یەکەی جارانی خۆی دەگرێتەوە .

## سەرچاوە سروشتیو دەستکردەکانی تیشك

ڕەگەزی مرۆڤایەتی لە سەرەتای بوونی‌یەوە لەسەر زەوی تا ئێستا بەرەنگاری لێدانی تیشکە سروشتی‌یەکان بووە . ئەم تیشکانەش لە دوو سەرچاوەوە هەڵدەقوڵێن :

١ – تیشکی گەردوونی کە بە ووزەیەکی زۆر بەرزەوە لە ئاسمانی دەرەوە دێت .

٢ – زرِ توخمە تیشکاوەرەکان : کە لە سەرەتای پێکهاتنی زەوی‌یەوە لە سروشتدا هەن .

سەرەڕای ئەم دوو سەرچاوەیە ، سەرچاوەی سێ‌یەمیش لەم چەرخەدا دەرکەوت ، لە ئەنجامی دۆزینەوەی تیشکە سینیو بەکار هێنانە زۆرەکانی لە مەبەستە پزیشکایەتی‌یەکاندا . پاشان دروست‌کردنی فرِنو تەقەمەنی ناووکیو ئەتۆمی‌یەکانو ، تەلەفزیۆنە ڕەنگاو ڕەنگەکانیش ژمارەیەکی زۆری کەن لەو سەرچاوانەی تیشکە ناووکی‌یەکانیان لێوە دەر دەپەرِێت . وە لەبەر ئەوەی ئەو تیشکانە زیانی زۆر بە تەندروستی ئادەمیزاد دەگەیەنن ، ئەگەر برِێکی زیاتری لە سنووری دیاری‌کراو بەرکەوت ، بۆیە لێرەدا دانانی پێوەرێکی ئەو تیشکانە گرنگە بۆ زانینی ئەو ژمانەی کە مرۆڤ لە توانایدا هەیە وەری بگرێت بێ ئەوەی زیان بە تەندروستی‌ی بگەیەنێت .

بۆ ڕوون کردنەوە ئەم خشتەیەی خوارەوە تێکرِای ئەو ژمە تیشکە سروستیو دەستکردانە دەر دەخات کە مرۆڤ لە ڕێکی رووی دەریا وەری دەگرێت .

أ – تیشکە سروشتی‌یەکان

ژەم لە یەك میللی ئارِ . ئی . ئێم‌ی ساڵێکدا

| | |
|---|---|
| سەرچاوە دەرەکی‌یەکان | |
| ١ – تیشکە گەردوونی | ٤٥ |
| ٢ – تیشکە گاما | ٦٠ |
| سەرچاوە ناوەکی‌یەکانی تیشك | |
| ١ – پۆتاسیۆم – ٤٠ | ١٧ |
| ٢ – توخمە قورسەکان | ٦ر٦ |
| ٣ – کاربۆن – ١٤ | – |
| کۆ = ٦ر١٢٩ | |
| ب – تیشکە دەستکردەکان | |
| ١ – تیشکە سینی‌یە بەکار هێنراوەکان لە پزیشکایەتی ددانو ناو سکدا | |
| ٢ – گیراوە تیشکاوەرەکانی دەرمانخانەکان | |
| ٣ – تیشکە ناووکی‌یە باریوەکان | |
| ٤ – ووزە ناووکی‌یەکان | ٠٠٣ |
| ٥ – بەکار هێنانە پیشەیی‌یەکان | ٨ |
| ٦ – هەمە جۆرەکانی تر | – |
| کۆ = ٨و | |

کەواتە تێکرِای کۆی هەمووی = ٦ر١٢٩ + ٨ر٨٠ = ٨ر٠ میللی (ئار . ئی . ئێم) لە ساڵێکدا . وەك لە خشتەکەدا د دەکەوێت زورب‌ەی ژمە تیشکەکان لە ئاسمانی دەرەوە دێنو لەش دەکەوونو . نیوەی ئەو بەرکەوتنەش لە تیش گەردوونی‌یەکانەوەیە . ئەو برِانەش تەنها بۆ شاری نیویۆرك ژمی پێوەر دادەنرێت .

پێکهێنەرە سەرەکی‌یەکانی تیشکی گەردونی ، پێ گەیشتنیان بە چینە بەرزەکانی ئاسمانی زەوی ، بریتین پرۆتۆنەکانو تەنۆلکەی ئەلفا ، وە بە گەیشتنو خۆ پیامالینی تیشکانە بە چینەکانی ئاسمانی زەوی‌دا ، تیشکی ناسەرەکی وەك تیشکە گاماو نیوترۆنو میزۆن دروست دەکەن ، ئەمانە پێکهێنەرەکانی ئەو ژمە تیشکەن کە مرۆڤەکانی سەر زە وەری دەگرن . وە تا لە رووی زەویشەوە بەرزتر ببینەوە ب ژمەکەش زیاتر دەبێت . بۆ نموونە : برِی ئەو ژمەی کە شاری دنێڤەری کلۆرادۆی ئەمریکا بەر خەڵك دەکەوێت دوو ئەوەندەی برِی ئەو ژمەیە کە لە شاری نیۆیۆرکدا هەیە . لەوەش زیاتر تیشکە گەردوونی‌یەکان لە گەڵ هێڵی پانیش دەگۆرِێن ، چونکە لە هێڵی ئیستوادا برِی ژمەکە لە ٥ کەمترە وەك لەو برِانەی لە جەمسەرەکانی زەوی‌دا هەن . هەر ئەمریکا لە ولایەتی فلۆریدا تێکرِای برِی ئەو ژمە تیشکە

میللیِ (ئار . ئی . ئێم) ـە ، بەڵام لە ولایەتی وایافیلك لە ١٠٠ میللی (ئار . ئی . ئێم) زیاترە .

هەروەها ژەمە تیشکێکی گاما لە زەوی‌دا بە پیێ‌ی زۆرو کەمی‌ی بوونی توخمە تیشکاوەرە سروشتی‌یەکان دەگۆڕێت ، بۆ نموونە :

دانیشتوانی گەڕەکی (مانهاتن) لە نیۆیورك لە ساڵێکدا ١٥ میللی (ئار . ئی . ئێم) زیاتر وەر دەگرن وەك لە دانیشتوانی گەڕەکی (برۆکلن)ی هەمان شار ، چونکە گەڕەکی یەکەم دەکەوێتە سەر بەردە بورکانی‌یەکانو یۆرانیۆمی یەکجار زۆری تێدایە . وە لە بەر ئەوەی لە ڕووبەرە فراوانەکانی هیندو بەرازیلدا کەرەسە خاوەکانی (ثۆریۆم)ی زۆر تێدایەو ئەو خەڵکەش کە لە کۆنەوە لەوێدا ژیاوون نەوە لە دوای نەوە ژەمە تیشکە گامای زەوی‌یان ئەوەند نۆشیوە برەکەی لە ساڵێکدا گەیشتۆتە زیاتر لە دوو هەزار میللی (ئار . ئی . ئێم) ، بەڵام ئەو ژەمەی لە خشتەکەدا نووسراوەو ٦٠ میللی ئار . ئی . ئێمە ، بە تێکڕای ژەمی ساڵانە دادەنرێت .

لەو شوێنەوارەی مرۆڤی تێدا دەژی ، پۆتاسیۆم – ٤٠ بەسەرچاوەیەکی سەرەکی‌ی بەرکەوتنی تیشکە ناوەکی‌یەکان دەژمێررێت ، وە پاش ئەوەی تەنۆلکە بێتا ساردەکان ئەداتەوە دەپووکێتەوە بۆکالیسیۆم – ٤٠ ، وەدوای دەربەڕاندنی تەنۆلکە بێتا گەرمەکان یا دیل کردنی ئەلەکترۆنی بۆ ئۆرگۆن – ٤٠ دەگۆڕرێت . وە تەمەنە نیوەکەشی لە سنووری ٢٨ر١×١٠^٩^ ساڵدا دادەنرێتو ، بوونی زر توخمەکانیشی کە هەن لە ١١٨ ٠ر٠٪ یە ، لە لەشی پیاوێکی مام ناوەندیدا کە قورسی‌یەکەی ٧٠ کغم بێت ١٣٠ گرام پۆتاسیۆمی تێدایە ، لەوەش ١٥٧ ٠ر٠ گرامی پۆتاسیۆم – ٤٠ ـە ، وە تێکڕای چالاکی ئەم پۆتاسیوم – ٤٠ ـە لە لەشی مرۆڤدا بە نزیکەی ١١ ٠ر٠ مایکرۆ کۆری دادەنرێت .

لە خشتەکەدا ژەمە تیشکی توخمە قورسەکان ٦ر٦ ئار . ئی . ئێمە ، ئەمەش ئەو ناووکە جیاوازانەن کە لە پووکانەوەی یۆرانیۆم – ٢٣٨ و ثۆریۆم – ٢٣٢ وە وە دروست دەبن . وە گرنگترینی ئەو توخمانەش ڕادیۆم – ٢٢٦ و ڕادیۆم – ٢٢٨ و ڕادۆن – ٢٢٢ و قورقوشمی – ٢١٠ یە . وە سیفەتە کیمیاوی‌یەکانی ڕادیۆم – ٢٢٦ و ڕادیۆم – ٢٢٨ لە ڕووی نیشتنو خەست بوونەوەیان لە خانەکانی ئێسقاندا لە کالیسیۆم دەچێت . ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ژەمی ئەتەمەکانی ئێسقان زۆر زیاترە لەو ژەمەی لە خشتەکەدا نووسراوە ، بەڵام ڕادۆن – ٢٢٢ کە گازێکی سستەو بەر ئەنجامی پووکانەوەی ڕادۆن – ٢٢٦ـەو لە تەپۆتۆزەکانی ئاسمانەوە بڵاو دەبێتەوە ، لە ڕێبازی هەناسەوە دەچێتە لەشی مرۆڤەوە ، کەواتە زوربەی پێکهێنەرەکانی ژەمە تیشك لەبەر ئەنجامەکانی ڕادۆنەوە دروست دەبن نەك ڕادۆن خۆی . وەبرەکەشی وەك لە خشتەکەدا نووسراوە لە سنووری ٣ تا ٦ر٦ میللی (ئار . ئی . ئێم) دەبێت لە ساڵێکدا وە لە بۆ چوونو جێگە گری‌ی هەمیشەیی‌دا لە ناو ئێسقانا قورقوشم – ٢١٠ لە ڕادۆن –٢٢٦ و ڕادۆن – ٢٢٨ کەمترنی‌یە .

بەڵام کاربۆن – ١٤ کە تەنۆلکەکانی بێتا دەهاوێژێتو تەمەنە نیوەکەشی نزیکەی ٥٧٣٠ ساڵە ، ئەگەر هەمیشە لە باری پێکهاتندا نەبوایە بە هۆی نایترۆجینی هەواوە کە نیوترۆنەکانی تیشکە گەردونی‌یەکان دەمژێت هەردەمێك بوو لە سروشتدا نەدەما . وە خەستی‌ی کاربۆن – ١٤ بە نزیکەی ٥ر٧ بیکۆکۆری دادەنرێت بۆ هەر گرامێك لە کاربۆنی سروشتی . لەبەر ئەوە لە هەموو زیندەوەرێکدا دەردەکەوێت . وە لەشی مرۆڤیش لە ١٨٪ قورسایی‌یەکەی لە کاربۆن پێك هاتووە . وە ئەو چالاکی‌یە تیشکاوەری‌یەی لە لەشی مرۆڤێکی ٧٠ کغم دا هەیە لە سنووری ١ر٠ مایکرۆکۆری‌یە ، واتە هاوتای ژەمێکی یەك میللی (ئار . ئی . ئێمە) لە ساڵێکدا . ئێستا دێینە سەر باسی گرنگترین سەرچاوە دەستکردەکان :

**١ – تیشك گرتن لە نەخۆشخانەکاندا (پزیشکەژەم) :**

مرۆڤ لە کاتێکدا کە دووچاری نەخۆشی‌یەکی گرانو

ونادیار دەبێت ، **بە ناچاری** لە ژێر چاودێری پزیشکدا پەنا دەباتە بەر **تیشك گرتنی خۆی** لە دەزگا تیشکاوەری یەکانی نەخۆشخانەکاندا **بۆ دەست** نیشان کردنو چارەسەرکردنی نەخۆشی یە دەرونیو **سکەژانەکان** ، هەروەها لە نەخۆشی یەکانی ددانو لووتو **کەللە سەریشدا** ، لەو بەکار هێنانانەدا پزیشكو یارمەت دەرو **نەخۆشەکان تووشی** مەترسی یەکانی بەرکەوتنی تیشکەکان دەبن .

بۆ دانانی بری **ئەو ژەمە** تیشکانەی لە خشتەکەدا نووسراوونو تایبەتین **بەم باسەوە** ، متمانە کرایە سەر ئەو لێکۆڵینەوانەی کە بۆ **ژمارەیەکی** زۆری دانیشتوانی وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاکرا ، ئەوەش ماوەی شەش ساڵی خایاند لە **١٩٦٤**وە تا ساڵی **١٩٧٠** ، پاش دڵنیابوون لە رەچاوکردنی فراوانیی بەکارهێنانی تیشکە سینی لە بواری پزیشکایەتیدا بۆ دەست نیشانکردنی نەخۆشی یەکە . زاناکان بە هۆی چاکێتیی پیشەساز کردنی تیشکە سینیو بەکار هێنانی یەوە ، توانیویانە بری ئەو ژەمە تیشکەی دانیشتوان وەری دەگرن بە رێژەی لە **٣٠٪** کەم بکەنەوە ، وە بە پشت گوێ خستنو دوورکەوتنەوە لەو تیشکە فەحسانەی پێویست نین لە **١٠٪**ی تری لێ کەم کراوەتەوە ، ئەمە سەرەرای بەکارهێنانە فراوانەکانی زر توخمە تیشکاوەرەکانی وەك یۆد — **١٣٠** و فۆسفۆر — **٣٢** لە دەست نیشانکردنی نەخۆشی یەکاندا .

**٢ — تیشکە ناووکی یە باریوەکان** :

تەقینەوەی چەکە ناووکی یەکان لە ئاسمان دەبێتە هۆی بارینی پارچەو کەرەسەی چەکە ناووکی یەکە بۆ سەر گۆی زەوی ، ئەم پارچانەش لە دانەوەی تیشکە گاماو تیشکە بێتادا زۆر چالاکن ، وە ئەو ماددانە دەنووسێن بە تۆزو گەردداوەکانی ئاسمانەوە . بەڵام تەنۆلکە تیشکاوەرە قورسو گەورەکان نزیك بە جێگەی تەقینەوەکە دەکەونەوە سەر زەویو ، بچووکە کانیشیان لە چینە دوورو بەرزەکانی ئاسماندا بۆ ماوەی زیاتر لە پێنج ساڵ دەمێننەوەو ، وورده وورده بە درێژایی زەمان بە دەوری گۆی زەوی‌دا بڵاو دەبنەوە . وە زوربەی تیشکە ناووکی یە باریوەکان ناوەکین (داخلی) ، واتە لە ناووکە کەرتبوونەوە دێنو بەردەوام دەچنە لەشی مرۆڤەوە .

**لیژنەی ووزە ئەتۆمی یەکانی** جیهانی لە راپۆرتێکیاندا داوای وەستاندنی تاقی **کردنەوەی** چەکە ئەتۆمیو ناووکی یەکانی کردووە لە ئاسمانا ، لە **گەڵ ئەوەشدا** کە ئەمریکاو روسیاو بەریتانیا لە ساڵی **١٩٦٢** وە تا ئێستا ئەو تاقیکردنەوە ئاسمانی یانەیان وەستاندوە ، هێشتا تێکرای بری ئەو ژەمە تیشکەی لە ساڵێکدا گلاندەکانی زاووزێ وەری دەگرن ٢ میللی (ئار . ئی . ئێمە) ، وە ئێسقانیش لە ٤ تا ٦ میللی (ئار . ئی . ئێمی) بۆ دانراوە لە ساڵێکدا وەری بگرێت تا ساڵی **٢٠٠٠** زایینی لە سەرەتای دەستپی کردنی بارینەکەوە ، (واتە لە دەست پی‌کردنی تاقی‌کردنەوەی چەکە ئەتۆمی یەکان لە ئاسمانا) .

**٣ — توانای ناووکی** :

پەرەپی سەندنی بەکار هێنانی ووزە ناووکی یەکان ، بە شێوەیەکی سامناکی ئەوتۆ ژەمە تیشکەکان بەرەو زیادی ئەبەن کەگەلانی سەر زەوی بێچارەو دەسەو سانن لە وەرگرتنیدا . بەڵام ئەو زیادکردنە بە بری زۆر بچووك وکەم زیاد دەکات ، وە دەربەرینی ئەم تیشکانەش تەنها بە هۆی دەزگاکانی دروستکردنی ووزە ناووکی یەکانەوە نی یە ، بەڵکو لە کانەکانی یۆرانیۆمو پرۆژەو کارگە ناووکی یەکانیشەوەیە . وە بری ئەو ژەمەی کە گەلی ئەمریکا وەری گرتووە لە ساڵی **١٩٧٠**دا بەنزیکەی **٠٫٠٠٣** میللی ئار . ئی . ئێم دانراوە . واش چاوەروان دەکرێت لە ساڵی **٢٠٠٠**دا پەرە بە زیادکردنی توانای بەکارهێنانی ووزە ناووکی یەکان بدرێت بۆ یەك ملیۆن میگاوات . ئەوکاتە بری ئەوژەمە تیشکەی کە گەلی ئەمریکی وەری دەگرن لە سنووری ٠٫٢ میللی ئار . ئی . ئێم دەبێت .

**٤ — بەرکەوتنی پیشەیی** :

بری ئەو ژەمەی لە خشتەکەدا دیاری‌کراوە بە (**٢٠٠**) میللی ئار . ئی . ئێم خەملێنراوە بۆ ساڵێك ، ئەمەش لە ئەنجامی ئەو

پێوانانەی کە بۆ ٧٥٠٠ کەسی کارگوزارانی کێڵگەی تیشکاوەری‌کراوە . زوربەشیان لە کارگوزارانی بەشی پزیشکە تیشکاوەرین .

**٥ – ژەمی هەمە جۆر :**

گەلانی جیهان تێکرا ژەمی هەمەجۆر لە تەلەفیزیۆنی ڕەنگاو ڕەنگ‌و ئەو کات‌ژمێرانەی کە پیت‌و میلەکانیان بەرادیۆم ڕووکەش‌کراوە وەر دەگرن ، هەروەها لەو گەشتانەشدا کە بە فڕۆکە فیشکەدارەکان (النفاثه) دەکرێن ، هەرچەندە پرو پاگەندە بۆ ترساندنی خەڵك لە تیشکە دەرپەڕیوکانی تەلەفیزیۆنەوەکرا ، بەلاّم لە ڕاستیدا بەشی زۆری ئەو ژەمە لە گەشت‌کردن بە فڕۆکە فیشکەدارەکانەوە دێت ، هۆی ئەوەش بەرز فڕینی ئەو فڕۆکانەیە لە بەرزایی ٤٠٠٠٠ پیێدا ، ئەو ژەمە تیشکە گەردوونی‌یەی لەو بەرزایی‌یەدا وەر دەگرێت زۆر زیاترە لەوەی کە لە سەر زەوی وەر دەگیرێت . بۆ نموونە : بڕی تێکرای ئەو ژەمەی لەبەرزایی ٣٦٠٠٠ پیێدا وەردەگیرێت بە ٤ر٠ میللی ئار . ئی . ئێم دانراوە لە سەعاتێکدا ، کەواتە فڕینێك ئەگەر (١٠) سەعات بخایەنێت ، ژەمە وەرگیراوەکە دەکاتە (٤) میللی ئار . ئی . ئێم . ئەم بڕەش زۆر زیاترە لە بڕی ئەو ژەمەی کە لە تەلەفیزیۆنی ڕەنگاو ڕەنگ وەر دەگیرێت ، بەلاّم ماوەی بەرکەوتنی ژەمە تیشکی تەلەفیزیۆن زۆر زیاترە لە فڕینەکە .

**٦ – بەرزترین سنووری ژەمە تیشکی ڕێ پیێدراو :**

لە سەرەتای ئەم باسەدا ووتمان شوێنکارە بایۆلۆجی‌یەکانی تیشکاوەری لە ئەنجامی ئەو گۆڕانە کیمیاوی‌یانەوە دەبێت کە تیشکدانەوەکان لە خانەکاندا دەیکەن ، بە هۆی بە ئایۆن‌کردن‌و شوێنکارەکان‌و شیتەڵ کردنەوەو لادانە ئەتۆمی‌یەکانەوە . وە بۆ ژماردنی شوێنکاری تیشکدانەوە لە ئەندامە زیندووەکاندا پێویستە شوێنکاری تیشکدانەوە دەرەکی‌یەکان‌و ناوەکی‌یەکان ڕەچاوبکرێن ، وە شوێنکاری ئەمەی دوایی‌یان لە ئەنجامی ماددە تیشکدەرەکانەوە دەبێت کە لە ڕێگەی کۆئەندامی هەرس‌و هەناسەوە دەچنە لەشی مرۆڤەوە ، ئەمەش دیسانەوە لە گەڵ ڕەچاوکردنی هەندێك هۆی تری وەك : چڕی‌ی بە ئایۆن بوونەکەو تێکڕای کاتی بەرکەوتنی ژەمەکەو ، جێگەی کارتێکردنەکە لە لەشداو تێکڕای کاتی مژین‌و فڕێدانەوەی ماددە تیشکاوەرەکانی ناو لەش .

وە ئێستا ئەو یەکەیەی کە بیستراوەو کاری پیێ دەکرێت‌و ژەمە تیشکی لە هەموو جیهاندا پیێ دەپێون ، یەکەی (ئار . ئی . ئێمە) ، بە پیێی ئەوە بەرزترین ڕادەی ژەمی ڕێ پیێ دراو بۆ ناو لەش بە تێکڕای سەعاتەکانی کارکردنی هەفتانە کە (٤٠ سەعاتە) بریتی‌یە لە ٣ر٠ (ئار . ئی . ئێم) .

وە بۆ بەر نەکەوتنی هەموو لەشی کرێکاران ، یا بەشێکی کەمی لەشیان بە تیشکی زیاتر لە سنووری ڕێ‌پیێدراو . یا چوونە ژوورەوەی ماددە تیشکدەرەکان لە ڕێگەی دەم‌و لووتەوە بۆ ناو لەش ، هەوڵی پاراستنێکی زۆر توندو تۆڵ دراوە ، کرێکارانی ئەو کێڵگانە ئامرازی دۆزەرەوەی هەمە جۆر ، وەك نیشانە بەسنگەوە هەڵدەگرن ، لەو ئامرازانەدا بۆ تۆمار کردنی بڕی ژەمە وەرگیراوەکە شریتی تایبەتی تێدایە . وەیان لە شێوەی قەڵەم پانداندایەو لە گیرفانە بەرزەکەی بەدلەی کارکردنەکەدا دادەنرێت ، ئەم دۆزەرەوانەش لە کاتی تایبەتی خۆیاندا فەحس دەکرێن . هەر لە گەڵ دەرکەوتنی زیادکردنی بڕی ژەمە وەرگیراوەکەی هەر کرێکارێك کارو فرمانی پێویست بۆ پاراستنی ئەو کرێکارە وەر دەگیرێت‌و لە مەترسی دوور دەخرێتەوە .

**تێبینی :**

ئەو سەرچاوانەی بۆ ئەم باسە سوودیان لیێوەرگیراوە :


١ – الطاقة الذرية واستخداماتها
٢ – الاستخدامات السلمية للذرة
٣ – منشات توليد الطاقة النووية
٤ بۆمبای نیوترۆنی
٥ – زیندەوەر زانی پۆلی شەشەمی زانستی
٦ مصادر الاشعاع في الطب
٧ حقائق عن الحرب الكونية
٨ – الأسلحة الحديثة .

# شانۆگەری ی
# ئەنتیگۆنا

جان کوکتۆ

حسن حلاق

ئەم شانۆگەریەی سۆفۆکلیس بۆ یەکەم جار لە ئەسینادا ساڵی ٤٤٠ز پێشکەش‌کراوە ، بەڵام بەم شێوە تازەیە لە ٢٠ کانونی یەکەمی ١٩٢٢ لە سەر شانۆی ئەتیلیێ لە پاریسدا پێشکەش‌کرا . کەسەکان .

١ – ئەنتیگۆنا : کچی شا ئۆدیب شای پێشووی سیبە
٢ – ئیسمینا : خوشکی ئەنتیگۆنا
٣ – ئیریدس : ژنی کریۆن
٤ – کریۆن : شای سیبە
٥ – هیمۆن : کوری شاکریۆن‌و دەزگیرانی ئەنتیگۆنا
٦ – تیریسیاس : یەکێك لە پیرە زاناکانی سیبە
٧ – تیپەکە : نوێنەری گەل
٨ – پەیامبەر
٩ – پاسەوان

شوێن : لە بەردەم کۆشکی سیبە

تیپەکە تەنها دەنگێکی بڵند وخێرای لێ‌هەڵدەسێ ، وەك بڵێیت ووتارێکی رۆژنامە دەخوێنێتەوە ، لە «درزێکی» ناوەراستی دیکۆرەکەوە دێتە دەر . .

پەردە بەرز دەبێتەوە و ئەنتیگۆناو ئیسمینا لە ناوەراستی شانۆکەدا بێ‌جووڵە روو بە رووی یەك وەستاون .

## دیمەنی یەکەم

**ئەنتیگۆنا** : ئیسمینا ، خوشکە گیان ، دە بزانە تاقە یەك موسیبەتێکی ئیرسی ئۆدیب هەیە جۆبیتەر بەسەر ئێمەیدا نەدابێ . . ؟ باشە ، هەر ئیستە یەکێکی دیکەت پێ دەڵێم ، دە بزانم ئەتوانی هەڵی بێنی دوژمنان چ پیلانێکمان بۆ دەنێنەوە ؟

**ئیسمینا** : هیچ هەڵی ناهێنم ، لەو ساوەی براکانمان یەکتریان کوشت‌و لە شکری ئارجیەکان تێك شکان ، ئەم ژیانە هیچی تێدانەماوە من پێ‌ی دڵخۆش یادڵگرانبم .

**ئەنتیگۆنا** : گوێ بگرە . . بەڵام باجارێ لەم رێرەوە بچینە دەرەوە نەبادا یەکێ گوێی لێمان‌بێت .

**ئیسمینا** : چیت پێ‌یە ؟ چاوەکانت دەمشڵەژێنن .

**ئەنتیگۆنا** : دەپرسی چیم پێ‌یە ؟ هێە . . ئەی گوایا نابینی کریۆن رێ‌ی داوە براێکمان بنێژرێ‌و ئەوی دیکەیان نەء ! بۆلینیس نەدەبێ بنێژرێ‌و نە دەبێ کەسیش بۆی بگری . . لەشەکەی بۆ سەگ‌و واشە فرێ دەدەن . . ئەمە فرمانی کریۆنە ، کە دەبێ من‌و تۆش ملی بۆ کەچ کەین ، بەڵێ . . منیش . ماوەیەکی کە بە خۆی دێت‌و فرمانەکەمان بۆ دەخوێنێتەوە ، زۆریشی مەبەستە ئەم فرمانە بە چاکی جێبەجێ‌بکرێ ، هەر کەسێکیش سەرپێچی تێدا بکا دەبێ گەل بەردەبارانی‌بکا ، ئەوەی پێمە ئائەمەیە ، جا با بزانم شایانی باوو باپیرانت دەبی .

**ئیسمینا** : بەڵام دەبێ چیم پێبکرێ
**ئەنتیگۆنا** : پێشتر بڕیار بدە دەتوانی دەستی یارمەتیم بۆ درێژبکەی ؟
**ئیسمینا** : دەستی یارمەتیت لە چیدا بۆ درێژ بکەم ؟
**ئەنتیگۆنا** : لە ناشتنی مردووەکەدا
**ئیسمینا** : دەتەوێ سەرپێچی لە فرمانی پاشادا بکەیت‌و بینێژیت ؟
**ئەنتیگۆنا** : بەڵێ براکەم کە برای تۆشە دەنێژم ، بەڵێ برای تۆشە ، دووایی کە تەرمەکەی بوو بە خۆراکی درندە ، خەڵکی لۆمەی من ناکەن بە تەنها .
**ئیسمینا** : کچێ هەی نەگبەت ! ئەی فرمانەکەی کریۆن ؟
**ئەنتیگۆنا** : کێ مافی ئەوەی داوەتێ لە کەس‌و کارمان بکات .
**ئیسمینا** : ئەنتیگۆنا ! ئەنتیگۆنا ! باوکە بەستەزمانەکەمان چاوەکانی خۆی هەڵکۆڵی بەڵکو خوا لێی خۆش بێ‌و دواییش بە بەدناوی سەری‌نایەوە ، دایکیشمان ، کە دایکی باوکمان‌بوو ، خۆی خنکان ، براکانمان یەکتریان سەربڕی ، دە بروانە ، تەنها هەر من‌و تۆ ماینەوە ، دە ئیتر بزانە چ جۆرە کۆتاییەکی جەرگبڕ چاوەڕێمان دەکات ئەگەر سەرپێچی لە فرمانەکانی ئاغاکانماندا بکەین . ئەنتیگۆنا ئێمە ئافرەتین ، ئافرەت ، ناتوانین بە سەر پیاواندا زاڵ‌ببین . ئەوانەی کاربەدەست‌و دەسەڵاتدارن لە ئێمە بە هێزترو زۆردارترن ، من فرمانی دەوڵەت جێبەجێ‌دەکەم ئومێدیشم زۆرە بۆلینیس گەردنم ئازادبکات . مەگەر هەر شێت شان بداتە بەر ئیشێک‌و سووریش بزانێ لە وزەی ئەودانیە .
**ئەنتیگۆنا** : من زۆرت لێ‌ناکەم چونکە نامەوێ بە نابەدڵی یارمەتیم بدەیت ، چی بە باش دەزانی ئەوەبکە ، بەڵام من براکەم دەنێژم و زۆریشم پێ‌خۆشە دوای ئەوە بمرم ، ئەوساش دوو هاورێ بە تەنیشت یەکەوە دەنێژرێن ، چونکە بەلای منەوە ، ڕازی کردنی دڵی مردووان گەلێک گرنگتر و پیرۆزترە لە ڕازی‌کردنی دڵی زیندووان ، تۆش خۆت بەرپرسیاری ڕەفتارەکانتی‌و ئەگەر حەزیش دەکەیت دەتوانیت تەنانەت جنێو بە خواکانیش بدەیت .
**ئیسمینا** : من جنێو نادەم ، بەڵام هەست دەکەم دەسەڵات‌و توانای ئەوەم نیە ڕووبەڕووی شارێک ببمەوە بە جارێ .
**ئەنتیگۆنا** : تۆ بۆ خۆت بەهانە بدۆزەرەوە ، منیش ئەچم گۆڕێک بۆ براکەم هەڵبکەنم .
**ئیسمینا** : تۆ شێتی ، لە تاو تۆ هەموو لەشم دەلەرزێ .
**ئەنتیگونا** : هەقت بە سەر منەوە نەبێ ، بیر لە خۆت بکەرەوە
**ئیسمینا** : هیچ نەبێ لای کەس باسی مەکە . . مەیدرکێنە وەك من نایدرکێنم .
**ئەنتیگۆنا** : هیچ مەشارەوە ، دەتوانی بە کەیفی خۆت قسە بکەیت ، چەن پیویستم بە قسەکانت هەیە هەر ئەوەندەش پێویستم بە بێ‌دەنگیەکەت هەیە .
**ئیسمینا** : ئەم دڵە گرتیبەربوەم هێور کەرەوە
**ئەنتیگۆنا** : نەء ، من ئیشی خۆم دەزانم ، دەزانم چی دڵم ڕازی دەکا ، یان دەبێت ڕازی‌ی بکا .
**ئیسمینا** : بەڵێ ، بە مەرجێ هەموو شتێ بە کەیفی خۆت بێت ، بەڵام کێ دەڵێ وادەبێت ، تۆ دەتەوێ شتێك بکەیت لە وزەو توانای کەسدانیە .
**ئەنتیگۆنا** : چەندم لە وزەدابێ هەر ئەوەندە دەکەم .
**ئیسمینا** : بەڵام تۆ دووای کلاوی بابردوو کەوتویت
**ئەنتیگۆنا** : ئەم چەنەبازیەت ڕەزاتگران دەکاو مردووەکەشت لێ‌ دەڕەنجێنێ ، وازم لێ‌بێنە ، ئەگەر سەرنەکەوتم هیچ نەبێ سەربەرز و ڕوو سوور دەمرم .
**ئیسمینا** : «بە پلیکانەکانی لای ڕاستدا سەردەکەوێ» باشە دەبڕۆ دەی شێتە ، من دەزانم ئەم دڵەت دەتفەوتێنێ «دەچێتە دەرەوەو ئەنتیگۆنا بە تەنها دەمێنێتەوەو بیر لە نیازەکەی دەکاتەوە» .
لە پشت پەردەی لای ڕاستەوە خۆی ون دەکا .
**تیپەکە** : ئەی هەتاو ، بە بەر چاوە ئاگرینەکانتەوە ئارجیەکان کە هاتبوون بۆ یارمەتی دانی بۆلینیس‌و بە قسە پڕوپووچەکانی هەڵخلەتابوون ، تێیان تەقاندو هەڵاتن ، جۆبیتەر زۆری ڕق لە لووت بەرزی دەبێتەوە ، قەڵغانەکانی لووت بەرزی‌و فیز زلی‌یان دایە بەر بروسکەو هەورە تریشقە . هەر حەوت سەرکردەکە — کە بۆ گرتنی حەوت دەرگاکەی قەڵاکە هاتبوون — چەکیان فڕێ‌داو هەڵاتن ، جگە لە دوو براکە کەس لە مەیدانی شەڕدا

نەما .
ئێستاش سیبیەکان سەرکەوتن‌و گەلیش گۆرانی خۆشی‌و بەختیاری دەڵێت و ئەوەش کریۆنە ، پاشای تازەمان .
**کریۆن** : «لای دەرگای چەپەوە وەستاوە»
هاونیشتمانیان ، خواوەندەکان ئەم شارەیان لە وێران‌و کاول‌بوون پاراست ، منیش ئێستا کە ئێوەم کۆ کردوەتەوە دەزانم چەن رێزو حورمەتتان لە دڵدایە بەرامبەر بنەماڵەی لائیۆش‌و چەندیش دڵسۆزی ئۆدیب‌و کورەکانین ، هەر دوو کورەکەی ئۆدیب یەکتریان کوشت ، بۆیە گشت کاروباری دەوڵەت کەوتە دەست من .
مرۆڤ پێش تاقی‌کردنەوە زەحمەتە بناسرێت ، بەلام من لۆمەی ئەو کەسانە دەکەم کە حوکم دەکەن و رای دەروروبەرەکانیان وەرناگرن ، لۆمەی ئەو سەرۆکە دەکەم کە بەرژەوەندیی کۆمەلانی میللەت دەکاتە قوربانی بەرژەوەندیی تاکە کەسێك .
نامەوێ وابزانن ئەم قسانەم بۆ ئەوەیە پاکانە لای دوژمنان بکەم ، چونکە دەسەلاتداریێ دادپەروەر بێ دۆست‌و هاوریێی نیە ، منیش بە پێی ئەم بیروراو مەبدەئانە کاروباری دەوڵەت بەرێوە دەبەم ، هەر لەبەر ئەمەشە ئەو بریارەم دەرهەق کورەکانی ئۆدیب دەرکرد . ئۆتیۆکل سەربازێکە بە ئەوپەری رێزو شکۆمەندیەوە دەبێ بنێژرێ ، بەلام بۆلینیس لە دەرەوە گەرایەوە بۆ ئەوەی ئاگرمان تێبەردا‌ولەناومان بەرێ ، بۆ ئەوەی بمانکا بە کوێلەو زەلیلمان بکات ، بۆیە بریارمدا هیچ جۆرە داب‌و دەستوورێکی رێزو حورمەتی بۆ نەکرێ‌و لەشەکەی بخرێتە بەر سەگ‌و واشە ، ئەمەیە بریارەکەم‌و وابەئێوەشی رادەگەیێنم .
**تیپەکە** : دەم خۆش‌کریۆن ، هەر خۆت دەزانی چۆن ئێمەو مردووانیش بەرێوە بەرێت
**کریۆن** : فرمانەکانم جێبەجێ‌بکەن
**تیپەکە** : بە پیاوەکانتی بسپێرە
**کریۆن** : پاسەوانەکان چاودێری لەشەکە دەکەن
**تیپەکە** : کەواتە دەبێ چی‌بکەین
**کریۆن** : نابێ بە هیچ جۆرێ لە لەیاسالادان چاوبپۆشن
**تیپەکە** : تۆ بلێی کەس هەبێت ئەوەندە شێت بێ‌و مل لە چەقۆ بسوێت‌و بۆ مەرگی خۆی بگەرێ
**کریۆن** : مردن چاوەرێی دەکات ، بەلام لەگەڵ ئەوەشا زۆر جار پارە پەرستی خەڵکی شێت دەکا
**پاسەوان** : «دێتە ژوورەوە ، کرنوش دەباو دەس بە قسەکردن دەکات» .
ناتوانم بڵێم تاگەیشتمە لات بالم گرتبووە ، نەخێر ، چونکە جاروبار لە رێ پشوویەکم دەدا . . بە خۆم دەگوت ، مەرۆ . . مەرۆ . . بەلام لەگەڵ ئەوەشا ئەگەر کریۆن ئەم هەواڵەی لە یەکێکی دیکەوە پێ بگا ، ئەوا مەترسیەکە گەورەتر دەبێت . . رێگاکە کورتە ، بەلام بۆ من زۆر درێژبوو ، بە کورتی ئەوەتام . . بە کورتی ، هیچ جۆرە هەواڵێکی خۆشم پێ‌نیە .
**کریۆن** : ئەوە شێت بوویت ؟
**پاسەوان** : پێشتر ئەوەی پەیوەندیی بە خۆمەوەیە دەڵێم ، هەڵەی منەو ناشزانم هەڵەی کێ‌یە ، خواش هەڵناگرێ سزام‌بدەی .
**کریۆن** : ئەم گەرەلاوژی‌یەت لەچی ؟ بۆچی بێ‌پیچ‌وپەنا قسەم بۆ ناکەی ، لەوە دەچێ دەتەوێ بەم راوە رێویە هەواڵێکی خراپم پێ رابگەیێنی .
**پاسەوان** : مەترسیەکە جەرگبرە ، دەست‌و ئەژنۆی پیاو دەشکێنێ .
**کریۆن** : قسە بکە
**پاسەوان** : باشە قسەدەکەم ، مردوەکە نێژرا
**کریۆن** : ها . . کێ وێرای ئەمە بکا ؟
**پاسەوان** : نە کەس بینی‌و نە کەسیش دەزانێ کێ‌یە ، تەنانەت شۆێنەواری پاچێ یاخاکەنازێکیشی بەجێ نەهێشتوە ، نە جێ پێی مرۆڤ ، نە جێ تایەی عەرەبانە ، هیچ شتێ نیە تاوانبارەکەمان بۆ دەس نیشان‌بکا . لەگەڵ یەکەم گزنگی خۆرا تەرمەکە ئەوەندەی خۆڵ بەسەردا درابوو کە کەس نەتوانێ دەری بهێنێتەوە ، هەر یەکێك لە ئێمە ئەوی دیکەی تاوانبار دەکردو خەریك‌بو بێ بە شەر لە ناو خۆمانا ، هەموو پاسەوانەکان جێی گومانن ، بەلام هیچ بەڵگەیێکیشمان بەدەستەوە نیە بەرامبەر بە کەس . سۆێندمان خوارد ، بە سەر پشکۆدا هەنگاو هەڵبهێنینەوە و ئاسنی سوورەوە کراو بگرین بە دەستەوە تاکو تاوانبارەکان‌و ئەوانەی یارمەتیشیان داون

دەدۆزینەوە ، لە دواییشدا بڕیارماندا هەموو شتێ بە جەنابت ڕابگەیینین . ناو نووسیانکرد و ناوی من دەرچوو .
**تیپەکە** : تۆ بڵێیت ئەمە ئیشی خواوەندەکان نەبێت ؟
**کریۆن** : بەسە پیرە مێردە گەوجە ، خواوەندەکان ئەو کەسانە نانێژن کە پەرستگاکان دەسووتێنن‌و داب‌و دەستوور تێك دەدەن‌و قوربانیەکان دەدزن . قەت خواوەندەکانت دیوە حەز بە خراپە بکەن ؟ نەخێر . . هەزار جار نەخێر ، بەڵام ئەم کارە چاومی کردەوە ، بیستبووم لەم شارەدا چەن خائنێك هەن دژی دەسەڵاتی من پرتەو بۆڵەیانە ، تیاشیانە هەیە بەدزی‌یەوە خەریکی یاخی‌بوونن ، دەبێ ئەم تاوانەیان پێ‌بێژێرم ، مرۆڤ بێ‌چارە پارەی داهێنا ، پارەی چەپەڵ ، ئەو پارەیەی شار وێران دەکاو دڵە پاکەکان دەرەنجێنێ‌و ڕەوشتی کۆمەڵ تێك دەدا . ئەوانەی پارە لە ڕێی دەرکردون‌و بۆلینیسیان ناشتوە گۆڕی خۆیانیشیان هەڵکەندوە ، ئەگەر ئەوانەم بۆ نەدۆزنەوە ئێوە هەڵدەواسم ، دەبێ ئەو تاوانبارانەم بۆ بدۆزنەوە .
**پاسەوان** : بە هەرحاڵ من تاوانبارنیم
**کریۆن** : ئەمەم بەلاوە سەیرنیە ، کابرا تۆ خۆت هەراج‌و هەرزان فرۆش‌کردوە
**پاسەوان** : زۆر دڵگرانم بەوەی میرێکی دادپەروەری وەکو تۆ بەم شێوە نالەبارەو هەڵەیە شت هەڵبسەنگێنێ .
**کریۆن** : چاوچاو ، بە خوا سەیرە ، جەنابی ڕەفتاروگفتاری من هەڵدەسەنگێنێ .
**پاسەوان** : ئومێد دەکەم تاوانبارەکان بدۆزینەوە «دەچێتە دەرەوە و کریۆنیش بە دوایا»
**تیپەکە** : مرۆڤ خولقندەیێکی تاکە ، سواری شەپۆلی دەریا دەبێ ، کاردەکا ، باڵندەکان‌و ماسی ڕاو دەکا ، حەیوانە کێوی ڕادێنێ ، بیر دەکاتەوە ، قسە دەکا . . مرۆڤ یاسا دادەهێنێ ، خۆی دەنێژێ ، ماڵەکەی دادەپۆشێ‌و لە نەخۆشی خۆی دەدزێتەوە . . مەرگ تاکە نەخۆشی‌یێکە دەسەڵاتی مرۆڤی بەسەردا ناشکێ . چاکە . . و خراپە دەکات ، کاتێ کە مل بۆ یاساکانی ئاسیان‌و زەوی کەچ دەکات مرۆڤێکی خانەدان‌و نەجیب زادەیە ، بەڵام کە سەر پێچییان تێدا دەکات دەگۆڕێ‌و بەو جۆرە نامێنێ . هیچ جۆرە تاوانبارێك لە دڵی مندا جێ‌ی نابێتەوە . .
ئەی خواوەندەکان ، چ موعجیزەیێکی سەیرە ، کەس باوەڕ ناکات بەڵام ڕاستەو وەهایشە .
تۆ بڵێیت ئەنتیگۆنا نەبێت ؟ ئەنتیگۆنا تۆیت یاخی بویت ؟ تۆشێت بوویت تا بەم جۆرە بە دوای مەرگی خۆتا بگەڕێیت .
«لە پێشدا ئەنتیگۆنا لە پەردەی لای ڕاستەوە دێتە ژوورەوە و پاسەوانێك شانی گرتوە ، دوابی پاسەوانەکەش دەردەکەوێ»
**پاسەوان** : بە تاوانەکەیەوە گرتمان . کریۆن لە کوێ‌یە ؟
**پاسەوان** : ئەوەتا هات
**کریۆن** : چی‌بووە ؟
**پاسەوان** : میرم ، بەختی جەختم بەرەو ئەو شوێنەی بردم کە قەت بە خەیاڵمدا نە دەهات پێ‌ی تێ‌بنێم لەم کچە بپرسە . ئەمەیە تاوانبار .
**کریۆن** : لە کوێ‌و چۆن گرتت ؟
**پاسەوان** : ئەمە بوو مردوەکەی دەناشت . لە کاتی ناشتنیا گرتم .
**کریۆن** : سوێند دەخوێت
**پاسەوان** : بەڵێ سوێندی لەسەر دەخۆم ، ئەم بوو مردوەکەی دەناشت
**کریۆن** : دەبزانم بۆم بگێڕەوە
**پاسەوان** : لە ترسی هەرەشەکانی جەنابت چوین لەشە بۆگەنەکەی مردوەکەمان لە گۆڕ دەرهێناو بە ڕووتی لەسەر زەویەکە فڕێماندا ، پاشان چووینە سەر گردێکی بەرز تا لە بۆگەنی لەشەکە دوور کەوینەوە ، قسەوگاڵتەوگەپیشمان لەگەڵ یەکدی دەکرد تا خەومان لێ‌نەکەوێ ، لە پڕ ، نیوەڕۆبوو . ئەوەندەمان زانی تەپ‌و تۆزێکی زۆر بەرزبوەوەو دارو درەختە بچکۆلەکانی لەچاو ون‌کردین ، پاش ڕەوینەوەی تەپ وتۆزەکە ئەم کچەمان لای تەرمەکەوە بینی ، خەریك‌بوو بە هەموو هێزێکیەوە خوڵی بەسەر مردوەکەدا دەکرد ، لە دوایی مەسینەیێکی دەرهێناو گۆڕەکەی ئاوپرژێن‌کرد . . یەکسەر دامان بە سەریاو گرتمان ، هەرکە لێمان پرسی بێ ئەوەی نکوولی لێ‌بکا دانی بە هەموو شتێکدانا ، پێم خۆش‌نیە کەس لە جیاتی خۆم تووش بکەم ، بەڵام تاوانبار هەر تاوانبارە ، سەرەڕای

ئەوەش ئافرەتە . **لەبەر ئەوە** کارێکی رەوایە خۆم رزگار بکەم ،
وانیە ؟
**کریۆن** : ئەی تۆ . . **هەر سەرکزی** دڵ وریا . دان بە تاوانەکەتا
دەنێیت ؟ ئینکاری ناکەیت ؟
**ئەنتیگۆنا** : من وامکرد . ئەوا خۆم دەیڵێم .
**کریۆن** : «بە پاسەوانەکە» تۆ برۆ ، خۆت لە هەڵواسین رزگارکرد
برۆ رزگاربویت .
«بە ئەنتیگۆنا» دەشتزانی من ئەم ئیشەم قەدەغە کردوە .
**ئەنتیگۆنا** : بەڵێ هەموو کەس دەیزانی ، چونکە بە هەموان
راگەیەندرابوو .
**کریۆن** : لە گەڵ ئەوەشدا گوێت نەدایە فرمانەکەم .
**ئەنتیگۆنا** : ئەم قەدەغەکردنە لە جۆبیتەرەوە دەرنەچوە ،
دادیش ئەم جۆرە یاسایانە بەسەر کەسدا ناسەپێنێ ، هیچ کاتێ
ئەوەم بە بیردا نەدەهات یاسای تۆ ، کە ئەنجامی هەڵچوونی
مرۆڤێکی فانیە پێش یاسا نەمرەکان بکەوێ با تۆماریش
نەکرابن . ئەم یاسایانە هی ئەمڕۆو دوێنێ نین ، ئەمانە هەر
بوون و هەر دەشبن بێ ئەوەی کەس بزانێ کەی دانراون . کە
واتە چۆن رەوای هەقە بە هۆی ویستی تاقە کەسێکەوە لە
خواوەندەکانم یاخی بم ؟
باشم دەزانی ئەنجامی ئەم ئیشەی من مەرگە بەڵام ئای کە لە تاف
لاویدا مردنم لاجوانە . . دەتەوێ براکەم بێ گۆڕ بهێڵمەوەو
تاماوم ویژدانم ئازارم بدات . مادام ئەوەمکرد ئیتر هیچی دیم
لامەبەست نیە ، ئیستەش خۆت شێتی ئەگەر لەسەر ئەمە بە من
بڵێی شێت .
**تیپەکە** : کەللە رەقە ، کچی باوکی خۆیەتی ، کچی ئۆدیبە ،
لە تەنگانەدا عیناد و کەللەرەقە .
**کریۆن** : بەڵام ئەوەشتان لەبیر نەچێت ، ئەم جۆرە کەسانە زوو
لە ناو دەچن ، ئاسن تارەق بێ زووتر دەشکێ ، هەر جڵەوی
بچووکیشە ئەسپی سەرکێش لغاو دەکات . . بە دەستی
ئەنقەست ئیهانەم دەکات ، گاڵتە بە من و شانازی بە خۆیەوە
**دەکات** . ئەگەر وازی لێ بێنم ئەو دەبێت بە پیاوو من بە ژن
هەرچەندە من برای جۆکاستم . بەڵام نابێ نە خۆی
خوشکەکەی لە سزا دەربازبن . دەبێ ئیسمیناش دەستی نە
ئیشەدا هەبێ ، من واتێدەگەم دەستی ئەویشی تێدایە . برۆ
بۆمی بدۆزنەوە ، پێش نەختێك لە کۆشکدا بینیم . ئەوەند
شڵەژابوو دەتگوت شەمشەمە کوێرەیە . ئەم جۆرە کەسا
خۆیان خۆیان ئاشکرا دەکەن . بەڵام ئەوەی لەم بارەیەوە زور
پێ ناخۆشەو رقم لێی هەڵدەسێ ئەوەیە کە تاوانبار . لە گە
ئەوەی بەسەر تاوانەکەیەوە گیراوە ، خەریکە ئەو کا
ناپەسەندەیم بۆ دەرازێنێتەوە .
**ئەنتیگۆنا** : لە مردنم زیاتر چیت دەوێ ؟
**کریۆن** : هیچ
«ئەنتیگۆنا و کریۆن ئەوەندە لە یەك نزیك دەبنەوە خەریکە
ناوچەوانیان لە یەك بدا» .
**ئەنتیگۆنا** : ئیتر ئەم درێژدادرییە بۆ ، نە من تۆم خۆش دەوێ
تۆ منت خۆش دەوێ ، ئەم هەموو خەڵکەش کە بە با
چاوتەوەن و چەپڵەت بۆ لێدەدەن ، ئەگەر ترس لاڵی نەکردنا
چەپڵەیان بۆ من لێدەدا ، بەڵام زوڵم و زۆرداری ئەوەش
هەیەکە حەزی لە هەر شتێك بێت بیکات و دڵی بەهەر چیەکە
بێت بیبیسێ .
**کریۆن** : لە هەموو سیبەدا تەنها تۆ بە شێوەیێکی چەوت
دەکەیتەوە .
**ئەنتیگۆنا** : کەواتە هەموو کەس بە شێوەیێکی چەوت
دەکەنەوە ، بەڵام کە تۆ دێیت بێدەنگ دەبن .
**کریۆن** : ئەرێ لەو ئیشەی خۆت تەریق نابیتەوە
**ئەنتیگۆنا** : لە چی تەریق ببمەوە ، لەوەی شەرەف و حورمە
براکەم پاراستوە ؟
**کریۆن** : ئەی ئیتۆکل ، ئەویش هەر برات نیە ؟ پیاوانە
ناوماناو لە پێناو ئێمەدا مرد
**ئەنتیگۆنا** : هەموومان لە یەك باوك و یەك دایك بووین .

**کریۆن** : کەواتە بۆ جنێو بە براکەت دەدەیت ، بۆ کاری وادەکەیت دژی بەرژەوەندی نیشتمانەکەت بێ ؟
**ئەنتیگۆنا** : بەڵام مردوو وەك تۆ حوکم نادات !
**کریۆن** : چی ؟ کەواتە خزمەتی خائینەکەت دەکرد
**ئەنتیگۆنا** : وەك برایێك مرد نەك دوژمن
**کریۆن** : بەڵام ئەویان هێرشی هێنایە سەر نیشتمانەکەی‌و ئەمیان پارێزگاری لە نیشتمان دەکرد .
**ئەنتیگۆنا** : مردن یەك یاسا بە سەر هەردوکیان دەسەپێنێ
**کریۆن** : بەڵام نابێ تاوانبار و بێ تاوان بە یەك چاو تەماشا بکرێن .
**ئەنتیگۆنا** : کێ دەڵێ ئەم سنوورو یاسایانەی تۆ دایدەنێیت هیچ بایەخێکیان لای مردووان هەیە ؟
**کریۆن** : دوژمنی مردوو قەت نابێ بە دۆست
**ئەنتیگۆنا** : من بۆ خۆشەویستی خوڵقێنراوم نەك رق و کینە
**کریۆن** : کەواتە بچۆرە جیهانی مردوانەوە و بە هەوەسی خۆت خۆشەویستیەکەت بە کێی پێشکەش دەکەی بیکە ، بەڵام تا من مابێتم ناهێڵم ئافرەت یاسا دابنێ .
**تیپەکە** : ئەوە ئیسمینای بەسزمانە ، فرمێسك گۆناکانی تەڕ کردوەو خەفەت روخساری هەڵبزرکاندوە
**کریۆن** : ئاە ! مارەسیس هاتی ، دەی قسە بکە ، بزانم ئاگات لەم پێشێل کردنەی یاساو هەیبەتەی من هەیە یان‌نەء ؟
**ئیسمینا** : ئەگەر خوشکەکەم دانی پێدا نابێت ئەوا منیش لەگەڵیام‌و ئامادەم بۆ هەموو شتێ .
**ئەنتیگۆنا** : دادگا رێی ئەوەت نادات ، تۆ هەقت چیە بە سەر منەوەو خۆت بۆ تووش ئەکەیت ، من ئەم ئیشەم بە تەنها کردوە .
**ئیسمینا** : خوشکەگیان ، من دەمەوێ لەگەڵتدا بم
**ئەنتیگۆنا** : تازە کار لە کار ترازا و لە دەس دەرچوو ئیسمینا ، دۆزەخ و دانیشتوانی منیان بە چاوی خۆیان بینی ، بە تەنها منیان بینی ، چی‌دی خۆشەویستی سەرزاری خوشکم بەلاوە مەبەست‌نیە .
**ئیسمینا** : بێبەشم مەکە لە شەرەفی مردن لە گەڵتا ، شەرەفی ناشتنی براکانم لێ مەسێنەوە
**ئەنتیگۆنا** : خوشکە بچکۆلەکەم ، نە لەگەڵمدا بمرەو نە شانازیشی پێوە بکە ، مردنی من بە تەنها بەسە .
**ئیسمینا** : بەڵام چۆن دەتوانم بێ تۆ ژیانم خۆش‌بوێ
**ئەنتیگۆنا** : ئەمەیان لە کریۆن داوابکە ، ئەی تۆ یەکێك نیت لە دەس‌و پێوەندە دڵسۆزەکانی .
**ئیسمینا** : بۆ ئەوەندە حەز بە بریندار کردنم دەکەیت .
**ئەنتیگۆنا** : من پێکەنینم پێت‌دێت ، پێکەنینێکی ساردو سڕی بێزەوق .
**ئیسمینا** : چۆن بتوانم خزمەتێکت بکەم
**ئەنتیگۆنا** : ژیانی خۆت رزگارکە ، منیش قەت بەغیلی بەو بەشەت نابەم
**ئیسمینا** : وازم لێبێنە هاوبەشی چارەنووسەکەت بکەم
**ئەنتیگۆنا** : تۆ ژیانت هەڵبژارد ، منیش مەرگ
**ئیسمینا** : تاتوانیم ئامۆژگاریم کردی
**ئەنتیگۆنا** : ئامۆژگاریەکانت باش‌بوون ، بەڵام پرۆژەکەی خۆم بە باشترزانی
**ئیسمینا** : بەڵام هەڵەی تۆ هەڵەی هەموومانە
**ئەنتیگۆنا** : دڵنیابە ، تۆ دەژیت ، منیش زۆر لە مێژەوە دڵم مردوە ، بە کەڵکی مردوان نەبێ بە کەڵکی هیچی دی نایەت .
**کریۆن** : لەوە دەچێ ئەم دوو کچە شێت‌بووبن
**ئیسمینا** : ئەوەی لە ئێمە قەوماوە عەقڵی لە سەرماندا نەهێشتوە .
**کریۆن** : کە بتەوێ لە گەڵ تاوانبارانا هاوبەش‌بی‌و وەك ئەوان سزابدرێی ، بێگومان دەبێ بەشێت دابنرێیت .
**ئیسمینا** : چۆن داوام لیدەکەی بێ ئەنتیگۆنا بژیم
**کریۆن** : چیتر باسی ئەنتیگۆنا مەکە ، ئەو مردوە
**ئیسمینا** : چۆن ! دەزگیرانی کورەکەت ئەکوژی !

**کریۆن :** کچی دیکە زۆرن
**ئیسمینا :** بەلام ئەو تەنها دلی بە ئەنتیگۆنادا چووە
**کریۆن :** قەت رازی نابم تاوانباری بێ بە ژنی کورەکەم
**ئەنتیگۆنا :** ئۆه . . هیمۆن گیان . باوکت دەیەوێ چیت لێ بکا
**کریۆن :** بەسیەتی ، من بەو باسە پەست و بێزار دەبم
**تیپەکە :** چۆن دەتوانی کورەکەت لە دلخوازەکەی بکەیت
**کریۆن :** مردن ئەو ئەڤینە لەناو دەبا
**ئیسمینا :** کەواتە هەر دەبێ بمرێ
**کریۆن :** بێگومان ، کاتێکی زۆریشمان بە فیڕۆدا . پاسەوانەکان ، ئەم دوو ئافرەتە بگرن . ئازا ئەو کەسەیە کە مەرگ بەرەو پیری دێت خۆی لێدەرباز کات .

«دەچنە دەرەوە»

**تیپەکە :** بێتاوانان بە ختیارن . قەدەر بە هەوەسی خۆی یاری بەم خێزانەکرد . سەرباری کۆست و موسیبەتە کۆنەکانیان کۆستی نوێیش چاوەڕێیان دەکات . خوایێك بێ ماندووبوون راویان دەنێت . جۆبیتەری هەمیشە لاو لەسەر لوتکەی ئۆلیمپ دانیشتویت و قەت چاو لێك نانێیت . دەبلێ بزانم بۆ دەبێ رەگەزی مرۆڤ لە گەلْ خۆشیدا ناخۆشیی بێتەرێ و بۆ ناتوانێ لە کارەسات خۆی رزگاربکات . لە بەر چیە خێرو شەر جێگۆرکێ دەکەن کە خواوەندێك بەرەو نەمانمان دەبات و لەجێی خۆیاندا نامێنن . . بەلام ئەوە هیمۆنە . . بلێیت بۆ شکات و سکالا هاتبێ
**کریۆن :** رۆلە تۆ تاوانەکەو حوکمەکەی من دەزانی ، ئیتر بۆ هاتویت ، ئایا دەتەوێ لێمان یاخیبیت یان هێشتا وەکو جاران ئێمەت خۆش دەوێ .
**هیمۆن :** من ملکەچی فرمانتم ، هیچ ژن و ژنخوازیەك ناتوانێ لە رێی ئامۆژگاریە ژیرانەکانتا بوەستێ .
**کریۆن :** دەمخۆش ، کور دەبێ لە قسەی باوکی دەرنەچێ ، ئەگەر فرزەند وانەبێ بۆچی باشە .
دەبێ دۆستی خۆمانمان خۆش بوێ و تا لە تواناشمانا بێت ئازاری دوژمنانمان بدەین . . پیاو ئەگەر ژنێکی هێناو هاوتای خۆی نەبو ئەوا لە باخەلیاوشك دەبێتەوە . **بۆیە پێت دەلێم** واز لەم ئافرە بێنە با لە دۆزەخا پیاوێك بۆ خۆی بدۆزێتەوە .
خانم دانیشتوە باسی یاساکانی جۆبیتەر . یاساکانی خوێنم دەکا ! بەسە . . جا من ئەگەر کەس وکارم لێم یاخیبن و د لێیان نەپێشێ . دەبێ لەگەلْ سیبیەکانا چۆنبم ؟ یان دە لەگەلْ هەمواندا توندو تیژی بنوێنم یان‌نەء . هەرگیز بەوانە هەلنالێم کە روو بە رووم دەبنەوە . هیچ برینێك لە بەرەلا بێ پەروایی کاریگەرترنیە . چونکە شار وێران دەکەن و خۆش خێزان تێك دەدەن و سەربازەکان لە خشتە دەبەن . جا ئەگ ئەو بەرەلایە ئافرەت بێت ئەوە خراپتر . . رەنگە لە گەلْ پیا مرۆڤ بتوانێ بەهانەیێك بۆ پاشگەز بوونەوە بدۆزێتەوە . بەلا قەت رێ ی ئەوە نادەم بلێن جلەوی خۆی داوەتە دە ئافرەتان .
**تیپەکە :** پاشام . ئەگەر پیری عەقل و هۆشمی تێك نەدا واتێدەگەم قسەکانت زۆر ژیری و پەندی بەرزی تێدایە
**هیمۆن :** باوکە تۆ زۆر عاقل وژیری ، بەلام من لە ناو میلل دەژیم و گوێم لە گشت قسەو چپەکانیەتی . باوکە تۆ گەل تۆقاندوە . لە ترسی تۆ ووشەکانی پێش ئەوەی لە زاری بێتە د قووتی دەدانەوە . بەلام من گوێم لێ ی دەبێ چونکە من هەموو لایێك دەچم و گوێم لە هەموو جۆرە قسەو قسە لۆکێ دەزانم سیبە چ جۆرە حوکمێکی بە سەر ئەم کچە خانەدا نەجیب زادەیەدا داوە کە تۆ بە تاوانبار لە قەلەمی دەدە «چی ! هەر لەبەر ئەوەی براکەی ناشتوە دەیکوژن ؟ پێچەوانەوە دەبێ پاداشی بدرێتی» ئەمەیە بیرورای ر خەلکەکە . بۆ خۆم ، لە هەموو شتێ زیاتر رێزی دەسەلاتت دەگرم ، بەلام باوکەگیان نابێ هەموو کاتێ واب هەر خۆت راست دەکەیت و لە سەر هەقیت . چونکە ئەو وابزانێ کە لە خۆی بەولاوە کەس عاقل و ژیرو بە هێزنیە دە مایەی گالتە جاری هەمووکەس ، عەقل دەبێتە هۆی جیاوا

بڕوا . ئەو کەشتیوانەی بە توندی چارۆکەی کەشتیەکەی دەگرێ زووتر وەردەگەڕێ . چارۆکەکەت نزم ڕاگرە . گوێ بگرەو هێور بەرەوە . دەبێ باوەڕت بە قسەکانم هەبێ . هەرچەندە من هێشتا لاوم بەڵام چاکیش دەزانم کە بەرگری لە مەسەلەیێکی دادپەروەرانە دەکەم .

**تیپەکە** : پاشا . ئەگەر ڕاست دەکا گوێی لێبگرە . ئەگەر هەڵەش بوو دەبێ ئەو گوێ بۆ تۆ شل کا . چونکە لە هەردوو بەرەکەدا مەسەلەکە بە دەس پیاوی ژیرو عاقڵەوەیە .

**کریۆن** : چی ؟ چی ؟ دەتانەوێ لە منداڵێکەوە فێری عەقڵ و دادپەروەری بم ؟

**هیمۆن** : ئەمیش زوڵمێکی دیکە ! تەماشای کردەوەکانم بکە نەك تەمەنم .

**کریۆن** : کەواتە پیاهەڵدانی پیاو خراپان و ئاشووبگێڕان کارێکی باشە

**هیمۆن** : بە هیچ جۆرێ مەدحی پیاو خراپان ناکەم

**کریۆن** : ئەی ئەم خراپ نیە؟ ئەی خراپە وەك نەخۆشی بەدەمارەکانیا هات و چۆ ناکات ؟

**هیمۆن** : میللەت وا ناڵێن

**کریۆن** : جوانە ! کەواتە دەبێ میللەت ڕێ نیشاندەرم بێ

**هیمۆن** : ئەها ئەوەتا تۆش وەك لاوێك قسە دەکەی ، وابزانم خۆشت هەستی پێدەکەی

**کریۆن** : بۆ ! بەرای تۆ دەبێ ئەم شارە بە ڕێڕەوێکی جیا لە ڕێرەوی ژیانی خۆمیا ببەم ؟

**هیمۆن** : شار نیە بۆ تەنها کەسێك دروست کرابێ

**کریۆن** : شار ژنی شەرعیی سەرۆکەکەیەتی

**هیمۆن** : باشە ، ئەگەر دەتەوێ بە تەنها خۆت حوکم بکەیت دەبێ لە شارێکی چۆڵ و خاپووردا بژیت

**کریۆن** : وابزانم پشتی کچەکە دەگری

**هیمۆن** : کەواتە ئەو کچە تۆیت ، چونکە لە تۆ بەولاوە ، هیچی دیم مەبەست نیە

**کریۆن** : بێحورمەت ، ئیهانەی باوکت دەکەی !

**هیمۆن** : چونکە باوکم زۆردارە

**کریۆن** : هەر لەبەر ئەوەی دەمەوێ بەڵێنەکەم بەرمەسەر بۆیە بە زۆردارم دەزانی ؟

**هیمۆن** : بەڵێنەکەت بەریتە سەر !! ئەی نازانی کەویستی خواوەندەکان ژێر پێ دەخەی ؟

**کریۆن** : هەی خوێڕیی سەر ژنانی ، دەتەوێ لە پێناو ئافرەتێکدا لە ڕاستی لابدەیت .

**هیمۆن** : ڕەنگە وابێ ، بەڵام بە هەرحاڵ ، ئەگەر لە مەحکەمەیێکی نارەوا ڕازی نەبم مانای ئەوەنیە لە ڕێی ڕاست لامدابێ .

**کریۆن** : تۆ ئەم هەموو بەرگریەت لەبەر خاتری ئەوە

**هیمۆن** : لەبەر خاتری تۆشە ، لەبەر خاتری خۆم و خواوەندەکانی دۆزەخیشە

**کریۆن** : ناهێڵم بە زیندوویەتی بیهێنی

**هیمۆن** : کەواتە لە دۆزەخدا و بە مردوویی ئەیهێنم

**کریۆن** : هەڕەشەی خۆ کوشتنم لێدەکەی ؟

**هیمۆن** : هەڕەشەی هیچت لێناکەم ، تەنها دەمەوێ ڕێی زۆرداریت لێبگرم

**کریۆن** : دوایی هەر پەشیمانیت بۆ دەمێنێتەوە

**هیمۆن** : ئەگەر کورت نەبوومایە دەمگوت تۆ . .

**کریۆن** : ئاگات لە دەمت بێ سەرژنانی ، بە قسەی پروپووچ تووڕەم مەکە .

**هیمۆن** : تۆ لە خۆت بەولاوە گوێ لە قسەی کەس ناگری

**کریۆن** : ئاه ! کەواتە وایە . . سەربازەکان ئەو شێتەم بۆ بێنن با بەبەرچاوی دەزگیرانەکەیەوە بمرێ

**هیمۆن** : تۆ هەڵەیت ، قەت مردنی ئەو بە چاو نابینم ، ئەم تووڕەییەشت بۆ ئەو دەس و پێوەندانە دەربڕە کە لێتی قبووڵ دەکەن .

**تیپەکە** : ئەوە بەڕاکردن ڕۆیشت ، تەواو تێکچوە ، دەترسی

شتێك لە خۆی بکا

**کریۆن** : چی دەکات بابیکات ، هیچ شتێ ئەم دوو تاوانبارە رزگار ناکات

**تیپەکە** : چیە ! بۆ نیازت وایە ئیسمیناش لە گەڵ ئەنتیگۆنادا بکوژی

**کریۆن** : نەء ، قسەکەت راستە ، ئیسمینا هیچی نەکردوە چاکت کرد ئاگادارت کردمەوە

**تیپەکە** : چ جۆرە مردنێکت بۆ ئەوی دی هەڵبژاردوە

**کریۆن** : لە ئەشکەوتێکی ناو جەرگەی بیاباندا حەپسی دەکەم ، هەر ئەوەندە خۆراکی دەدەمێ نەمرێ بۆ ئەوەی تاماوە کەفارەتی تاوانەکانی بداتەوەو نوێژ بۆ پلۆتۆن بکات ، جا ئەوسا باخواوەندەکانی دۆزەخ فریای کەون .

**تیپەکە** : ئەی خۆشەویستی ، تۆ لە دڵی هەموو کەسێکدا جێی خۆت دەکەیتەوە ، هەژار دەوڵەمەند دەکەیت‌و دەوڵەمەند هەژار ، گۆنای کچان سوور هەڵدەگەڕێنی ، بە دەریاکانا دەپەڕیتەوەو سەر بە کۆلیتەکانا دەکەیت . ئەی خۆشەویستی ، کەس ناتوانێ لە داوی تۆ دەرباز بێت ، نە خواوەندە نەمرەکان‌و نە مرۆڤە تەمەن کورتەکان . . کە ڤینۆس حەزی لە شتێك کرد رێی لێ‌مەگرە ، لەم ساتەدا کە ئەنتیگۆنا بەرەو گۆڕ هەنگاو هەڵدەهێنێتەوە ، دەگریم‌و هەست دەکەم هیچ دڵسۆزیەکم لە دڵدا بەرامبەر بە میرەکەم نەماوە

«لە لای راستەوە ئەنتیگۆنا لە نێوان دوو پاسەوانا دەردەکەوێ . دەوەستێ»

**ئەنتیگۆنا** : هاونیشتمانیان ، تەماشام بکەن ، ئەوا دوا گەشتم دەس پێدەکەم ، بۆ دواجار تەماشای تیشکی خۆر دەکەم ، پێش ئەوەی تامی ماڵ‌و مێردی بچێژم‌و گۆرانی‌و هەڵپەرکێی شایەکەم ببینم ، واخوای دۆزەخ بە زیندویی راپێچم دەکا

**تیپەکە** : کەواتە دەمری . . بێ‌ئەوەی نەخۆش بی یا بریندار . سەربەست ، بە کچی‌و زیندویی ، بە ناوبانگ دەمری ، تۆ . . تەنها تۆ . . بێ لەم هەموو بەشەرە تەمەن کورتانە دەچیتەلای پلۆتۆن .

**ئەنتیگۆنا** : کاتێ خۆی باسی مردنی تانتالم بیستبوو . کاتێ بەسەر لوتکەی سیبیلەوە دەبێ ، لە پڕ هەست دەکات کە تاوێرەکە وەك رووەکە هەڵواسراوەکان توند دەیگرن‌و لە دەوری سەوز دەبن . . ئەوەتا بەفر دایدەپۆشێ‌و فرمێسکە ساردو سڕەکانی لە سەرەوە دەکەوێتە خوارەوە ، ئائەوێیە جێی من‌و ئەو خۆشی‌و دەسبازییەش چاوەڕێم دەکات .

**تیپەکە** : هێی ، هێی ، بەڵام ئێمە بنیادەمین ، بێچارەین . ئەویش خواو کچی خوابوو ، بە هەر حاڵ تۆ کە یەکێکی لە مرۆڤە سادەو تەمەن کورتەکان ، ئەوەت بەسە کە چارەنووست وەك چارەنووسی خواوەندەکان بێت .

«دەوەستێ»

**ئەنتیگۆنا** : گاڵتەم پێ‌بکەن ، ئەمە باشترین هەلە ، بروام پێ بکەن من خێرو خۆشیی ئێوەم دەوێ . باهیچ نەبایە من بڕۆشتبام ئەوسا چی‌یان دەکرد بابیکەن . ئاهـ ، سیبە ، ئاهـ شارەجوان و قەشەنگەکەم ، تەماشاکە چۆن گاڵتەم پێدەکەن‌و بەرەو جێگایێکی بێ‌ناوو نەزانراوم دەبەن ، بەڵێ بێ‌ناو چونکە نە لە گەڵ مرۆڤ نە لە گەڵ تاپۆ ، نە لە گەڵ مردووان‌و نە لەگەڵ زیندوانا نارۆم .

**تیپەکە** : خەتای خۆتە ، بۆ سەرپێچی لە دادو یاسا دەکەی ؟ بێ لەوەش ، تۆ تاوانەکەی ئۆدیبیش دەبژێری .

**ئەنتیگۆنا** : من کچی تاوانم ، بۆیە دەمرم

**تیپەکە** : مردو پەرستی شتێکی جوانە ، بەڵام یاخی‌بوون لە فرمانی ئاغاکانمان جوان‌نیە ، زۆر لە خۆت بایی‌بویت بۆیە بەم رۆژە گەیشتیت

**ئەنتیگۆنا** : نەهیچم دەوێ‌و نەکەس ، بە تەنها ، بێ ئەوەی کەس لە گەڵ خۆمدا ئازاربدەم ، بێ مێرد ، بێ‌هاورێ . بێ‌یارمەتی ، هەنگاو بەرەو ئازار دەنێم . چیتر ، نە رۆژ و نە چاوە زێڕینەکەی‌و نە تیشکی خۆریش دەبینم .

**کریۆن** : پێشتر گوتم ، ئەگەر هەر کەسێ بمرێ لە کاتی مردندا

پێویستی بەم گشتە شیعرو چیرۆکەبێ ، بە هیچ جۆرێ ئیشیان بۆ ناکرێ

**تۆب** : **هەر ئیستە بیبەو لە بەندیخانەی قایم کەنو بەجیی بێلن .**

«**بە بزوونتەوەیەکی ناکاوی ئەنتیگۆنا رمی دەستی پاسەوانی لای راست بەر دەبێتەوە بەردەم ئەنتیگۆنا ، پاسەوانی لای چەپ سەرێکی دەگرێو ئەنتیگۆناش توند دەستی لیقایم دەکات ، ئیتر وەك بلێیت لە نێوان دوو قازیو لە دادگادابێت دێتە پێش چاو**»

**ئەنتیگۆنا** : **خواحافیز ، با بەشەکەی من لە ژیانا بدزرێ ، دەرۆم باوکم و دایکمو ئیتۆکل دەبینم . کە ئێوە مردن ، من ئێوەم شتو چاوم داخستن . سەر خۆشم بووم چاوەکانی «بۆلینیس»م داخست ، ناهەقیشم نەبوو ، ئەمەی من کردم رەنگە لە گەڵ مێرد و منداڵدا نەکرێ ، چونکە دەشێ یەکێکی دیکە جیی مێرد بگرێتەوە ، منداڵیش بمرێ یەکێکی دی دەخولقێتەوە ، بەلام کە باوكو دایکمان مردبن براو خوشکی تازە لە کوێ بینم ؟ ئەوەی من کردم لە بەر رۆشنایی ئەم بروایەدابوو ، هەر لە پیناو ئەمەشدا لێم دەدەنو کریۆنیش لە ماڵو مێردو منداڵم دەکات .**

**دەبێ چیم لە خواوەندەکان کردبێ تا بەم جۆرە پشتم تێبکەن ؟ ئەگەر کردووەی ئەم جەلادانەیان لاپەسەند بێ ، ئەوا سبەی دەیزانمو لە کردەوەی خۆم پەشیمان دەبمەوە ، بەلام ئەگەر بە دڵیان نەبێ ، با ئەوانیش وەك من کۆست کەوتووبنو بە دەم ئازارەوە بناڵن .**

**تیپەکە** : **دەروونی هێشتا هێور نەبوەتەوە**

**کریۆن** : **قەت ئەوەت بە بیرا نەیەت کە بە هەرەشەو ترساندن وازت لیبێنم**

«**ئەنتیگۆنا دەچێتە خوارەوە بەرەو بەشی دواوەی شانۆکەو پاسەوانەکان ئەملاو ئەولایان لیگرتوە ، پاسەوانێك لە درزێکی دواوەی شانۆکە دەچێتەژوورەوەو ئەوی دیکەش بە دوایا** دەرواتو لە سەر خۆ چمکێکی پاڵتوکەی ئەنتیگۆنا رادەکێشێو دەچنە ژوورەوە»

**ئەنتیگۆنا** : «هێشتا بە تەواوی نەچوەتە ژوورەوە»

ئەی سیبیەکان ! هەموو شتێ کۆتایی هات ، ئەوەتا راپێچم دەکەن ، ئەی سەرکردەکانی سیبە ، دوا شازادەتان ئیهانە دەکرێ ، بروانن چۆن بە دەم ئازارەوە دەناڵم ، تەماشاکەن چ جۆرە پیاوێك سزاو ئازاری دڵەکەم دەدا .

**تیپەکە** : «دانای» یش زیندەبەچال کراو والە نێوان تەنەکە مسەکاندا نێژراوە . کچەکەم ئەویش وەك تۆ لە بنەماڵەیەکی رەسەنو خانەدانو هەڵگری توخمە زێرینەکەی جۆبیتەربوو ، باکۆس منداڵەکانی دریاسیکرد بە بەرد ، ئەو لاوە زۆر پەشیمان بووەوە کە شەری بەو کچانە فرۆشتبوو کە خۆیان بۆ باکۆس تەرخان کردبووو ئاگری چراکانیانی کوژاندبوەوەو گاڵتەی بە خواوەندەکانی شیعرکردبوو .

«تیریزیاس لای راستەوە دێتە ژوورەوەو منداڵێك دەستی گرتوە»

**تیریزیاس** : ئەی سەرۆکەکانی سیبە : ئەوەتا بووم بە دووان ، چونکە بێ دەسگرتن ناتوانم هەنگاو بنێم .

**کریۆن** : تیریزیاس هیچی تازەت پێیە

**تیریزیاس** : ئەگەر بە قسەم بکەی پێت دەڵێم

**کریۆن** : هەمیشە باوەرم پیکردویت

**تیریزیاس** : ئەگەر بەرێی راستا رۆیشتبای ، بەلام دەزانم لاتداوە .

**کریۆن** : ئەوە ئەڵێی چی ، قسەکانت دەمترسێنن

**تیریزیاس** : ئەم ناڵە منی هێناو منیش کەسانی دی دەهێنم بە چاوی خۆی پاشاوەی لە شەکەی بولینیسی بینی کە لە پەرستگا کەماندا فرێ درابووو سەگو داڵیش دەمیان تێنابوو ، لەو ساوە خواوەندەکان قوربانیەکانمان لێ وەرناگرن ، گیانەوەرەکانیش لە هەموو لایێکەوە دەزیرێنن ، رۆڵە بروام پێبکە ، دەشێ پیاوێك هەڵە بکا ، بەلام سووربوون لەسەر هەڵە گەوجیە . چیتر مردوو ئازارمەدە ، بە زمانی خۆشەویستیو دڵسۆزیەوە ئەم

قسانەت پیێ دەڵێم .

**کریۆن** : جوانە ! هەمووتان دژم دەوەستن‌و تیرم تیێ‌دەگرن باشە ، زۆرباشە ، پارە بۆ خۆتان کۆ بکەنەوەو بیبەنە دەرەوە ، زێری سەردی و هیندیەکان زەوت‌بکەن ، بەڵام ئەوەش باش بزانن کە کەس ناتوانێ لەشەکەی بۆلینیس بنێژێ ، تەنانەت ئەگەر داڵەکان لەشەکەی بخەنە سەر عەرشی جۆبیتەریش ئەوەم نەکردوەو نایکەم . مرۆڤێك کە مردن لە چارەی نووسرابێ نابێ کەرامەتی خواوەندەکان پێشێل بکات . تیریزیاس وادیارە پارەی چاکت وەرگرتوە تائەم قسانە بکەیت ، ئەمەش نیشانەی خۆ دۆڕاندنە .

**تیریزیاس** : پیاوێك ! تەنها یەك پیاو دەزانێ و تێدەگا

**کریۆن** : کۆمەڵی «عراف»ەکان تینووی پارەن

**تیریزیاس** : کۆمەڵی پاشاکانیش تینووی باجن

**کریۆن** : ئایا دەزانی من پاشای تۆم ؟

**تیریزیاس** : دەزانم ، بەڵام ئەوەش دەزانم کە تاجەکەت‌و سەلامەتی سیبە بەخششی منەو من بە تۆم داوە

**کریۆن** : چەن حەزت لە شتی سەیرو سەمەرەیە

**تیریزیاس** : تۆ ناچارم دەکەی **ئەمانە** بدرکێنم هەرچەندە من خۆم حەز ناکەم بیانڵێم

**کریۆن** : قسەبکە ، بەڵام بەکرێ‌گیراو مەبە

**تیریزیاس** : کەواتە لە دەوڵەمەندێکی گەورە دەچم ؟

**کریۆن** : دەباش بزانە ، من لە قسەی خۆم پاشگەز نابمەوە

**تیریزیاس** : دەتۆش باش بزانە ، کە پاداشی تاوانی زیندەبەچاڵ کردنی ئافرەتێك مەرگی کورەکەت دەبێ ، کۆشکەکەت پڕدەبێ لە شکات‌و سکاڵا ، هەموو ئەو شارانەشت لێ دەوروژێن کە پارچە گۆشتی خوێناوی ئادەمیزاد بە دەم جانەوەرانەوە دەبینن دەی رۆڵە دەسم بگرە بابڕۆین ، ئومێد دەکەین لەمەو دوا ئەم کابرایە بتوانێ جڵەوی زمانی خۆی بگرێ‌و حورمەتی ریشە سپییەکەمان بگرێ

«دەچێتە دەرەوە»

**تیپەکە** : قسەکانی هەمیشە راست دەردەچن‌و دێنە دی

**کریۆن** : داخی گرانم ! مێشکم وەختە بتەقێ ، بەڵام پاشگەز ببمەوە حەیام دەچێ ، لەولاشەوە خوا هەڵناگرێ بە هۆی عینادیمەوە تووشی ئەم هەموو دەردە سەریەبیم ، بڵێ‌چی‌بکەم .

**تیپەکە** : کچەکە رزگار بکە

**کریۆن** : ئاوا ، دەتەوێ پاشگەز ببمەوە ؟

**تیپەکە** : زووکە دەی ، تۆڵەی خواوەندەکان نزیك بوەتەوە

**کریۆن** : دەبێ هەروا بکەم ، هێه ، بەڵام زەحمەتە ، زۆر زەحمەتە

**تیپەکە** : دەی ، دەی ، دەی ، کەسی دیکە رامەسپێرە ، دەبێ خۆت بیکەیت .

**کریۆن** : بەڕاکردن دەڕۆم ، دوامکەون ، تەورو پاچو خاکەناز بێنن‌و وەرن ، دەترسم باوی یاسا کۆنەکان نەمابێ .

«دەچێتە دەرەوە»

**تیپەکە** : تۆ ، ئەی ئەوکەسەی بە هەزار ناوەوە تاجت لەسەر ناوە : باکۆس ! دانیشتووی سیبەی پایەتەختی باکۆسیەکان . تۆی ئەستێرەکان دەخەیتە سەماو شەو دەخەیتە گۆرانی ووتن . زووکە بە هەنگاوە گەورەکانت رابکە ، بەرەو ئەو چیایەی لە هێشوو دەکا . . بە پەلە رابکە ! یارمەتیمان‌بدە ، لە گەڵ سەرخۆشەکانتا کە مەستی بادەن خۆت بگەیێنەرە ئەوێ .

**پەیامبەر** : هاونیشتمانیانی کادیۆس ، بەخت پشتتان تێدەکا . پێشتر بەغیلیم بە کریۆن دەبرد ، کەچی ئیستا وا ئەستێرەی لە ئاوابووندایە ، ئەگەر دڵت خۆش‌نەبوو سامان‌و تەختی پادشاهی هیچ ناهێنێ .

**تیپەکە** : قسە بکە

**پەیامبەر** : هیمۆن خۆی کوشت

**تیپەکە** : ئۆهـ تریزیاس ، ئەوە ئیریدسی شاژنە دەبێ شتێکی بیستبێ

**ئیریدس** : «لە سەرووی پلیکانەکانی لای راستەوە دەردەکەوێ ، بە ئاستەم نوزەی دەردەچێ» دەڵێم . . من . . بیستم . . تۆزێ . . تۆزێ درگای پەرستگای منیرڤام کردەوە . وەختەبوو لە پەوروو بکەوم . چی‌قەوماوە ؟ دەبێ گوێ بگرم .

دەتوانم گوێتان لێ بگرم . زووکەن ، بەلاوازم مەزانن ، دەی هێشتا بە هێزم‌و دەتوانم بەرگەی ئازار بگرم

**پەیامبەر** : ئۆهـ گەورە خۆشەویستەکەم . گوێ بگرە با بۆتی باس بکەم ، من خۆم هەموو شتێکم بە چاوی خۆم بینی .

دوای ئەوەی پاشاوەی بۆلینیسان سووتاندو نوێژمان بۆ خواوەندەکانکرد ، رامانکردە ئەو شوێنەی ئەنتیگۆنای تیا حەپس کرابوو ، کریۆن دەنگی کورەکەی بەر گوێ کەوت ، کە بەندیخانەکەمان شکاند ، ئای کە دیمەنێکی دڵتەزێنمان بەرچاوکەوت ، ئەنتیگۆنا خۆی خنکاندبوو ، پەتەکەی لە کراسەکەی خۆی دروست کردبوو ، هیمۆنیش باوەشی بە کچە بەسزمانەکەدا کردبوو ، کە چاوی بە کریۆن کەوت هۆشی لای خۆی نەماو شمشێرەکەی لە کالان دەرکرد و تفێکی لێکرد ، کە کریۆن چاوە سوور هەڵگراوەکانی هیمۆنی بینی نەیوێرا لەوێ راوەستێ‌و یەکسەر بۆی دەرپەری ، لەو ساتەدا هیمۆن شمشێرەکەی لە سنگی خۆی چەقاندو خوێن لەدڵیەوە فیچقەی کردو ئەنتیگۆنای خەڵتانی خوین کرد ، هەر لەوێ لە گەڵ خوێن‌و مەرگدا مارەی‌کرد .

«ئیریدیس گوێ لەم هەواڵە جەرگبڕانە دەگرێ‌و پاشەکشێ دەکا»

**تیپەکە** : شاژن هیچی نەوت ، دەبێ چی‌ی بەدەستەوەبێ

«کاتێکی درێژ»

**پەیامبەر** : نایەوێ خۆی بکاتە گاڵتەچی خەڵك

**تیپەکە** : بێدەنگی لە قیژەو هاوار زیاتر ترس‌و لەرز دەنوێنێ

**پەیامبەر** : راستە ، بابرۆم بزانم لەوێ چی ئەبێ

**تیپەکە** : پاشا کورەکەی هەڵگرتوە

**کریۆن** : «لەشی کورەکەی گرتوە بە کۆڵەوە ، پاشان دایدەنێ‌و بە چۆکا دێ‌و دەس بە سەرو قژیا دەهێنێ کورەکەم ! رۆڵەگیان ! هێمون کورەکەم ! من خوێنرێژم ، من تۆم کوشت

**تیپەکە** : تازە چوو ، پەشیمانی هیچ دادت نادا

**کریۆن** : خوایێك دەستی ناوەتە بینە قاقەم‌و یەکێکی دی لە پشتەوە پیاما دەکێشێ ، ئەو ماڵە بەختیارەی بنیاتم نابوو وابەسەرما ئەروخێ

**تیپەکە** : بەڵێ میرم ، موسیبەت دوای موسیبەت

**کریۆن** : موسیبەتی دیکە ! چی ؟

«تەماشای کورەکەی دەکاو لە تەوق سەریەوە تا پەنجەی پێی سەرنجی دەدا»

لەمە زیاتر دەبێ چی دیکە رووبدا

**پەیامبەر** : ژنەکەت مرد

**کریۆن** : ژنەکەشم مرد ؟ درۆیە ! ئاهـ پلۆتۆن هەموو شتێکم لێ دەسێنیتەوە ، ژنەکەم دوای کورەکەم ، درۆ ئەکەی ، کوا لە کوێیە ؟

**پەیامبەر** : خۆت تەماشاکە ، دەرگاکە کراوەتەوە

**کریۆن** : ئیریدس

**پەیامبەر** : لە لای پەرستگاکەدا خۆی کوشت‌و پێی ووتی خوێن رێژ . .

**کریۆن** : دەترسم . بمکوژن زوو بمکوژن

هەست دەکەم دەکەومە ناو کەندەلانێکی بێ بنەوە

**پەیامبەر** : بە کوشتنی هیمۆن‌و ئەنتیگۆنای تاوانبار کردی .

**کریۆن** : «بە دەنگێکی ورو گێژەوە» چی ؟ دەڵێی خۆی کوشت ؟ ژنەکەم خۆی کوشت

**پەیامبەر** : بەڵێ

**کریۆن** : هەی هاوار ! بمبەن ! دوورم خەنەوە ! من لە هیچ کەمترم ، لە هیچ کەمتر ، نازانم سەیری کوێ بکەم ، دەس بخەمە سەرچی ، قاچ لە کوێ دانێم ، هەموو شتێکم لە دەس‌چوو ، بروسکەو هەورە تریشقەم بە سەردا دادەبارێ .

**تیپەکە** : دەبوایە لە ئیهانەکردنی خواوەندەکان بترسابای ، تازە پەشیمانی دادت نادا ، لە کیست چوو .

«پەردە»

---

**عن كتاب : جان كوكتو**
**تعريب الدكتور صلاح خالص**
**مطبعة الرابطة بغداد ١٩٥٥**

# کاروانی رۆشنبیری لە کوردستاندا

**هەولێر**     **دزوار**

## میرنشینی سۆران

لێژنەی رۆشنبیری لە یەکێتی ئەدیب‌و نووسەرانی کورد – لق هەولێر – لە رۆژی ١٩٨٧/٥/١٣ لە هۆڵی یەکێتی‌دا کۆڕێکی مێژوویی بە ناونیشانی (میرنشینی سۆران لە سەردەمی پاشای گەورە)دا بۆ کاک ئەنوەر حامد مەلا سەعید سازکرد. لە سەرەتادا کاک محەمەد خدر بەخێرهاتنی ئامادەبوانی کردو پوختەی ژیانی کاک ئەنوەری پێشکەش بە ئامادەبوان کرد. ئینجا کاک عبد الخالق سەرسامی شاعیر سەرۆکی لق وتارێکی دەربارەی وەرزی رۆشنبیری‌و دەوری یەکێتی لە رۆژی دامەزراندنی تا ئێستا لە گێرانی کۆڕی رەخنە، مێژوو، شیعر چیرۆك.. هتد.. خوێندەوە.

دوا بە دوای ئەمە برای موحازیر هاتە سەر باسەکەی‌و لەسەرەتادا باسی زانستی مێژووی کردو رای هەندێك لە زانایانی ئەم مەیدانەی بە نموونە هێنایەوە، ئینجا پوختەیەکی کورتی بنەماڵەی میرانی سۆرانی باسکرد.

ئەوەی شایانی باسە کاك ئەنوەر باسەکەی خۆی بەم جۆرەی خوارەوە دابەش‌کرد.

* بەشی‌یەکەم – بەندی‌یەکەم –
– پاشای گەورە کێ‌یە؟ ، کەسێتی پاشای گەورەو نازناوی
* بەشی دووەم
– چاکسازی سەربازی. چاکسازی یاسای کۆمەڵایەتی. چاکسازی ئابووری.
* بەشی سێیەم
– لایەنی سوپاو بەڕێوەبەرایەتی بیناسازی
* بەشی یەکەم – بەندی دووەم
– هۆی پەرەسەندنی میرنشینی سۆران
بەشی دووەم
– پەیوەندی لەگەڵ بابانەکاندا. پەیوەندی لەگەڵ ... جیاجیاکانی کوردستان
* بەشی سێیەم
– پەیوەندی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا. پەیوەندی نێوان ... دەوڵەتی فارس. پەیوەندی لەگەڵ‌میـ...ردا
* بەشی یەکەم – بەندی سێیەم –
– هۆی لاوازبوونی میرنشینی سۆران – هۆی ناوەکی. دەرە...
* بەشی دووەم
– هێرشی عوسمانی بۆ سەر سۆران قۆناغی یەکەم و دووە...
* کۆتایی‌و ئەنجام

ئەوەی شایانی باسە چەند برادەرێك لە ئامادەبوان بە ... هاوبەشی گفتوگۆیان کردو ئەم بەڕێزانەیش راوو بۆچوو... خۆیان پیشاندا: حسام الدین نەقشەبەندی. هیمداد حە... ئەسعەد عەدۆ.

## کۆڕێکی شیعر خوێندنەوە

لە رۆژی ١٩٨٧/٥/٦دا لێژنەی رۆشنبیری‌ی یەک... ئەدیب‌و نووسەرانی کورد لە هۆڵی یەکێتی‌دا مێواندار... شاعیری لاو قوبادی جەلی‌زادە کرد. لەم کۆڕەدا کاك قوب... شاعیر کۆمەڵێ بروسکە شیعری گەرم‌و گوڕو ... خوێندەوە: سەفەر، ماچ، شەپۆل، زبڵ‌کێش. ئەوە... دەستار، دەنکە گەنم، دروونە، سەفەری (٢).. هـ...

لە سەرەتادا هونەرمەند کریم عوسمان بەم‌جۆرە ک... شاعیری پێشکەش کرد: (دەمێك نیە قوباد شیعر دەنووس...



بەلاَم بەم ماوە کورتە ، بە هەنگاوی وردو لەسەرەخۆو هێمنانە توانی خوێنەرو شەیدایانی شیعری ناسك و دڵگیری کوردی بەخۆی ئاشنا بکات و لە نزیکەوە بیناسن . . هەروەهاگوتی : قوباد بەجۆرێ بابەتی شیعرەکانی پێشکەش بە خوێنەر دەکات کە زمانەکەی ڕەوانو بێ گرێیە ، دوورە لە موفرەدات و دەستەواژەی گران و تەم و مژاوی ، لە وێنەی شیعریش وردەکاری و چنینکاری پێوە دیارە . ئەمەش دەست ڕەنگینی شاعیر پیشان دەدات .

ئەوەی شایانی باسە بەپێی بەرنامەی کۆڕەکە ، شیعرەکان لەلایەن سەلاح شوانو محمد خدرەوە ڕووبەڕووی کۆمەڵێ سەرنجی مەوزوعیانە بوونەوە ، دیسانەوە برادەران محمود زامدارو عبد الخالق سەرسام و دڵشاد عەلی و سەعدوڵڵا پەرۆش بەچەپکێ بۆچوون و تێبینی بەشداری کۆڕەکەیان کرد .

## سروودێکی خۆشەویستی

کۆمەڵەی هونەرە جوانەکانی کورد - لقی هەولێر - لە ئێوارەی ڕۆژی ١٩٨٧/٥/٧ لەسەر شانۆی ڕۆشنبیری جەماوەردا شانۆگەری (سروودێکی خۆشەویستی) ، لە نووسینی جان کۆکتۆو وەرگێڕانو نواندن و دەرهێنانی هونەرمەندی لێهاتووی کورد خاتوو گەزیزە پێشکەش کرد . ئەوەی شایانی باسە ئەم شانۆگەرییە لە ڕووی نواندن و دەرهێنان کارێکی یەکجار باش بوو ، ئامادەبوانی سەرمەست کرد ، بۆیە دەتوانین خاتوو گەزیزەی هونەرمەندی ئەم سەردەمەی کورد بە (سناء جمیل ونضال الاشقر) بشبهێنین ، بەڵکو بۆ باری ئافرەت و شانۆی کورد زیاترە .

ئەم خوشك و برایانەیش بەشداری کارە هونەرییەکانیان کرد : سازان علی ، نعیمة محمد ، احمد جبار ، دانا بکر ، ابراهیم حکیم . هەر بەم بۆنەوە برای هونەرمەند ئازاد مەولوودیش کۆڕێکی خنجیلانەی چڕوپڕی لەسەر ناوەڕۆك و دەرهێنانی شانۆگەرییەکە پێشکەش کرد . لەسەرەتادا مامۆستا محمود زامدار خوشکە گەزیزەو کاك ئازادی بە ئامادەبوان ناساند . لە هەوەڵەوە کاك ئازاد وتی (شانۆنامەی سروودێکی خۆشەویستی یاخود دەنگی مرۆڤانە دەنگدانەوەی ناخی مرۆڤە ، ناخی مرۆڤی خێرخوازو جوان ناس ، دەنگی خۆشەویستییەکی بێگەرد لە سەردەمێکی ئەوتۆ کە چرای خۆشەویستی ڕاستەقینەی تێدا کزە ، ئەم عیشقە پاکەی مرۆڤ کە چڕکردنەوەی درێژایی ژیانی پێنج ساڵەی مرۆڤێکی کردۆتە تابلۆیێك و لەچوارچێوەی یەك گفتوگۆی تەلەفۆندا لەپێشانگای زەوق و خەیاڵی جوانی شاعیرانەی ئەم سەردەمەدا هەڵی دەواسێ) . لە کۆتایی باسەکەیدا وتی (لە دیمەنە هەرەجوانەکانی کۆتایی شانۆنامەکەدا ، ڕوو بە ڕووی نەخۆشێکی دڵناسك ئەبێتەوە کە لەسەر ڕۆخی مردنەوە داواکاریە بەنازەکانی ئەداتە دەم تەلی تەلەفۆنەکە کە بەرەو باریك بوونەوە ئەچێت بە ڕادەیەك ئیتر جێگای تێپەڕبوونی سەدای سروودی خۆشەویستی ئەوانی تیا نابێتە . .) .

دەربارەی نواندن و دەرهێنان ، برای موحازیر بەمجۆرەی خوارەوەی دابەش کرد .

- چاکترین بەکارهێنانی وردەکارییەکانی نواندن
- هەست کردنێکی تەواوو ڕەنگدانەوەی بۆ کات و چرکەو گاڤەکان و ئاگاداربوونی گۆڕانیان
- پاراستنی ڕەزمی شانۆگەرییەکە لە سەرەتاوە تا دوایی
- داهێنانی پانتۆمایم لە دیمەنی سەگەکەو پەنجەوانەکان
- دیمەنی پیرەژنەکە
- تەختەو تەلەفۆنەکە
- مومەکە
- بەکارهێنانی پێشەوەی شانۆ
- تەلی تەلەفۆن بە دەمامکەکانەوە
- ڕەنگی سووری تەختەکەو زەردی کورسییەکە



- هەڵس‌وکەوت لەگەڵ ئێکسسواردا (کورس)
- بازنەی ڕەنگاو ڕەنگی ڕووناکی
- بازنەکەی دیکۆر .

بەڵام دەربارەی خالە کزەکان بەرای کاك ئازاد :

- ژمارە (٤)ی دەمامکەکان لەگەڵ ژمارە (٥)
- نزیك بوونەوەو دەست لێدانی دەمامکەکان ، پەیوەندی‌یەکان لە ڕۆحی‌یەوە دەکاتە مادی
- کلیلەکانی صۆلیفیج - سروودی سەرزارەکی ، سروودی قولایی گیان .

ئەوەی شایانی باسە گەلێ بروسکەی ئافەرین بۆ خوشکە گەزیزەو کاك ئازاد خوێندرایەوەو چەندان هونەرمەندو ئەدەب دۆستان بەشداری گفتوگۆیان کرد لەمانە : ڕێدار ، حمە علی ، عباس عبد الله ، فؤاد ، چەندانی تریش .

### شانۆگەری سۆفە

قوتابخانەی ئامادەیی ڕزگاری لە نیساندا شانۆگەری سۆفە لە نووسین‌و دەرهێنانی قوتابی ئەبوبەکر هەولاو یاریدەری مەهدی عەبباس ، ئەکتەرەکان بە گشتی : سۆفە - ڕەمزی فارس ، حەمە - عبد الغفار صابر ، هیوا - کاوە مصطفی ، قەمبور - عزیز حمد ، کابرای شەلە - فەرهەنگ حمد صالح ، قوتابی زانکۆ - بەختیار عبد الله ، ئارام - سالار عثمان گەلاڵی ، کابرای گوندی عبد القادر محمد ، مام برایم - شەماڵ محمد ، ساقۆ دزراو - کیفی صدیق .





### موشاغەبە

ئامادەیی بازرگانی هەولێری کوڕان لە ١٩٨٧/٤/٥ شانۆگەری موشاغەبەیان پێشکەش کرد ، نووسینی عمر علی امین دەرهێنانی محمد عمر شریف‌و یاریدەری خطاب کاروانی . ئەکتەرەکان : حمد ڕەنجدەر - حسن چایچی ، یوسف احمد - مامە خولە ، مهدي عباس - بابە کریم ، ئازاد صادق - مامۆستا ، محمد عمر شریف - قادر موزەمید ، خطاب‌کاروانی - ئاغا ، ئاشتی نوری - منداڵ ، هەڵمەت تاهیر - مەئمور مەرکەز ، عمر محمد طه - پۆلیس ، کمال عثمان - حەمەڕەزا ، نەبەز - پیاوێك ، اسماعیل جوهر - پیاوێك ، هیوا طاهر - چایچی مەرکەز .

### کارەساتی نەبەز

قوتابخانەی دواناوەندی زۆزان لە ڕۆژی ١٩٨٧/٤/٩ لە نووسین‌و دەرهێنانی مهدی عباس‌و یاریدەری سالار عثمان گەلاڵی شانۆگەری کارەساتی نەبەزیان پێشکەش‌کرد . ئەکتەرەکان : لقمان احمد - نەبەز ، هەینی عبد الله - ڕێبەر ، مهدی عباس - باوك ، سالار عثمان گەلاڵی - ئازاد ، صباح حسین - مامۆستای بیرکاری ، زکریا یاسین - مامۆستای زیندەوەرزانی ، سعد الله عزیز - مامۆستای کوردی ، سازگار احمد - بەڕێوەبەر ، کامران عزیز - مام شەریف «فەڕاش» . خالد کریم - ئەفسەر ، بەختیار غازی - شیرۆ «قوتابی» . ادریس عبد الله - کامەران «قوتابی» ، عبد الخالق جبار - حسن «قوتابی» ، نریمان اسماعیل - ڕزگار «قوتابی» ، احمد ئەسعەد - حسین «قوتابی» ، شوان امین - چاودێری پۆل . ئازاد مخلص - شیرزاد «چاودێر» ، دلشاد حسن - چاودێر .

**سلێمانی** ئازاد

• **کۆڕ :**

**«ئێوارە کۆڕێك‌و چەند شاعیرێکی لاو»**

بەڕێوەبەرێتی‌ی ڕۆشنبیری‌ی جەماوەر لە سلێمانی سەر لە ئێوارەی ڕۆژی ۱۹۸۷/٥/٧ ، لە هۆڵی بەڕێوەبەرێتی‌ی ناوبراودا کۆڕێکی بۆ شیعر خوێندنەوە سازدا کە تیایدا چەند شاعیرێکی لاو بەشداری‌یان کرد .

پاش ئەمەی کاك «شەهاب عوسمان» وتەیەکی بەناوی لێژنەی ڕۆشنبیری‌ی بەڕێوەبەرێتی‌ی‌یەوە خوێندەوە ، ئینجا شاعیرە لاوە بەشدارەکان دەستیان بە خوێندنەوەی شیعرەکانیان‌کرد .

سەرەتا برای شاعیر «محەمەد عومەر عوسمان» دوو پارچە شیعری خوێندەوە ، دوابەدوای ئەویش کاك (فاتیح عیزەدین) بە چەند پارچە شیعرێك کە لە ژێر ئەم ناونیشانانەدا بوون : (سبەی شەویش ، گەڕانەوەی جەین‌ئایر ، چاوپێکەوتنێك ، هانای بەر لە مردن) لەم کۆڕەدا بەشداری‌ی‌کرد .

برا بەشدارەکانی‌تریش بریتی‌بوون لە (ئیسماعیل خورماڵی ، جەزا عەلی ، جەزا کەریم ، گەشاو ئەحمەد) کە هەر یەکەیان چەند پارچە شیعرێکی لەم کۆڕەدا خوێندەوە .

**«رامبۆ‌ی مێرمنداڵ‌و شیعر»**

هەر لە لایەن بەڕێوەبەرێتی‌ی ڕۆشنبیری‌ی جەماوەرەوە لە سلێمانی ، لە بەرواری ۱۹۸۷/٥/١٣دا کۆڕێك بۆ کاك «هیوا قادر» سازدرا کە تیایدا باسێکی لە مەڕ ژیان‌و بەرهەمەکانی شاعیری فەرەنسایی «ئارتۆر رامبۆ»وە خوێندەوە .

بەر لە خوێندنەوەی باسەکەی کاك هیوا ، کە لە ژێر ناونیشانی «رامبۆی مێر منداڵ و شیعر»دا بوو بەڕێوەبەری کۆڕ کاك «ئەحمەد ڕەزا» یەك دوو شیعری وەرگێڕدراوی رامبۆی







خوێندەوەو کاك هیوای بە ئامادەبووان ناساند .

خاوەن باس باسەکەی بەسەر دوازدە بەشدا دابەش کردبوو کە بریتی بوون لە :

«کەسێتی‌ی رامبۆ ، بەرەو ڕووناکی ، رامبۆو قوتابخانە . سەرەتای سەرکێشی‌ی رامبۆ ، چاوە وەنەوشەییەکان ، کلّپەی شۆڕش لە شیعری رامبۆدا ، هەست‌کردن‌و بە وون‌بوون‌و شکان ، کەشتی‌یە مەستەکە ، رامبۆو ڤرلین ، وەرزێك لە دۆزەخ‌دا ، رامبۆو یەکەم وەچەی شیعری ڕەمزی ، رامبۆی گەشتکەرو بازرگان .

ئەوەی شایانی ئاماژەکردنە ئەوەیە کە باسەکە پتر ژیانی تایبەتی‌ی رامبۆی کردبووە تەوەرەیەك‌و بە دەوریدا دەسووڕایەوە ، لە کاتێکدا دەبوایە خاوەن باس لە میانەی توێژینەوەی چەند شیعرێکی شاعیرەوە ڕادەی شاعیرێتی‌ی رامبۆی بە ئامادەبووان بناساندایە .

پاش خوێندنەوەی باسەکە لەلایەن بەڕێوەبەری کۆڕەوە چەند نامەیەکی رامبۆ خوێندرانەوەو پاشانیش لە لایەن هەندێك لە ئامادەبووانەوە چەند پرسیارێك ئاراستەی خاوەن باس‌کران‌و بەمە کۆتایی بە کۆڕەکە هات .

• **پیشانگا :**

**پیشانگای تایبەتی‌ی هونەرمەندی لاو «محەمەد فەتاح»**

لە ڕۆژانی ١٦–تا–۱۹۸۷/٥/٣١دا نیقابەی هونەرمەندانی سلێمانی لە هۆڵی گەلەری پیشانگایەکی تایبەتی‌ی بۆ هونەرمەندی



لاو «محەمەد فەتاح» کردەوە کە تیایدا نزیکەی (٥٥) کاری هونەریی تێکەڵاو لە (ئاوی ، گرافیك ، زەیت) پیشان‌دا .

لە وەرامی پرسیارێکدا کە ئاراستەی ئەم هونەرمەندە لاوەمان کرد سەبارەت بەم پیشانگا تایبەتی‌یەی وتی :

«هونەر پێویستە لە خزمەتی واقیع دابێت ، واقیعی ئەو کۆمەڵەی کە هونەرمەندەکەی تێدا دەژی ، لەم پیشانگایەمدا کە یەکەم پیشانگای تایبەتیمە دەمەوێ بڵێم ویستوومە ئەو قۆناغانە پیشان بدەم کە پیایاندا تێپەڕیوم ، هەر لە سەرەتای وەرگرتنمەوە لە پەیمانگای هونەرە جوانەکان لە سلێمانی هەتاکو ئێستام . بۆ نموونە گەر کەسێك لە هۆڵەکەدا بەووردی چاوی گێڕابێت ئەو قۆناغانە لە یەکدی جیا دەکاتەوە هەروەکو چۆن لە قۆناغی سەرەتای ژیانی هونەریمدا دیارەو زۆربەی کارە هونەریەکانم کە کاری هێڵکاری‌و ئاوین کاریگەریی سروشتیان بە سەرەوە دیارە هەروەها هەر لە قۆناغی خوێندنمدا چەندین کاری زەیتیم وەبەرهەم هێناوە . . دواشت دەمەوێ بڵێك تابلۆکانم چەند شێوازێکی جیاواز دەخەنە روو لەم پیشانگایەدا خۆم بە هیچ قوتابخانەیەکی دیاری‌کراوەوە نەبەستووەتەوە» .

- کاك محەمەد فەتاح لە ساڵی ١٩٦٥دا لە سلێمانی هاتووەتە دنیاوە .
- لە ساڵی ١٩٨٠دا لە پەیمانگای هونەرە جوانەکان وەرگیراوە
- بەشداریی فیستیڤاڵی ساڵانەی پەیمانگای کردووە لە ساڵانی ١٩٨٢ - ١٩٨٣ - ١٩٨٤ - ١٩٨٥ دا .
- ساڵی ١٩٨٥ لە پەیمانگا دەرچووە .
- ئەندامی نیقابەی هونەرمەندانە لە سلێمانی .

### «نالی‌و خەونێکی ئەرخەوانی»

لە نووسین‌و دەرهێنانی هونەرمەند مامۆستا «ئەحمەد سالار» ، تیپی شانۆی سالار لە سەر شانۆی یەکێتی‌ی ئەدیبان‌و نووسەران‌و لە رۆژی ١٩٨٧/٦/١٣ ەوە دەستی بە پێشکەشکردنی نمایشی شانۆیی‌ی «نالی‌و خەونێکی ئەرخەوانی» کرد .



ئەو ئەکتەرانەی بەشداربوون لەم نمایشنامەیەدا کە لەوەوبەر لە فیستیڤاڵی یەکەمی شانۆی ئەزموونگەریی کوردی‌و هەروەها لە بەغدادیش پێشکەش‌کرا بریتی‌بوون لە : (ئومێد حسەین - گێڕەرەوە ، نەهرۆ ساڵح - نالی ، خەرمان هیرانی‌و پەروین حەسەن - حەبیبە ، سۆران ئیسماعیل - قوتابی ، یونس حەمە کاکە - مامۆستا ، کامەران فەتاح - قوتابی ، زوهێر حەمە ئەحمەد - پیرەمێرد ، رەمەزان ئیبراهیم - قوتابی ، شۆرش قادر - ئەکتەر) .

ئیداری‌و هونەریەکانیش بریتی‌بوون لە : (ئاکۆ سدیق - بەڕێوەبەری شانۆ ، مەریوان عومەر - یاریدەدەری دەرهێنەر ، بەڵێن جەلال - رووناکی ، سەباح عەبدوڵا - سەنتور ژەن ، سیروان جەلال - دەف ژەن ، زاهیر جەلال‌و بورهان محەمەد - گۆرانی بێژ) .

**• پیشانگا**

### «پیشانگایەکی هاوبەشی دوو هونەرمەندی لاو»

بەڕێوەبەرێتی‌ی رۆشنبیری‌ی جەماوەر لە سلێمانی لە رۆژانی ٦/٢٣ تا ١٩٨٧/٦/٣٠و لە هۆڵی مۆزەخانەی سلێمانی پیشانگایەکی هاوبەشی بۆ هونەرمەندانی لاو «کاروان قادر کابان» و «ئارام سدیق» کردەوە .

کاروان بە شانزدە کاری هونەری لەم پیشانگایەدا بەشداری کردبوو کە تێکەڵاو بوون لە کاری زەیتی‌و مەرەکەب و ئاوی‌و





قەڵەمی ڕەساس لەوانە : (ئازار ، تابلۆو هونەرمەند ، دەموچاو ، منداڵێکی هەژار ، کڕنووش‌بردنی جادوو بازەکان ، خۆشەویستی ، جیابوونەوە) .

* کاروان قادر لە ساڵی ۱۹٦۸دا لە سلێمانی هاتووەتە ژیانەوەو ، قوتابی‌ی ئامادەیی‌ی پیشەسازی‌ی سلێمانی‌یە .

«ئارام سدیق» یش بە پانزدە کاری هونەری لەم پیشانگا هاوبەشەدا بەشداری‌ی کردبوو لەوانە :

(سۆز ، مرۆڤ‌و ئازارەکانی ، هاواری مردوویەك ، دەریای خەم ، مەرگ‌و خۆشەویستی ، شارەکەم) .

– ئارام سدیق لە ساڵی ۱۹٦۸ لە سلێمانی هاتووەتە دنیاوەو ئێستا قوتابی‌ی ئامادەیی‌ی پیشەسازی‌ی سلێمانی‌یە .

## «بەڕێوەبەرێتی‌ی ڕۆشنبیری‌ی جەماوەر لە سلێمانی‌و چەند کۆڕێکی ڕۆشنبیری»

* لە ڕۆژی ۱۹۸۷/٦/۱۱دا بەڕێوەبەرێتی‌ی ڕۆشنبیری‌ی جەماوەر لە سلێمانی‌و هەر لە هۆڵەکەی خۆیدا کۆڕێکی شیعری‌ی ماتەمی سازدا بە بۆنەی چلەی قوربانیانی دەست ئەو لافاوەی کە لە ۱۹۸۷/٥/٥ دا شاری سلێمانی دوو چاری‌هات .

سەرەتا کاك «شەهاب عوسمان» بە ناوی لیژنەی ڕۆشنبیری‌ی بەڕێوەبەرێتی‌ی ناوبراوەوە بە خێرهاتنی لە ئامادەبووان‌کردو ، پاشانیش هەموو خولەکێك بۆ گیانی پاکی قوربانیان ڕاوەستان .

شاعیری لاو کاك «هیوا قادر» سەرەتای کۆڕەکەی بە شیعری (سێڵاوی هەورێکی قرخن) کردەوە کە تیایدا دەڵێ :

چەندە پەشمە
کوناو کون خاچ بە دوای مەسیحدا بگەڕێ
تەنووری دڵ ،
وەکو چاڵە بەفری زستان
زمان بکاتە کانی خوێ‌و ،
درۆش بکا
لە وەرزی سێلاوو قرچەی
سووتانی ئاتەم شارەیا ،
چەندە پەشمە

پاشان شاعیری لاو کاك «ئەحمەد ڕەزا» شیعرێکی لە ژێر ناونیشانی «هەناسەی شیعرو هەمیشە کۆتەڵ» دا خوێندەوە کە تیایدا دەڵێت :

باران . . باران
،قوڕێکی ڕەش . . خەڵتانی کێم‌و زونێکی لەمێژینە
لە پێدەشتی تاوانەوە ، بەری کەوتوو
لە ئاسمانی بە تەمی
وڵاتی شەما داباریو
ڕژایە سەر دوندی بەرزی ئاواییەك
لە مێژە پی‌ی بە جەرگی خۆیدا ناوە
لە مێژە خۆی لە بەر چیغ ڕاپسکاندووەو
لە پێش ئاگر کەوتنەوەدا
خۆی لە کۆزی خۆی بەرداوە

. . دوا بە دوای ئەمان بەڕێزان (لەتیف قەرەداغی ، ئیسماعیل خورماڵی) هەر یەکەو پارچە شیعرێکیان خوێندەوە ، پاشانیش کاك (ئاریان فەرەج) بە پارچە پەخشانێکی لەم کۆڕەدا بەشداری‌ی کرد .

کچە شاعیری لاو «کەژاڵ ئەحمەد» یش یەکێك بوو لە شاعیرە لاوە بەشدارەکان ، شیعرەکەی کەژاڵ بە ناونیشانی (بووکی کێڵگەو کارەساتێ) وە بوو ، لە سەرەتاکەیدا دەڵێت :

باران بە لێزمە ئەباری‌و
لەسەر سنگی شەقامی خەم
هەر وەکو شێت
ڕائەکەم‌و بانگت ئەکەم
دابڕچەیەك نان لە سنگمایەو
توند باوەشم پیا کردووە
چەند ڕۆژێکە تۆ برسیتەو
ئەمرۆ توانیم بۆت پەیاکەم !
تا ئەگاتە کۆتایی‌ی شیعرەکە :
وەکو لە جەنگ بەشکاوی گەڕابمەوە
لە ناو جەستەی مردووەکانا

راوەستاوم
هەر لە بووکی ئەم کێڵگە وێرانە ئەکەم
هەتا ئەژنۆم لە قوڕدایەو
بانگت ئەکەم
بانگت ئەکەم
چاوم بڕیوەتە خۆرو
نەفرەت لەو ئاسمانەش ئەکەم
کە گشت ساتێ
جلێکی ڕەش
ئەکاتە بەری شارەکەم . .

. . ئینجا شاعیری لاو «سەلام مستەفا» یش شیعرەکەی خۆی کە بە ناونیشانی «هۆ» وە بوو ، خوێندەوە کە دەڵێت :

لێرە لە نێوان درکەزیی خاکا
پەپوولە باڵی چەقیوەتە ناو قوڕاوێکی شل
چاوی هیلاکی بڕیوەتە دوور
مەرگی بەخشیوە بە قەد پاڵی ترس
ترسێ تاشە بەرد بێتە خوار بە تل

. . کاک «ئەمین محەمەد» یش بە شیعرێك لەم کۆڕەدا بەشداری کرد کە بە ناوی «ئەم لافاوەش»ەوە بووو ، تیایدا دەڵێت :

دەڵێن هەوری ڕەش
کاتێ کە زانی وەرزی تەمەنی
سوجدە بۆ کەلی ئاوابوون دەبا
لە ژیانی خۆی نائومێد دەبێو
پەنا دەباتە بەر بارەشێکی شوومی قەترانی
وەك ئەو ڕەشەبای کەلافاوەکەی
لە گەڵ خۆی هانی . . .

. . . هەروەها ئەم بەڕێزانەیش هەر یەکەو پارچە شیعرێکیان خوێندەوە (ئەبو بەکر عەلی محەمەد ، جوانرۆ ، کاروان مەحموود ، عیرفان ئەحمەد)و بەوە کۆتایی بە کۆڕەکە هێنرا .

## «گۆرانی کۆمەڵ»

هەر لەلایەن بەڕێوەبەرێتیی ڕۆشنبیریی جەماوەرەوە لە سلێمانیو لە ئێوارەی ڕۆژی ١٩٨٧/٦/٢٨ داو ا هۆڵی ڕۆشنبیری کۆڕێك بۆ کاك «بەیاد عەبدولقادر» سازدرا ک تیایدا بەشی دووەمی باسێکی خوێندەوە لە ژێر ناوی «گۆرانی کۆمەڵ»دا ، شایانی ئاماژەکردنە کە خاوەن باس بەشی یەکەمی باسەکەی لە کۆڕێکیتردا خوێندبووەوە کە ساڵی ڕابوردو یەکێتیی ئەدیبانو نووسەران لە سلێمانی بۆیان سازدابوو .

کاك بەیاد لە بەشی دووەمی باسەکەیدا لەمەڕ ئە هۆکارانەوە دوا کە ڕۆڵیان لە گۆڕانو پەرە سەندنی کۆمەڵد هەیە کە پێکهاتوون لە : (هۆکاری سروشتی ، هۆکاری بایۆلۆجی ، هۆکاری دیمۆگرافی ، هۆکاری تەکنۆلۆجی هۆکاری ئایدیۆلۆجی) .

کۆڕەکە لە لایەن کاك «بەکر حەسەن» ەوە بەڕێوە برا . لە بەڕێزانەی پاش خوێندنەوەی باسەکە کەوتنە لێدوان لەسەر کاك «محەمەد فەریق حەسەن»و کاك «محەمەد ڕەشید فەتاح» و تێبینییەکانیان کۆتایی بەم کۆڕە هات کە ژمارەیەکی زۆر ئەدەب دۆستان ئامادەی بوون .

## «مێژووی سەرهەڵدانی سۆسیۆلۆجیا»

هەر لە لایەن بەڕێوەبەرێتیی ناوبراوەوەو لە ڕۆژی چوارشەممە ڕێکەوتی ١٩٨٧/٧/١ دا کۆڕێك بۆ کاك «محەمە ئەحمەد ڕەسوڵ» سازدرا کە تیایدا باسێکی بە ناونیشانی «مێژووی سەر هەڵدانی سۆسیۆلۆجیا» وە خوێندەوە .

کاك محەمەد توێژینەوەکەی بەسەر دوو بەشدا دابەش کردبوو ، هەر بەشەیش سێ تەوەرەی گرتبووەخۆ . دوای خوێندنەوەی «پێشەکی» یەك دەستی بە خوێندنەوەی بەشی یەکەم کرد کە بریتیبوو لە :

یەکەم : پێشدەستییەك بۆ فەلسەفەی بیرکردنەوەی کۆمەڵایەتی سۆسیۆ گرافیا .

دووەم : سەدەکانی ناوەراستو چوونە ناخی مەسەلەکانەوە .
سێیەم : چەردەیەك دەربارەی رۆژگاری «رێنیسانس» .

پاشانیش دەستی بە خوێندنەوەی بەشی دووەمی باسەکە کرد کە لەم تەوەرانە پێکهاتبوو :
یەکەم : دەرکەوتنو سەقامگیر بوونی دیمانەی پەیمانی کۆمەلاّیەتی :
دووەم : رۆڵی فەلسەفەی مێژوو لە لێکۆڵینەوەی زانستیانەی کۆمەڵگەدا .
سێیەم : سەرهەڵدانی سۆسیۆ لۆجیای هاوچەرخ .

پاش خوێندنەوەی باسەکە چەند پرسیارێك لە لایەن ئامادەبووانەوە ئاراستەی خاوەن باس‌کرانو لێدوانیان لەسەر کراو بەمە کۆتایی بە کۆرەکە هات .

**دهۆك** مەتین

## سێ چیروك نڤیس دتەرازیا رەخنێ‌دا

ژ بزاڤێت رێڤەبەریا رەوشەنبیری جەماوەر ل پارێزگەها دهوکێ ئێڤاریا رۆژا چار شەمبێ رێکەفتی ١٩٨٧/٧/١ کۆرەکێ چیروك خاندنێو رەخنێ ل هولا رێڤەبەریێ هاتە سازکرن بو ڤان چیروك نڤیسا نزار محمد سعیدیو کریم جمیل بیانیو عبد الله جندی . تورەڤانێ بەرکەتی صدیق شروی کۆر برێڤەبر .

ژرێڤە چیروك ژلایێ چیروك نڤیساڤە هاتنە خاندن .

چیروکا ئێکێ بناڤێ «ئێڤەلی» ژلایێ نزار محمد سعیدی ڤە هاتە خاندنو چیروکا «شەڤاگران» ژلایێ عبد الله جندی و چیروکێت «سیتاڤلك – ئەوو ئەو – شەڤو خوین – ژڤانێ پێشەمبێ» ژلایێ کریم جمیل بیانی ڤە هاتنە خاندن .

ددویڤدا دەرفەت بو رەخنەگرا هاتە دان ل سەر ڤان چیروکا باخڤنو برادەرێت ژێری پشکداری کرن :

• **رشید فندی :**

چیروکا («ئێڤەلی» یا نزار محمد سعیدی ژ چیروکێت واقعیا کومەلایەتی‌یە ، دڤێ چیروکێدا قەوی چیروك نڤیس مایێ خو د چیروکێدا نەکریە مە دڤیا چیروك نڤیسی رایا خو دیارکربا ل سەر زاردەڤێ پالەوانێت چیروکێ . سەیدایێ پێش‌کەتیبو دوێنەگرتنا کەسێت چیروکیداو دیسان ئەزمانێ چیروك پێ‌هاتیە نڤیسین ئەزمانەکێ باشەو پاقژە . . مروڤ دشێت بساناهی دچیروکێ بگەهیت ، ئەگەر چی دوماهیکا چیروکا دوماهیەکا لاوازە . لگەل ڤان تێبینیا ژی چیروکەکا بسەرکەڤتیە .

چیروکێت کاك کریم بیانی سێ ژوان ل سەر دۆزا ژنکێ‌نە . ئەزمانێ چیروکا یێ ساکارە بساناهیو عەدەتیە .

چیروکا «شەڤو خوین» ناڤەروکا وێ یا بهێزە ، بەلێ مخابن پالەوانا دوماهیەکا لاواز یا بو خو دانایو هەلبژارتی .

چیروکا «ئەوو ئەو» حەدەث بهزرا من تێدا نینە . .

چیروکێت کاك کریم ی دراماییەکێ جوان تێدایە

چیروکا «سیتاڤلك» پالەوانێ وێ گەلەك دترسیت ، مروڤەکێ نەوێرۆکە ، چیروك بخو دبیتە کەڤالەك بو مروڤەکی ترسنوك بارا پتر ژمللەتێ مە نە دهوسانە .

چیروکا «شەڤاگران» یا عبد الله جندی ، ناڤەروکا وێ یا رەمزیە ، پالەوان هەمی دسلبی‌نە ، دڤێت وان پالەوانا دەورێ خو هەبیت ، ل سەر ڤێ چەندێ دوو تشتێت هەین مروڤ بێژیت ، یان پالەوان دبێ خەمن ، یان رەمزێت وی بسەرکەتی نینن . دیسان شێوی تەقریری یێ چیروك پێ هاتیە نڤیسین پتر بکێر چیروکا درێژ ، یان رومانێ تێت ژلایێ ئەزمانیڤە ، ئەزمانێ چیروکی یێ عەدەتیە مروڤ بساناهی تێ دگەهیت .

**انور محمد طاهر**

رویدانا چیروکا سەیدایێ نزار بەحس ژێ دکەت رویدانەکە ژهزارا نزانم چاوا سەیدای بو خو هەلبژارتیە ، بهزرا من چ دۆز چارەسەر نەکرینە ، ژلایەکی دیڤە یێ سەح‌کەتە چیروکێ دێ بینیت «سودفە» گەلەك تێدا هاتینە .

دراما چیروکێو قارەمان دنێزیکی کومەلینە ، سەیدای چیروکا خو بئەزمانەکێ سڤكو خوش دارێتیە .

ئو یێ سەرکەتیبو دئینانو برنا کەسێت چیروکێدا .

چیروکا **سەیدایێ عبد الله** جندی بەحسێ سەرهاتیا مروڤەکی دکەت **خەمخوریێ مللەتێ** خویە . . دڤێ چیروکیدا سەیدای تەڤنەکێ **وسا یێ راچاندی** ، هەر کولاڤەکی ئەجنەکێ دانایە بن . ئەز **پشتگریا سەیدایێ** رشید ناکەم کو قارەمانێت چیروکێ **دبێ خەمنو هەڤرکیێ** ناکەن .

کاك **عبد الله دچیروکا خودا شێوی** «حەماسی»و دروڤا «شعاراتا» بکار ئینایە لەوما کەتیە تەحسینێ ، ئەڤە ژی بو چیروکا ئەڤرو دەست نادەت .

**• محسن قوچان**

دڤان چیروکادا تشتەکێ نوی بو مە سەرهلدا ئەوژی هەڤالێت مەیێت چیروك نڤیس یێ بجسارەت کەتین دڤان بابەتادا ئەڤێت بو چیروکێت خو هەلبژارتین .

دچیروکا «ئێڤەلی» دا کاك نزاری چارەسەریا مروڤەکێ کەتیو ناتورە کریە ، نەشیایە رویشالێت ڤێ تشتی دیاربکەت کا چاوا هاتینە . چیروك یا ژواقعی وەرگرتیو نەهێلایە ئەم د «ضەمیر»ێ کەسادا بژین .

ئەزمانێ چیروك پێ هاتیە نڤیسین گەلەکێ بهێزە . چیروکێت کەکێ کریم د «ذاتی» نە ، د چیروکا ژڤانێ پێشەمیێدا بارێ خوێ دانایە سەر (مەقولا) دەرونی «الاستجابة التحویلیة» چیروکا «شەڤو خوین» چارەسەری بو نەدانایە .

چیروك نڤیس یاڤیایی دچیروکێت خودا سەربوریت کەساتیا خو راگەهینیت ، یێ سەرکەڤتی بو دڤێ راگەهاندنێدا . رەمزێت دچیروکا عبد الله یێ جندیدا هاتین دجوانبون ، دڤێ چیروکێدا سەیدای هێژا ئێخستیە سەر شەرەنیخێ لگەل خورستی ، دیسان ئێکاتی لگەل خورستی خویا کریە . عبد اللە یێ جندی «هیتافا» بکار ئینای ، ئەڤ تشتە ئەز دبێژم بو شانویێ بتنێ دەست ددەت .

**بائیز عمر**

رونکرنەکا بو سەیدایێ محسن قوچان «هیتاف» دشانوژیێدا چێنابیت .

چیروکا ئێکێ یا نزاری ئەوا کو بناڤێ «ئێڤەلی» ژسەریو هەتا هەردوو لاپەریت دوماهیێ یاجوانە . **یا پێدڤی بو سەیدای لەز** نەکربا دووماهیێ دا و ئەز دبینم باشتر ئەو **بو چیروك پارچە پارچە** کربا .

چیروکا «شەڤا گران» یا سەیدا عبد الله جندی **گەلەك حەشو یا** تێدا . **جحێلا بئاقل** مەندی دیاردکەت بەلێ **ئەو بخو دبێ ئاقلن** . گەلەك تشتێت جوان ژی یێ دچیروکێدا هاتین . **ئەڤەو سەیدایێ** بائیز پشتی هینگێ چەند لایەکێت ئەزمانیو ریزمانێ **ئەویت کو** دچیروکا کاك عبد الله جندی دا هاتین روناهی **بسەردا بەردا** .

دسەبارا چیروکێت کریم بیانیدا کاك بائیزی گوت :

دچیروکێت ژڤانێ پێشەمیێو شەڤو خویندا **رونکرنەکا** لبەراهیکا وان هاتی چ پەیوەندی بناڤەروکێ **ڤە نینە** ، **دانو** ستاندن دچیروکا شەڤ و خویندا گەلەکا جوانە .

چیروکا ئەوو ئەو ب هەمیڤە گەلەکا جوانە ، تنێ ناڤێ وێ بدلێ منڤە نەنویسیایە .

«سیناڤك» خەلەکەکا ژڤێ چیروکێ کێمە ، بارێ دەرونی یێ ژنکێ دڤێ چیروکێدا گەلەك جوان یێ ب رستەکێ ئاشکرا کری .

## بنیویە د کۆرەکیدا

ژچالاکیێت ئێکەتیا ئەدیبو نڤیسڤانێت کورد تایێ دهوکێ ل روژا پێشەمیێ رێکەڤتی ١٩٨٧/٧/٩ ل بارەگایێ ئێکەتیێ کورەك هاتە سازکرن بۆ ئەدیبێ هێژا صدیق شروی دەربارەی البنیویە .

هوزانڤانێ هێژا محسن قوچانی رێڤەبەریا کوریکر . ل پێشیێ سەیدایێ موحازر بو ئاشکراکرکا البنیویە چییە و ژکیێ هاتیەو کەنگی وەرار کریەو لە سەر دەستێ کیێوکیێ . پاشی دەست هاڤێتیێ بابەتێ خو خاندنو ل سەر ڤان خالێت ژێری پارڤەکر .

١ – رەگەزو پێکهاتیێت البنیویە!
٢ – مەیدانێت ژیانیێو کەسانێت زانا تێدا
٣ – البنیویة و زمان
٤ – البنیویة و هوزانو رەخنە

• - البنیویة و چیروکا کورت

سەیدا هات‌و بدرێژی ل سەر ڤان خالا ئاخفت‌و مشە نمونە لسەر بوچونێت خو ئینان بو ساناهی‌کرنا ڤی بابەتێ رەق‌و نوی بومە.

پشتی بابەت بدوماهی هاتی دان ستاندنەکا بەرفرەهـ چێبو گەلەك لایێت دتاریێدا هاتنە رون‌کرن دیسان زێدەهیێت نوی ل بابەتی هاتنە زێدەکرن ئەڤا ژێری ژی کورتیەکە ژڤی دان‌و ستاندنێ.

• انور محمد طاهر :

عافەرم بو کاك صدیقی خو ل ڤی بوریدا، ڤی بابەتێ رەق سەیدای بەحسێ هەمی زانیاریا کر، ئەز دبێژم باشتربو پێشەکیەکا کورت‌و هویر ل قەلەم داباو پاشی هاتبا بەحسێ ئەدەبی کربا. یادی کاك صدیقی بەحسێ لایێ دی یێ بنیویە نەکر - بەحسێ هەڤرکیێت وێ نەکر.

• محسن قوچان :

بنیویە یا دادکەڤیت‌و دمریت، نەکو ژبەر موستەلەحاتێت وان بەلکو بنیویە لڤیرێ کەتە سەر ملێت گەلەك زانیاریا، نەشیایە وەك راستیەك ل گەل ژیانێ برێڤە بچیت‌و بەرهنگاریا ژیارێ بکەت.

• عبد الکریم فندی :

یا ژمن ڤە هەکە کاك صدیقی هند چێ ژبابەتێ خو نەبربانە، بەحسێ ئەدەبی‌کربا دا مفا پتربیت.

ئاڤاکرنا تشتی، ئاڤاکرنە، نزانم چاوا سەیدای کرە بنیاتی، کربا کەلواش چێتر بو.

خالد حسین :

ئەز پرسیار دکەم چاوا سەیدای دەست هاڤێتە بابەتەکێ بەرەڤ مرنێ دچێت. هەکە هاتبا ئەڤ بابەتە ل‌گەل ئەدەبێ کوردی دیار کربا دا باش تربیت.

• کریم جمیل بیانی

ئەز ژی دبێژم بنیاتی جهێ بنیویە ناگرت، نەیا دجهێ خودایە، نزانم کاك صدیق ئەز تێ نەگەهەشتم تە چاوا چیروکێت مە شەکرن، شەکرنا بنیویێ بو دەڤا نەیا هوسایە، مە دڤێت تو بێ‌ی بێژی، شەکەی کا بوچی ئەڤ دوماهیکە یا دابین‌کەرەو دێ چاوا خاندەڤانی بدوماهیکەکێ دابین کەی؟

• انور محمد طاهر :

ئاخفتنا من بو سەیدا خالد حسینە، بنیویە نەمریە. خەلك هەمی یێ ل وەلاتێت خو دخوینیت، ما چ قەیدیە تشتەکە بلا ئەم ژی بخوینین بزانین چیە.

• عبد الکریم فندی :

وسا هاتە دیاکرن کو بنیویە تەیارەکێ فکریە، ئەو بخو تەحلیلەکا رەخنەیی‌یە شکلی، یان ناڤەروکی دگریت.

• کریم جمیل بیانی :

ئەز یێ ل سەر رایا خوکو سەیدا نەیێ بەرکەتی‌بو د تەطبیقا بنیویێ ل سەر هوزانا مزویری خەم کچەکا کوردە بەلکی ل‌سەر هەلبەستێ هەمێ تەطبیق دبیت، بەلێ ل سەر رێزکێت وی ژێ ئینایین نەء.

ئەڤە ل دوماهیێ سەیدایێ موحازر بە رەڤانی ژراو بو چونێت بو بابەتی کرو کۆر بدوماهی هات پشتی نێزیکی دوو سەعەتا کێشا.

«ئێڤاریەکا خاندنێت شعری»

د چارچوڤێ وەرزێ رەوشەنبیری‌دا یێ ئێکەتیا ئەدیب‌و نڤیسڤانێت کورد تایێ دهوکێ ل روژا پێشەمیێ رێکەڤتی ١٩٨٧/٧/١٦ ئێڤاریەکا خاندنێت شعری هاتە پێش‌کێش‌کرن.

هوزانڤانێت ژیری پشکداری دڤێ خاندنێدا کرن :

سلمان کوڤلی - پێزانێ ئالیخانی - نجیب بالایی - هزرڤان - شکری شاهباز.

پشتی خاندنێ چەند تیبینیەکێت رەخنەیی ل سەر هەلبەستێت هوزانڤانا هاتنە پێش‌کێش کرن ژلایی سەیدا تیلی امین و رشید فندی.

پاشی دان ستاندنەکا بەرفرەهـ چێبو ل سەر بیرو رایێت برادەرێت رەخنەگرو ئەڤ ئێڤاریا خوش بدوماهی هات‌و نێزیکی سەعەت‌و نیڤا کێشا.




# پۆستەی کاروان

سۆران حەریری
ئامادەی کردووە

**خوشك‌و برایانی هێژا . .**

وا لەم ژمارەیەشدا بەیەك دەگەینەوەو ، دووبارە چەند ڕازو نیازێکی دۆستانەی خۆمانتان پێ‌ڕادەگەیەنین ، بۆ ئەوەی بەهەموو لایەك هەوڵی ئەوە بدەین زیاتر خزمەتی ئەدەب‌و ڕۆشنبیریی میللەتەکەمان بکەین‌و ، مشوری ئەوە بخۆین کە لەمەودوا چاکترین بابەت‌و بەرهەمی بەپێزی کوردی بەخوێنەرە ئازیزەکانمان ڕابگەیەنین‌و ، لاپەرە بێ‌گەردەکانی گۆڤارەکەمان بەتازەترین‌و دەوڵەمەندترین نووسین لەشیعرو چیرۆك‌و بابەتی مێژوویی‌و زانیاری‌و فۆلکلۆری برازێنینەوە ، هەربۆیەش لەسەرەتادا وامان بەچاك زانی لەگۆشەی پۆستەی کارواندا بەردەوام وەڵامی ئەو خوشك‌و برا ئازیزانەمان بدەینەوە کە نووسین‌و بەرهەمەکانیان بواری بڵاوکردنەوەیان بۆ نارەخسێ ، جا لەبەر هەر هۆیەك بێت .

هەر لەم ڕوانگەیەشەوەو ، دوای تاووتوێ کردنی ئەو بابەت‌و نووسینانەی کە لەم ژمارەیەدا وەڵامان داونەتەوە . هەندێ خوشك‌و براگەلێ ئەوەمان لێ‌دەکەن کە تاوەکو ئێستا چەند نامەیەکی دیکەشیان ناردووە ، بەڵام وەڵام نەدراونەتەوە ، وەیا نامەکانیان دواکەوتوون ، وەیا کۆمەڵێکی زۆر شیعرو چیرۆکیان هەیە نازانن بڵاودەبنەوە یان نا ئەگەر هاتو بیان‌نێرن بۆ کاروان ، لەتەك ئەمانەشدا هەندێ بابەتی دیکەمان پێ‌گەیبوون کە هەندێ مەرجی بڵاوکردنەوەیان تێدانی‌یە وەکو «نەنووسینی ناوو ناونیشان ، خەت ناخۆشی ، لەهەردوو دیوی کاغەز نووسین» ، جگە لەوانیش هەندێ برای تر بابەتی کتێبێکیان بۆ ناردووین کە خۆی لە ١٠٠ تا ١٢٠ لاپەرە دەدات ، لەکاتێکدا کە ئێمە لەزووەوە گوتوومانەو تکامان کردووە کە بابەتەکان لە «٣٠-٣٥» لاپەرەی دێر پەڕیو زیاتر

نەبێ بۆ ئەوەی گەورەترین ژمارە لەبڵاوکردنەوەدا بەشداری بکەن ، خۆ بابەتی کرچ و کاڵیش لەکەلەپوورو فۆلکلۆرو نووسینی دیکە کە دەگەنە گۆڤارەکەمان ئەوە هەر باس ناکرێن ، مەسەلەی سەرنەکەوتنیش لە هەڵبژاردنی بابەتی چاك و بەپێز هەر لەولاوە بوەستێ . بەهەرحاڵ ئێمە بۆ مەسەلەی دواکەوتنی وەڵامدانەوە هەتا بۆمان بکرێ هەوڵی چارەسەرکردنی دەدەین ، بۆ ئەوانەیش کە شیعرو چیرۆك و نووسینیان هەیە ، دەڵێین گۆڤارەکەمان دەرگای لەسەر پشتەو بەناردنی هەموو نووسینێکی سەرکەوتوو دڵخۆش دەبین و ، مایەی بەختەوەریمانە . بۆ لایەنەکانی تریش دەڵێین ، هەرنووسینێك ئەو مەرجانەی تێدا نەبێ کە لەژمارە «٥٧»دا بڵاومان کردوونەتەوە ، ئەوە بێ سێ و دوو پشت گوێ دەخرێن و ، نووسەرەکانیشیان گلەیی یان لەسەر خۆیانەو ، دڵنیایشین کە لێمان دڵگیر نابن . .

ئێستاش ئێوەو بەشێکی دیکەی وەڵامدانەوەی ئەو نامەو نووسین و بەرهەمانەی کە دەرفەتی بڵاوکردنەوەیان بۆ نەرەخساوەو بوونەتە میوانی گۆشەی پۆستەی کاروان و لەم ژمارەیەدا وەلام دراونەتەوە ، ئەمانەش وەڵامەکانن .

• بۆ ئەم خوشك و برا بەرێزانەی بەشیعرو پەخشانە شیعر گۆڤارەکەمانیان بەسەر کردۆتەوە .

«نجاة قەرەداغی ، شێخ دارا مەخمووری ، برهان جۆلا ، سلمان محمد خضر شاوەیسی ، هوشیار محمد کریم ، کامران سعید عبد الله کوردە ، عمر کرێکار ، هۆشمەند حمە محي الدین ، سنوور صمد عبد الحق ، سعد الدین قادر سعید پیرێومەری ، ع . م . چۆمانی ، عبد الکریم نصر الله فتح الله ، رەمەزان ابراهیم حسن ، سەفین محمد رسول ، عبد الرحمن حمد امین عبد الله ، محمد أسعد کاروانچی ، هەستیار شێخانی ، أسعد محمد مصطفی ، طه عبد الله ، حکیم رحیم برادۆستی ، عمر پێنجوێنی ، جەنگی عارف حسن ، صلاح احمد ساڵەیی ، محمد محمود ، مەلەك حاجی سلیم ، هەستی مصطفی ، هیوا ناکام ، صباح سعید یادگار ، بیان عبد الواحد ، زکی أمین صالح ، جەزا کریم بابەوەیی ، کاوە مصطفی عبد الله ، خلیل محمد نازەنینی ، قاسم أمین ابراهیم ، ك . کاکە ، م . بەسۆز ، عمر حسین حسین ، لەزگین یونس محمود ، مهدي عبد القادر شاهین ، خدر مامە ئاکرەیی ، سەردار حسین صالح ، زهیر محمد سلمان ، لقمان طاهر باپیر ، حەمە عەباس» .

**خوشك و برا شیرینەکانم** ، وا ئەمجاریش دەڵێم شیعر نووسین ، یا وەك دەڵێن شیعر دانان بەهرەو ڕۆشنبیریی و هەستێکی ناسکی گەرەکە ، شیعر هەر تەنها ووشە ڕیزکردن نییە ، شیعر هونەرەو پەیامێکی پیرۆزی مرۆڤە بۆ مرۆڤ ، بۆیە بەوپەڕی دڵنیاییەوە دەڵێم خۆزگە ئەو خوشك و برا ئازیزانەی کە روویان لەم مەیدانە کردووە پێشەکی بەچاکی لە ماناو پەیامی شیعرو شیعر دانان دەگەیشتن ، لەوە حاڵی دەبوون کە بەچەند دێڕ ووشە هۆنینەوە شیعر لەدایك نابێ و نووسەرەکەیشی نابێتە شاعیرو ، بابەتەکەیش ئەو کاریگەرییەی نابێ کە لەشیعرێکی ڕاستەقینەدا دەبینرێ و هەستی پێدەکرێ ، بۆیە خوێندنەوەی زۆرو خۆرۆشنبیرکردن ، مرۆڤ لەم گێژەنە ڕزگار دەکات و ئاسۆیەکی فراوانی لەبەردەم واڵا دەکاتەوە ، هیوادارم ئەم قسانەم مایەی دڵگیربوون نەبێ و هاندەرێکی چاك بن بەرەو هێنانەدی ئەدەبێکی سەرکەوتوو .

• **بۆ کاك کاڵ شوکت حمە خورشید**

کاکی برا پێشەکی سوپاست دەکەین بۆ بەشداری کردنت لەگۆڤارەکەماندا ، بەلام دەبێ ببووری کە ئەو شیعرەی بەناوی «منالێکم» ەوە بۆت ناردبووین تەنها ئەم کوپلەیەی خوارەوەی شیاوی بڵاوکردنەوە بوو ، چاوەڕوانی بەرهەمی دیکەتانین . .

**«منالێکم»**

**مـــــــنـــــــالێکی ساوای جوانم**
**خۆشەویستی نـــــــیشتمانم**
**ووردو زیـــــــرەك و ژیـــــرم**
**خـــــــاوەنی هۆش و بیرم**
**هـــەرچـــەن هـــێشتـــا مـــنـــاڵم**

## چـــــــــــــــــرای گەشی نـــــــــــــــــاوەمـــــــــــــــــاڵم

* **بۆ ئەو خوشك‌و برا ئازیزانەی ئەم شیعرانەی خوارەوەیان بۆ ناردووین . .**

«جواناو ، بوژانەوە ، ئەڤینی من ، نارەزایی ، کە مەرگەوەر دەژیەتەوە ، سەر لێ‌شێواو ، خابیرێ زاخۆ ، هەڤال ، مهابادو ئاهینەك ، پەرگارا وەلاتی ، ل بامە گۆڤەندە ، دێرسم‌و بیرهاتنێت زاروکینیێ ، بیکا ئومیدا ، کۆست‌کەوتەی ساڵێك غەریبی ، سێ هۆنراوە لەکاتی خۆی ، ژوان ، ساتێکی تەنیایی ، شەستە بارانە ، شەوە تەنیایی ، یاسای فیزیکی ، بێوەفاییت کرد» .

بەرێزان پڕ بەدڵ سوپاستان دەکەین بۆ ئەو هەستە ناسك‌و بەسۆزانەی کە لە نامەکانتاندا دەرتان بڕیوە ، ئەو شیعرانەی لەسەرەوە ناومان بردوون ، چون بەلای ئێوەوە بەنرخ‌و خۆشەویستن ، بەهەمان پلەش لای ئێمە مایەی ڕێزو بەختەوەرین ، بەلام هەندێ جار چەند هۆیەك ڕێگە لەبلاوکردنەوەی هەندێ بابەتی ئەدەبی تەسك دەکەنەوە ، بێگومان ئەو هۆیانەش لای ئێمە زیاتر ئاشکران ، بۆیە ڕەنگە هەندێ خوشك‌و برا گلەیی بلاونەکردنەوەی بەرهەمەکانیان بکەن کە هەقێکی ڕەوای خۆیانە ، بەلام وەکو گوتمان ئێمە لەنزیکەوە مامڵەت لەگەڵ بەرهەمەکان دەکەین ، ئیتر بەو پێوانەیە پەیرەوی دەکەین یا ئەوەتا بابەتەکە وەبەر بلاوکردنەوە دەکەوێ گەر مەرجی بلاوکردنەوەی تێدابوو ، وەیا ئەوەتا ناشێ‌و داوای بەخشین دەکەین . . بەهەرحاڵ ئێوەی ئازیزیش ئەمجارەیان بابەتەکانتان نەشیا بۆ بلاوکردنەوە بۆیە دەبێ بمان بەخشن‌و دووبارە سوپاستان دەکەین . .

* **بۆ برای بەرێز کاکە هێرش غفور مصطفی . .**

براگیان ئەو کورتە چیرۆکەی بەناوی «پشیلە قوڵە» بۆت ناردووین ، شیاوی بلاوکردنەوە نەبوو ، جگە لەوەی کە لە هەردوو دیوی کاغەزەکەیشت نووسیبو ، لەکاتێکدا جارەهای جار ئاگاداری هەموو نووسەرێکمان کردووە کە هەندێ خاڵی سەرەکی هەن بۆ نووسین دەبێ پەیرەویان بکەن ، خۆزگە کاکە هێرش‌و خوشك‌و براکانی دیکەش جارێکی تر بە ژمارە «١٤»ی گۆڤارەکەماندا دەچوونەوەو ، نەختێ شارەزاییان لەم ڕووەوە وەدەست دەهێنا .

* **بۆ خوشکە نجاة احمد خۆشناو . .**

خوشکێ گیان وادیارە ئەمجارەش پەپوولەی بەختت لەسەر لقێکی تری باخچەی پۆستەی کاروان نیشتەوە ، بەداخەوە ئەو شیعرەی بەناوی «بۆ هەست ناکەی» ؟ کە بۆت ناردووین تەنها ئەم کۆپلەیەی خوارەوەی شیاوی بلاوکردنەوە بوو ، خۆزگە شیعری سەرکەوتووترت بۆ دەناردین .

* **بۆ هەست ناکەی ؟**

**وام ئەزانی تۆش وەکو من**<br>
**هەستیاری ،**<br>
**تۆش وەکو من ، بە بینینم**<br>
**بەختیاری . .**<br>
**وام ئەزانی ، تۆش وەکو من**<br>
**ئەسووتێیت‌و ،**<br>
**لەبەرامبەر خۆشەویستی**<br>
**کپ‌و بێدەنگ‌و بێ «زار»ی**

* * * * * *

* **بۆ نووسەرانی ئەم چیرۆکانە . .**

«شادی بووە شین ، بازێرێ کۆڤانا ، تابلۆی خوێنین . . ب ژ کوری مەزتر لێ‌هات ، کرێکار ئامێزی خێزانە . هیو . گوندێکی تینوو» . .

لەگەڵ ڕێزو سوپاسمان بۆ ئەوا برا ئازیزانەی کە ئەم چیرۆکانەی سەرەوەیان بۆ ناردووین ، خۆزگە ئەو بەرێزانە هەوڵی ئەوەیان دەدا چاکتر لە هونەری چیرۆك نووسین شارەزابن ئەوسا دەستیان دەدایە نووسین ، چونکە نووسینەوەی چیرۆك جیاوازییەکی زۆری هەیە لەگەڵ گێڕانەوەی «حیکایەتێك ، وەیا سەربردەیەکی» ڕۆژانی زوو ، هونەرێکە

پێویستی‌ی به شاره‌زایی و ورده کاری‌یه‌کی زۆر هه‌یه . به هه‌رحاڵ سوپاستان ده‌که‌ین‌و ، چاوه‌ڕوانی به‌رهه‌می سه‌رکه‌وتووتانین .

* **بۆ کاکه ساکار محمد مشیر له گه‌ڕه‌کی «مه‌هابادی» هه‌ولێره‌وه . . .**

برای شیرین پێشه‌کی زۆر سوپاست ده‌که‌ین بۆ هه‌موو ئه‌و ووشه جوانانه‌ی که له‌نامه‌که‌ت‌دا نووسراون ، به‌ڵام داخمان ناچیێ که ئه‌و شیعره‌ی به‌ناونیشانی «بۆچی بژین» بۆت ناردووین له‌گه‌ڵ ڕێبازی گۆڤاره‌که‌مان‌دا ناگونجێ ، بۆیه بۆمان نه‌کرا بلاوی بکه‌ینه‌وه ، خۆزگه به‌رهه‌می سه‌رکه‌وتووترت بۆ ده‌ناردین ، دووباره سوپاس . .

* **«مه‌ینه‌تی» ، کورته چیرۆکێکی خوشکه «ژیان أحمد»ه ، که له گه‌ڕه‌کی ئازادی له که‌رکووکه‌وه بۆی ناردووین . .**

خوشکی ئازیز سوپاست ده‌که‌ین بۆ ئه‌و ئه‌رك‌و ماندووبونه‌ت‌و ، بۆ ئه‌و چیرۆکه‌ی بۆت ناردووین ، به‌ڵام به‌داخه‌وه چیرۆکه‌که لاوازه‌و ، زمانی نووسینه‌که‌یشی له‌ئاستی نووسینه‌وه‌ی چیروك‌و هونه‌ری چیرۆك نووسین‌دا نی‌یه ، ده‌بێ بمانبه‌خشی له‌بلاونه‌کردنه‌وه‌ی چیرۆکه‌که‌ت‌و دووباره سوپاست ده‌که‌ین . .

* **«گوڵێکی ژاکاو» په‌خشانێکه کاك حسن عثمان حسن له گوندی «قوشته‌په»ی گه‌وره‌وه بۆی ناردووین . .**

کاکی برا ، پێشه‌کی سوپاسێکی زۆرت ده‌که‌ین بۆ ئه‌و هاوکاری‌و دڵسۆزی‌یه‌ت ، به‌ڵام ده‌بێ بمانبه‌خشی که په‌خشانه‌که‌ت گه‌لێ که‌م‌و کورتی تێدابوو ، بۆیه شیاوی بلاوکردنه‌وه نه‌بوو ، هیواداریین زیاتر کۆشش بکه‌یت‌و به‌رهه‌می چاکترمان بۆ بنێری .

* **بۆ خوشکه حسیبه أنور . .**

خوشکی ئازیز هه‌وڵه‌که‌ت مایه‌ی خۆشحاڵیمانه ، خۆزگه زیاتر شاره‌زاییت له‌بواری نووسین‌دا وه‌ده‌ست ده‌هێناو ، به‌شێوه‌یه‌کی فراوانتر رووت له‌نووسین ده‌کرد ده‌باره‌ی ئافره‌ت ، که ئه‌میان ئیمرۆ زیاتر پێویسته به‌تایبه‌تی گه‌ر ئافره‌ت خۆی ئه‌م ئه‌رکه بگرێته ئه‌ستۆ ، بشمان به‌خشه که ئه‌وبابه‌ته‌ی به‌ناوی کچێکی فه‌له‌ستینی‌یه‌وه بۆت ناردووین شیاوی بلاوکردنه‌وه نه‌بوو ، چاوه‌ڕوانی به‌رهه‌می دیکه‌تانین‌و هه‌ربژیت .

* **بۆ ئه‌م خوشك‌و برا ئازیزانه :**

**«سۆران محمد ، فریاد جلال صالح ، سیامند احمد ژاژله‌یی ، سه‌رحه‌د احمد هارونی ، سالار اسماعیل ابراهیم ، هیوا عبد الله خدر ژاژله‌یی ، ڕێبوار احمد قادر ، ته‌یموور بێبه‌خت ، خلیل فتاح کریم ، محمد گه‌ڵیاوه‌یی ، بژار هه‌ڵه‌بجه‌یی ، طه احمد فرج ، جواد داماو» .**

ئازیزان ، باوه‌ڕتان‌بێ پڕ به‌دڵ حه‌زمان ده‌کرد به‌رهه‌مه‌کانتان بلاوبکه‌ینه‌وه ، به‌تایبه‌تی که له خوشك‌و برای دڵسۆزی وه‌کو ئێوه‌وه گه‌یشتبوونه گۆڤاره‌که‌مان ، به‌ڵام داخمان ناچیێ که دوای چه‌ند جار هه‌ڵگێڕو وه‌رگێڕ به‌په‌سندمان نه‌زانی بلاویان بکه‌ینه‌وه ، ئه‌ویش له‌به‌ر ئه‌وه‌ی له‌ئاستی پله‌ی ئه‌ده‌بی‌و ڕۆشنبیری گۆڤاره‌که‌مان‌دا نه‌بوون ، ئه‌ڵبه‌ته ئێوه خۆشتان به‌وه ڕازی نابن ئه‌م کاره بکه‌ین‌و خوێنه‌ران لێمان ڕازی نه‌بن ، هه‌ربۆیه ده‌بێ ئێوه‌ش له‌بلاونه‌کردنه‌وه‌ی ئه‌و به‌رهه‌مانه‌تان‌دا بمانبوورن ، دووباره سوپاستان ده‌که‌ین .

* **بۆ خوشکه «گوڵخاتر» له شاری هه‌ولێره‌وه . .**

خوشکی شیرین ، پێشه‌کی ده‌مانه‌وێ له‌وه دڵنیابی که تۆو هه‌موو خوشك‌و براێکی نووسه‌رو خوێنه‌ر دۆست‌و هاوڕێ‌و خۆشه‌ویستی ئێمه‌ن ، هه‌ر به‌رهه‌م‌و بابه‌تێکی ده‌یانێرن به‌وپه‌ڕی ڕێزه‌وه سه‌یر ده‌کرێن‌و ، نرخ‌و بایه‌خی خۆیانیان هه‌یه ، به‌ڵام هه‌ندێ جار واده‌بی چه‌ند بابه‌تێك له‌گه‌ڵ ڕه‌وت‌و ڕێبازی گۆڤاره‌که‌دا ناگونجێن ، بۆیه ناچار ده‌بین به‌خاوه‌نه‌کانیان بڵێین بمانبوورن که بۆمان نه‌کرا بلاویان بکه‌ینه‌وه ، ئه‌ڵبه‌ته شیعره‌که‌ی تۆش یه‌کێکه له‌و بابه‌تانه که نه‌شیان بۆ بلاوکردنه‌وه ، هیواداریین به‌رهه‌م‌و شیعری سه‌رکه‌وتوو ترمان بۆ

